# فەرهەنگی هەرزە

## فەرهەنگێکی کوردی کوردییە

ئامادەکردنی:
کۆمەڵێک لە مامۆستایانی زمانی کوردی
سادق ئەحمەد عوسمان رۆستایی - جنان سەعید محەمەد - ڕەسووڵ عەلی
ڕەسووڵ ئەحمەد - بێگەرد تەها- حەیدەر حاجی خدر

پێداچوونەوە:
سەلام ناوخۆش بەکر

چاپی یەکەم ٢٠١٢

* ناوی کتێب: فەرهەنگی هەرزە

* ئامادەکردنی: سادق ئەحمەد عوسمان رۆستایی– جنان سەعید محەمەد– ڕەسووڵ عەلی– ڕەسووڵ ئەحمەد– بێگەر تەها– حەیدەر حاجی خدر. پێداچوونەوە: سەلام ناوخۆش بەکر

* بەرگ و سەرپەرشتیاری هونەری: عوسمان پیرداود .

* نەخشەسازی: عیسام موحسن.

* چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.

* تیراژ: ٥٠٠ دانە.

* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی( )ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە.

# پێشەکی

فەرهـەنگی هـەرزە یـەکێ لـە پرۆژەکـانی کـۆڕی زانیـاری کوردسـتانە. لـەژێر چاودێریی لیژنەی فەرهەنگی کـۆڕدا کە پێکهـاتبوو لـە د. کوردستان موکریـانی و د. عەبـدوڵڵا ئـامێدی و مامۆسـتا سـلام نـاوخۆش وەك کـارێکی هـەرەوەزی، کۆمەڵێك مامۆستای قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی (حەوت تا دوازدە) کە ناویان لەم پێشەکیەدا هاتووە زۆربەی وشە و زاراوەی کتێبـە کوردییـەکانی ئـەو قۆناغانـەیان کـۆکردەوە و هەریـەکێ بـە پاڵپشـتی فەرهـەنگی دی کـوردی ـ کـوردی یـان بـە سەلیقەی خۆی ڕامانی وشەکانی کردبوو.

فەرهـەنگی هـەرزە تەواوکـەری فەرهـەنگی هەراشـانە کـە سـاڵی (٢٠٠٧) چـاپ کـراوە. ئەگەرچـی لەسـەردەمی دەورەی پێشـتری کـۆڕی زانیـاری کوردسـتاندا کەرەستەی ئەم فەرهەنگە کۆکرایەوە، بەڵام ئەرکی تەواوکردن و ئامـادەکردنی بـۆ چاپ مایەوە وەك ئەرکی لیژنەی فەرهـەنگی ئـەکادیمیای کـوردی. بـۆ ئەنجامـدانی ئەم کارە ئەکادیمیا مامۆستا سەلام ناوخۆشی راسپارد بۆپێداچوونەوەی دۆسـیەی ئەم پرۆژەیە و پەیوەندی پێویست کـرا لەگـەڵ مامۆسـتایانی پێشـتر پەیوەندیـدار بەم پرۆژەیەوە.

فەرهــەنگی هــەرزە بــە هــەمان ڕێســای ڕێنــووس و زمانــەوانیی هەراشــان ئامادەکراوە و تەنها لە ژمارەی وشەکان و ڕاڤەکردنیان بەپێی تەمەن جیاوازن.

فەرهــەنگی هــەرزە چـاوەڕوان دەکرێـت سەرچـاوەیەکی یارمەتیـدەر بێـت بەتایبەتی بۆ قوتابیـانی قۆنـاغی ناوەنـدی و ئامـادەیی و لـە کتێبخانـەی کوردیـدا جێگای شیاوی خۆی بکاتەوە.

له کۆتاییدا دەمانەوێ ئەو ڕاستییە دووبارە بکەینەوە کە ئەم فەرهەنگە بەرهەمی هاوکاریی لیژنەی فەرهەنگی کۆڕی زانیاری کوردستان و لیژنەی فەرهەنگی ئەکادیمیای کوردییە.

لێرەدا گرنگی ڕۆڵی د. ئازاد ئەحمەد سکرتێری ئەکادیمیا لەبەرچاو بگیرێ، کە توانی ئەو مامۆستایانە کۆبکاتەوە و پرۆژەکە ڕاستەڕێ بکا.

**لیژنەی فەرهەنگ**

**٢٠١٠/١٢/١٩**

**ناوەکان**

١) م. صادق ئەحمەد ڕۆستایی

٢) م. جنان سەعید محەممەد

٣) م. ڕەسول عەلی

٤) م. ڕەسول ئەحمەد

٥) م. بیگەرد تاها

٦) م. حەیدەر حاجی خدر

**لیژنەی فەرهەنگ**

**ئەکادیمیای کوردی**

## وشە کورتکراوەکانی نێو ئەم فەرهەنگە

| | |
|---|---|
| (ئام.) | ئامراز |
| (ئاک.) | ئاوەڵکار |
| (ئان.) | ئاوەڵناو |
| (ج.) | جێناو |
| (چ.) | چاوگ |
| (ن.) | ناو |

## ناوەڕۆك

# ئـ

**ئاسایی (ئاك.)** ١- سروشتی بێ گیروگرفت: کارەکە ئاسایی بەرێچوو. ٢- وەکو باو، تەبیعی: دوای شەو ژیانی ئاسایی گەڕایەوە.

**ئابووری (ن.)** مایەی ژیانو بژێوی: ئەم دوو سێ ساڵەی دوایی باری ئابووری کوردستان بەرەو پێش چووە. ٢- زانستێکە پەیوەندی بەماڵو داراییەوە هەیە.

**ئاتاج (ن.)** پێویست، پێتڤی: (کورد ئاتاجی زۆرە).

**ئاتەشگا (ن.)** ١- ناوی شاخێکە لە ناوچەی تاوەگۆزی: کێوی ئاتەشگام نەدیوە. ٢- شوێنی ئاگردان، ئاگردان: ئاگرمان لە ئاتەشگادا کردەوە. ئاگردانی پیرۆزی گاوران: ئاتەشگا پەرستگای گاورانە.

**ئاتەگ (ن.)** ئادامەن، شاقەل، بەشی خوارووی کەوا: ئاتەگی کەواکەم دڕاوە.

**ئاخ (ن.)** ١- خاك، وڵات، نیشتمان.٢- خۆڵ، خۆر. ٣- وشەیەکە بۆ دەربڕینی سەرسوڕمانی بەکاردەهێنرێت: ئاخ کوشتمت! جهێ ژیارا مرۆڤی: ئاخا مە یا پیرۆزە.

**ئاخ (ن.)** ١- هاوار لە بەر ئازار: (ئاخ سەرم دێشێت). ٢- خۆزیا: ئاخ کورد پێش کەوتبوایە. ٣- ئاخ، خاك: ئاخا وڵاتی شیرینە.

**ئاخۆ** (وشەی سەرسوڕمان) ئایا، داخوا، تۆ بڵێی: ئاخۆ فەرهەنگەکەمان باش دەردەچێ.

**ئاخافتن (چ.)** دواندن، قسە لەگەڵ کردن. ئاخفتن قسە کردنە جیاوازی هەیە لەنێوانیان، پەیڤین، گۆتن، قسەکردن: ئاخافتنا خۆش و یا نەخۆش ژ دەڤەکی دەرد کەڤن. (پەندە)

**ئاخر (ئان.)** ١- کۆتایی، دوایی: ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە ئەم کەلەپچە بەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە "قانع" (ئام.) ٢-

ئایا، بەڵام: ئاخر چۆن وا دەبێ؟ (ن.) ٣- ئاخر ناوە بۆ نێرینە. ئاخر لە دەڤەری مزیری باڵا دەژی.

ئاخنران (ن.) پەستران، داپەستوو: لادێیەکان بانەکانیان بە کا دەئاخێنن.

ئادەت (ن.) داب‌و نەریت: ئادەتی کوردان جوانە.

ئادەم (ن.) ١- واتە پێغەمبەر ئادەم (درودی خوای لێ بێ): ئادەم‌و حەوا لە ئەنجامی هەڵەیەك لە بەهەشت دەرکران.٢- ناوە بۆ نێرینە: ئادەم باکی مرۆڤایەتییە.

ئادەمیزاد (ن.ل.) بەنی ئادەم، نەوەی ئادەم، مرۆڤ، مەردووم: داگیرکاران وەك ئادەمیزاد سەیری کورد ناکەن.

ئاژاوە (ن.) ئاشوب، پشێوی، شەڕوکێشمەکێش: ئەوان هەر ئاژاوە دەنێنەوە.

ئاژەڵ (ن.) گیانەوەر، چوارپێ، حیوان: بەخێوکردنی ئاژەڵ لەگەڵ ژیانی شاردا ناگونجێ.

ئاژەڵ (ن.) ماڵات، ئاژەڵ: بەخێوکردن سامانە.

ئاژین (ن.) ئاژوین، هاژین، لەوەڕ: رانەکە ئاژین بووە.

ئارام (ئان.) ئەم پۆلە ئارامە. ١- بەئۆقرە، لەسەرخۆ، هێدی، هێور، هێمن، بێدەنگ، کش‌ومات.٢- (ن.) ناوی کوڕانە: ئارام کوڕێکی هۆشمەندە.

ئارامی (ئان.ل.) ئەهوەنی، هێمنی، بێ شەڕوشۆڕ، بێدەنگی، بێهەست‌و خوست، ئۆقرە: ئارامی حەسانەوە بە دەروونی مرۆڤ دەبەخشێ.

ئارایشت (ن.) رازاندنەوە، خۆجوان کردن: بووکەکە بە جوانی ئارایشت کرا.

ئارەزوو (ن.) ١- هیوا، تاسە، کەیف، مەیل، حەز، ئاوات: ئارەزووم لە گەشت‌و سەیرانە. ٢- ناوە بۆ مێینە: ئارەزوو حەزی لە خوێندنی مۆسیقایە.

ئازا (ئان): ١ - بەتواناو بەغیرەت. ٢-زیرەك و تێگەیشتوو: ئەوەی ئازابێ یەکەم دەبێ. نەترس: کورد پیاوی ئازای هەیە.٣- ئازا (ن.) ناوە بۆ کوڕ: (ئازا منداڵێکی ژیرە).

ئازای (ن. و) لێبوردن، دەستهەڵگرتن لە مافێك. پێش مردن گەردن ئازای

پێویستە.

ئازاد (ئان.) سەربەست، خۆسەر، سەربەخۆ، بێ سانسۆر، بەروڤاژیا (بن دەستی)یە: مرۆڤ د رژێمێن دیموکراسیدا یێ ئازادە. (ن.) ناوە بۆ نێر: ئازاد هاریکاری باوکی دەکات.

ئازادی (ن.و.) سەربەستی، خۆسەری، سەربەخۆیی: داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ.. سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ.(بێکەس) (ئان.) — کەی ئەمە ئازادی بوو؟

ئازار (ن.) ١- ژانو ئێش، ئەزیەت: شکان زۆر بە ئازارە. ٢- ناوی مانگی سێیەم لە ساڵی دایك بووندا؛ بەهار لە ٢١ی ئازارەوە دەست پێدەکا.

ئازاردان (چ.) ئەزیەتدان، زیان پێگەیاندن: نابێت ڕەفتارێکی وا بنوێنیت کە ئازاردانی خەڵکی بەدواوە بێت.

ئازاردان (چ.) ئێشاندن، ئەزیەت دان، لێدان، ئەشکەنجەدان: ئازاردان سزایەکی نامرۆڤانەیە.

ئازووخە (ن.) ئازووقە، بژێوی پێداویست لەماڵدا: دانانی ئازووقەی زستان کارێکی باشە.

ئاسۆ (ن.) ١- کەناری ئاسمان: بەری بەیانە ڕووناکە ئاسۆ. - مەیدان وبەرینایی کار بە ئاسۆی بیرکردنەوە یان فراوانە. ٢- ناوە بۆ کوڕان: ئاسۆ رۆژنامەنووسێکی بووێرە

ئاسا (ئام.) وەکو منیش (خۆت ئاسا کارەکەم کرد).

ئاسان (ئا.ن.) کارێکی ئاسانی ئەنجام دا. کاری سووكو بێ گرفتو بێ کێشە، هاسان (ئا.ك): کێشەکەم بە ئاسانی چارەسەر کرد.

ئاسایش (ن.و.) ئاسوودەیی و تەبایی: دەبێ هەموومان ئاسایش بپارێزین. ئاسایش: دەزگای هێمنی پارێز لە وڵاتدا. ئاسایشی هەرێم توانی باندێکی لەشفرۆشی بگرێ.

ئاسایی (ئان.) سادە، وەك ئەوەی هەیە: پیاوێکی ئاسایی بوو.

ئاسنگەر (ئان.) کەسێك کە پیشەی دروستکردنی شت بێت لە ئاسن: کاوەی

قارەمان ئاسنگەر بوو.

ئاش (ن.) (دەستگەهەکە بەرەکێ مەزنێ خرِ ب ئاڤێ یان بە هەوای دزڤریت و بۆ هێرا نا گەنمی یان نیسك و نۆكان ب كار دهێت).

ئاش (ن.) گەدە، بەرچێلك: ، بەر. بەشێكی كۆئەندامی هەرسە خواردن دەهارێت. ئاش: هارینی دانەوێلە. ئاشەكەی مام هۆمەر بە ئاو كاری دەكرد.

ئاشۆب (ن.) ئەندێشە، خەیال، ئاشوب دەژیت.

ئاشتی (ن.و.) هێمنایەتی، خۆشی نێوان دوو كەس یان دوو كۆمەڵە: (هیوامان ئاشتی یە). ئاشتی ناوە بۆ كورِ و كچ: ئاشتی زیرەكە.

ئاشتیخواز (ن.ب.) دژ بەشەروهەرا: كورد گەلێكی ئاشتی خوازە.

ئاشكرا (ئان.) ئاشكەرا،دیار، خویا، بەرچاڤ: (قوتابخانا مەیا ئاشكرایە).

ئاشكرا (ئان.) روون و دیار، بەرچاو: نهێنی یەكە ئاشكرابوو.

ئاشنا (ن.) ١- دۆست، یار، بەیەك گەیشتن، ناسین: ئاشنای ئاوازە رِەسەنەكانم. ٢- ناوە بۆ مێینە. ئاشنا خوێندكاری بەشی مۆسیقا بوو. ئەو پیاوە ئاشنامە

ئاشنا (ن.) ناس، ناسكری: ئەم بابەتە لەلام ئاشنایە.٢- دۆست ویار: لەگەڵ بەرێوەبەر زۆر ئاشناین. ٣- ناوە بۆكچ: (ئاشنا بێژەرێكی ناسراوی كوردە).

ئاشنابوون (چ.) یەكترناسین، بوون بە دۆست: خۆزگەم بەو رۆژەی ئاشنابووین.

ئاشنایەتی (ن.م.) دۆستایەتی: ئاشنایەتیمان خۆشە.

ئاشیان (ن.) خانوو، هێلانە: كەلاوەی كۆن ئاشیانی بوو.

ئاگا (ئان.) ١-خەبەر: ئاگات لە رِوداوەكانە.٢- بەخەبەر، نەخەوتوو: شەو بەئاگابووم._ لێ بوون (چ.) پێ زانین و هەست پێ كردن: ئاگام لێ بوو دڵ تونـدبووی بەقسەكانی._ پاشگرە ١- خەبەردار لە شتێ: ئاگاداری هەواڵەكان بە.٢- پارێزگار: خودا ئاگادارت بێ.

ئاگادار (ن.) ١- خەبەردار، ئاگا لێبوو، وشیار، وریا: بێ ئەوەی ئاگادار بێ مەچووە لای كەس. ٢-پارێزەر: خوا ئاگادارت بێ. — ئاگادار

کــردن (چ.) خەبــەر پێــدان، پێگــوتن: پــێش ئــەوەی بــڕۆین ئاگادارمان کردن.

ئاگاداری (ن) وریـایی، چـاودێری، بـەهۆش، شـارەزایی ـ کـردن: پێڕاگەیانـدن: ئاگاداری هەڵسوکەوتی خۆت بە.

ئاگر (ن.) ئاور، ئایر، ئاتەش: ئاگری نەورۆز هێمای سەرکەوتنە.

ئاگر پەرست (ن.ب): ئاگر پەرێس، ئـاور پـەرێس، هەنـدێ نەتـەوە بـە ئـاگر پەرسـت بەناوبانگن.

ئاگرتێ بەردان (چ.) ئاگر تێبەردان لە سروشت کارێکی نا بەجێیە.

ئاگرکەوتنەوە (چ.) ئاگر کەوتنەوە زیان بەخشە.

ئاگرکردنەوە (چ.) ئاگر کردنەوە لە نەورۆز یاد کردنەوەی سەرکەوتنەکانە.

ئاڤ (ئان.) ئاو: (ئاڤا تەزی ل هاڤینان یا خۆشە).

ئاڤاکرن (چ.) ئاواکردن: کوردستان پێدڤی سەر ژ نوی ئاڤاکرنێیە.

ئاڤدان (چ.) ئاودان.

ئاڤدێر (ن.ك.) ئاڤدەر، گەڕ، گۆل.

ئاڤێستا (ن.) کتێبی پیرۆزی زەردەشت: لەئاڤێستادا باسی خێرو شەر هەیە.

ئاغا (ن.) خـاوەن یـان گـەورەی گونـد، خـاوەن زەوی زۆر: پێشـان ڕەنجـی جووتیار بۆ ئاغا بوو.

ئافرەت (ن.) ژن، مێینەی مرۆڤ: ئافرەتی کورد هەنگاو بەرەو ئازادی دەنێت.

ئاکام (ن.) ئەنجام، دوایی کارێك، ئاقیبەت، نێجە: کارەکەی هیچ ئاکامێکی نەبوو.

ئالۆز (ئان.) تێك ئالیای، ئاڵۆز، ئالزی. (مەسەلەکە زۆر ئاڵۆزە).

ئالاّ (ن.) ١- بەیداخ، پارچەیەکە هەر وڵاتـەی دروشـمو ڕەنـگو نیشـانەی خـۆی لەسـەر دەنەخشـێنێ بـەناوی پێناسـەی ئـەم وڵاتـە هەڵیـدەدات. ٢- پارچـە قوماشـی زیـادەو بچووکی ئـالاّو والاّ بـۆ بووکۆکە بەکار هاتن: (بالاّی ئـالاّی شـەنگ سـەد بـەلاّ پێـوەن .. دوو کانچەی شادی دەردینان شێوەن). ( مەولەوی) ناوە بۆ مێ: ئالاّ لە پۆلی سێ بە یەکەم دەرچوو.

| | |
|---|---|
| ئالاندن (چ.) | لێزڤڕاندن، ل دۆر زڤڕاندن، ئالاند (کاری رابردووه): (شاسواری شیتك د پشتا خۆ ئالاند). |
| ئاڵەت (ن.) | ئامێر: (ئاڵەتی مۆسیقا زۆره). |
| ئامۆژگاری (ن.) | رێنمایی، رێنوێنی، نەسیحەت، شیرەت: ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی ئەرکی ماڵەوەتان جێبەجێ بکەن. |
| ئامادەکردن (چ.) | سازکردن، حازرکردن، چاك کردن: ئامادەکردنی راپۆرتەکە کۆتایی هات. |
| ئامانج (ن.) | ١- نیشانە، ئەو شتەی کە دادەنرێت بۆ بەرد تێگرتن: هێشتان ماویەتی هەموو ئامانجەکانمان بپێکین. ٢- دۆز، مەرام، ئاوات، مەبەستی ژیان: ئامانجمە هەمیشە یارمەتیت بدەم. ٣- ناوە بۆ نێرینە. ئامانج زەماوەندی کرد. |
| ئامراز (ن.) | ئامێر، کەرەسە، ئەسپاب: ئامرازی کارکردنم قەڵەمە. |
| ئامێدی (ن.) | ناوی شارۆچکەیەکی کوردستانە لەپارێزگای دهۆك: (ئامێدی هاوینە هەواری سۆلاڤی لێیە). |
| ئامێر (ن.) | ئالاڤ، ئامێر، ئامراز. |
| ئامین (ن.): | ١- پاش دوعاو پارانەوە دەیڵێن لە عەرەبییەوە وەرگیراوە. دوای ئیسلام بوونی کورد هاتۆتە ناو فەرهەنگی کوردییەوە، مەسیحیش دوای نوێژ دەلێن ئامین: (من دوعا دەکەم ئێوەش بڵێن ئامین). ٢- ناوە بۆمێ: کورتکراوەی ناوی (ئامینە)یە ئامین خان ژنێکی بەرێزە. |
| ئانیشك (ن.) | ئەندامی لەشی مرۆڤە ئەو جێگەیە کەباسك وقۆڵی ئادەمیزاد تێك دەکاتەوە: ئانیشگی لە زەوی گیرکردبوو . |
| ئانین (چ.) | ئینان، هێنان، هاوردن، ئانی (کاری رابردوویە): (بەفرێ سەرما د گەل خوە ئانی). |
| ئاه (ن.) | هەناسە، پشوو، حەسانەوە، ئۆخە: ئاهێکم هاتەبەر. |
| ئاهەنگ (ن.) | ١- بەزم وشادی: ئاهەنگی سەری ساڵ خۆش بوو.٢- هەوای گۆرانی: ئاهەنگی گۆرانیەکە بەسۆزبوو.٣- ناوە بۆکچ:ئاهەنگ |

زیرەکە.

**ئاهورامزدا (ن.)** خوای چاکەی ئاینی زەردەشتە: ئاهورامزدا دژی شەڕە.

**ئاو (ن.)** ئاڤ : ئاو و ئاوەدانی گوتراوە.

**ئاو و هەوا (ن.)** کەش، باروودۆخ، چۆنایەتی وەرزی ساڵ: لە هاویندا کوێستانەکانی کوردستان ئاو و هەوایەکی فێنکیان هەیە.

**ئاوا (ئان.)** ١- بەم جۆرە، وەها، ئاوها: پیاوی ئاوام نەدیوە. ئاوا ڕۆژەکەم بەرێ کرد. ٢- ئاوەدان: ماڵیان ئاوا خزمەتیان کردین.٣- ون و نادیار: درەنگە ڕۆژئاوا بوو.

**ئاوات (ن.)** ئارەزوو، هیوا، ئومێد، تاسە، هێڤی، حەز: کورد بەهەندێ لە ئاواتەکانی گەیشتووە.

**ئاواتەخواز (ن.ب.)** بەتاسە، بەئارەزوو، هیوادار: ئاواتەخوازم سەربکەوم.

**ئاوارە (ن.)** دەربەدەر، دوورە وڵات، غەریبی، دەرکراو، تەریدە، غەوارە، پەناهەندە، پەنابەر: مرۆڤی ئاوارە هەمیشە بە خەمی وڵاتەوە دەژی.

**ئاوارەبوون (چ.)** دوورخرانەوە لە زێدی باوو باپیران، دەربەدەری: کەس و کارمان ئاوارەبوون.

**ئاوارەکردن (چ.)** ئەو کەسە یان دەسەڵاتەی خەڵك دەربەدەر دەکات: ئاوارەکردنی کورد لە زێدی خۆی سیاسەتی داگیرکەرانی کوردستانە.

**ئاوارەیی (ن.م.)** دەربەدەری، دوورە وڵاتی: ژیانی ئاوارەیی کۆڵە مەرگییە.

**ئاوایەکی (ن.)** ڕێك، ڕەنگ، تەرز، شێوە، جۆر، هۆسا، وەسا.

**ئاوایی (ن.د.)** گوند، دێ، دێهات، لادێ، شوێنی ئاوەدان: خەڵکی ئاوایی هاوکاری یەکتری دەکەن.

**ئاوەدان (ن.و.)** ١- شوێنو جێگایەك کە پیتو بەرەکەتی تێدایە، جێی ژیانی خۆشکراوی خەڵك. ٢- قەرەباڵغیو هاتوچوونی خەڵك بۆشوێنێك یان ماڵێك: ئێرە ماڵێکی ئاوەدانە هاتوچۆی لێ نابڕێتەوە. ٣- ئاوەدانی ( شارو دێ ) (ئاوەدانی لەو شارە

نەماوە).

ئاودار (ئان.) بەئاووتەر: ڕێواسی ئەمساڵ ئاوداره.

ئاوداشتن (ن.ك.) ئاودان، ئاودێری، پشاوەردی، ولاٚخو ئاژەڵ ئاودان: جووتیارەكە ئاوداشتنی زەوییەكەی كرد.

ئاودامان(ئاك.) تەنیشت ئاو: لەشوێنێكی ئاودامان دانیشتین.

ئاودان (چ.) ١- ئاوداشتن، ئاودانی زەوی: نەمامەكان ئاوبدە. ٢- مەڕوماڵات تێراوكردن: مێگەڵە مەڕەكەی ئاودا.

ئاور (ن.) ئاگر: ئاوریان لە ئاوایی یەكە كردەوە.

ئاوڕدانەوە (چ.) بۆدواوە ڕوانین، ڕوو وەرگێڕان بۆ دواوە، لاكردنەوە: ئاوڕدانەوەی شوفێرەكە كارەساتی لێ كەوتەوە.

ئاوڵە (ن.) خوریكە، هاوڵە: منداڵەكە ئاوڵەی دەركردووە.

ئاوێنە (ن.) خودیك، نەینك، نەینۆك، هاوێنە: لە ئاوێنە خۆم دیت.

ئای (ن.) ١- هاوار لە ئێشان: ئای مردم. ٢- وشەی سەرسورمان: ئای چەند سەیرە. ئای: ١- وشەی سەرسوڕمان: ئای ئای كارێكی خراپت كرد.٢- بۆ گۆرانی كوردی دەوترێ: لاوك وئائای وحەیرانە دەڵێت.

ئازیز (ئان.) خوشەویست، بەڕێز، لەبەر دڵان: خۆشحاڵە بەئازیزی خۆی._ە(ن.) مەقامێكی كلاسیكی كوردی یە: كێ مەقامی ئازیزەی گوتووە.

ئایا (ج.پ.) وشەی پرسە: ئایا بە ئاوات دەگەم؟

ئایەت (ن.) ١- بەناوبردنی ڕستەكانی قورئان دەگوترێ. بەدەنگێكی خۆش ئایەتەكەی خوێندەوە ٢- ناوە بۆ مێینە. ئەم ئایەتی كچی مەلا عبداللە بوو.

ئایین (ن.) دین، ڕەوشت، مەزهەب: ئایین سەرچاوەی ژیانە.

ئەدەب (ن.) ١- وێژە: ئەدەبی كوردی بەرەو پێشەوە چووە. ٢- (ئان.) شەرم: نازدار كچێكی بە ئەدەبە.

ئەدەبدۆست (ن.ن): شاسوار ئەدەب دۆستە.

ئەدەبیات (ن.): میژووی ئەدەبیاتی کوردی دەخوێنین.

ئەژدیهاك (ن.) ماری زۆر گەورە، ئەژدەها، عەزیای چیرۆکی کاوەی ئاسنگەرونەورۆز: (کاوەی ئاسنگەر ئەژدیهایەکی کوشت).

ئەژنۆ (ن.) چۆك، زەنگۆل، زرانی، وژنگ: هەردوو ئەژنۆم دێشن.

ئەرباب (ن.) ١- ئاشنا، دۆست، یار، خاوەن: زانایەکە ئەربابی عیلمە. ٢- رەفتار خۆش، لەبەر دڵان: کورێکی خۆش ئەڕبابە.

ئەرخەوان (ن.) ١- ئەرغەوان دارێکە گوڵی سووری مەیلەو بنەوشە دەکات پاش گوڵ گەڵا دەکات: دار ئەرخەوانێکم چاند. ٢- ناوی کچانە: ئەرخەوان دەنگی خۆشە.

ئەردەڵان (ن.) میرنشینێکی کوردی بوو. لەڕۆژهەلاتی کوردستان، شاری (سنە) پایتەختی بوو: ئەردەڵان. ئەمارەتێکی کوردستان بوو. ناوە بۆ نێر: ئەردەلان کورێکی ژیر بوو.

ئەرزان (ئاف.) هەرزان، دژی گرانە: ئەرزان کرۆ هەمبان درۆ.(پەندە)

(ئان.): جلی ئەرزان بەها لە بازاڕ زۆرە.

ئەرك (ن.) ئیش‌و کار، رەنج‌و باری سەرشان: ماڵێکی بە ئەرکن.

ئەرێ (ج.پ.) ئایا: (ئەرێ دێ چیە بازاڕی؟)

ئەز (ج.ك.) من، کەسی یەکەمی تاکە: (ئەزێ ل پۆلا سێیا ناڤنجی مە)

ئەزمان (ن.) ١- زمان، ئەندامی ئاخافتن و چێژتنە لەناو دەمدا: (مرۆڤ تاما خوارنێ ب ئەزمانی دزانیت). ٢- هۆی تێکگەیشتنی نێوان مرۆڤانە: ئەزمانێ کوردی یێ خۆش و شیرینە.

ئەزموون (ن.) ١- تاقیکردنەوە، ئیمتیحان: ئامادەبوون بۆ ئەزموون کۆششی دەوێت. ٢- شارەزایی: کورد هونەرمەندی خاوەن ئەزموونی زۆرە.

ئەسارەت (ن.) دیل، ژێردەست، داماو، ئەسیر: (تاکەی بەندی ئەسارەت؟)

ئەستەمۆل (ن.) ئەستەمبۆڵ، ئەستەنبۆڵ، پایتەختی عوسمانییەکان.

ئەستوور (ئان.) پێچەوانەی تەنك، ستوور: جلی ئەستوور لە زستان دەپۆشین.

ئەستووری (ئان.) هەر شتێك ئەستووری زۆر بێت خراپ نابێت.

ئەستێرە (ن.) ١- هەسارە، ستێر، ئەختەر، ئەوانەی بەشەو دەگەشێنەوە: ئەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشێنەوە بەشەو وەك چاوەکانی من نە سرەوتیان هەیە نەخەو "پێرەمێرد".٢- ناوە بۆ مێینە. ئەستێرە شیعری ناسك دەنووسێ

ئەستێرەناس (ن.ل.) نجوومگەر، شارەزا لە بواری ئەستێرە: ئەستێرەناسەکە هات.

ئەستێل (ن.) ئەستێر، گۆل، گۆلی ئاو: ئەستێلی تەنیشت گوندەکە بەربەستی بۆ دنراوە.

ئەسپایی (ن.و.) لەسەرخۆیی و هێواشی: بەئەسپایی وەرە ژوورەوە. (ئاك.) قسەکەی بە ئەسپایی پێ گووت.

ئەسپێ (ن.) گیانلەبەرێکی بچووکە لە پێستی گیانلەبەر دەردەکەوێ: ئەسپێ لە ئەنجامی پیسی پەیدا دەبێت. منداڵەکەت سەری پڕ ئەسپێیە.

ئەسکەندیناڤیا (ن.) بریتییە لە وڵاتانی (سوید، نەرویج، دانیمارك، فنلەندا): هاتوچۆ کردن لە نێوان وڵاتانی ئەسکەندیناڤیا ئاسانە.

ئەسمەر (ئان.) ١- گەنم ڕەنگ، ڕەشتاڵە: ڕەنگ ئەسمەرێکی باڵا بەرز بوو لە دەرگای‌دا. (ن.) ٢- ناوە بۆ مێینە.

ئەسوورایی (ئان.): ئەستورایی دیوارەکە زۆرە.

ئەشکەوت (ن.) ئەشکەفت، کونوکەلەبەری گەورەی ناو شاخ، لە کۆندا جێی حەوانەوەی مرۆڤی سەرەتایی بووە: ئەشکەوتی شانەدەر مرۆڤی نیاندرتاڵی تێدا ژیاوە.

ئەگەر (ئام.) ١- گەر، ئەر، هەکە، ئامرازی مەرجە لە ڕستەی ئاوێتەی مەرجیدا: ئەگەر نەخوێنی سەرناکەوی. ٢- وشەیەکە بۆ دڵنیا نەبوون بەکاردەهێنرێ: توخوا ئەگەری تێ مەخە. ٣- هۆ: دەمەوێ ئەگەری نەهاتنت بزانم.

ئەگینا (ئام.) ئەگەرنا، نەخۆ، ئامرازی مەرجە: زوو بنوو ئەگینا زوو هەڵناستی.

ئەڤە (ج.ن.) ئەمە، بۆ نێزیك: ئەڤە کەرو ئەڤە کەڤر.(پەندە)

ئەڤرۆ (ئاك.) ئیرۆ، ئیرۆکە، ئەمرۆ: شۆلی ئەڤرۆ نەئێخە سبە.

ئەڤین (ن.) خۆشەویستی: ئەڤینا ژ دڵ یاراستە._ دار، دڵدار: ئەڤینداریا مەم و زینێ دەنگڤەدا.

ئەڤین (ن.) ١- خۆشەویستی، دڵداری، ئەوین: (ئەڤینی خەج وسیامەند ناوداره). ٢- ئەڤینداری، دڵداری: داستانی مەم و زین هەر تەنیا چیرۆکێکی ئەڤینداری نییە، (کورد چیرۆکی ئەڤینداری زۆرە). ٣- ناوی کچانە: ئەم دیارییە بۆ ئەڤینە.

ئەفسانە (ن.) خەیاڵ، لەئاوەز بەدەر: هیند بە وڵاتی ئەفسانە بەناوبانگە.

ئەکتەر (ن.) کەسێك لە نواندنی شانۆییدا ڕۆڵی هەبێو بەشدار بێ. ئەکتەرەکانی چیرۆکی گەردەلوول لێ هاتوو بوون. کورد ئەکتەری بەناوبانگی هەیە.

ئەلوەدا (ن.) خواحافیزی: هاوڕێ کەی ئەلوەدای کرد بۆ هەندەران. (ئەلوەدع)ی عەرەبییە.

ئەم (ج.ك.) ئێمە، کەسی یەکەمی کۆیە: ئەم کوردین.

ئەم...ە (ئان.) ئاوەڵناوی نیشانەیە، ناوەکە دەکەوێتە نێوان هەردوو پارچەکە: ئەم کتێبە زۆر بەسوودە.

ئەمە (ج.ك.) ١- ئێمە، مە، ئەم: ئەمە دەچینە سەیران. ٢- (ج.ن. ئانە) ئەوەی نزیك: ئەمە کچی منە.

ئەمەك (ن.) وەفا، ئەختوبار: ب ئەمەك (ئان.): (مرۆڤێ جامێر یێ ب ئەمەکە).

ئەمرۆ (ئاك.) ئیمرۆ، ڕۆژ لە هاتنەدەر تا ئێوارە: ئەمرۆ کۆبوونەوەم هەیە.

ئەمین (ن.) لە ناوەکانی خوای گەورەیە، بێ ترس و هێمن: پاسەوانێکی ئەمین وبێ ترسە، (هەموو کەس لێی ئەمینە).

ئەناڵێ (ك.) دەناڵێ، هاوار دەکات، دەلاوێنێتەوە: ڕوحم لەبەر دەردی دووری یار ئەناڵێ.

ئەنتیکە (ئان.) سەیر، جوان، سەمەرە، موزایك: دونیایەکی ئەنتیکەیە گوڵم.

ئەنتیکەخانە (ن.ل.) موزە: ئەنتیکەخانەکانی کوردستان هەژارن.

ئەنجام (ن.) ئاكام، دوای، دوماهی: ئەنجامی هەڵبژاردن ڕاگەیەنرا.

ئەنجوومەن (ن.) كۆڕ، كۆ، دەستە، جڤات: هەڵبـژاردنی ڕابـردوو بـۆ دیـاریكردنی نوێنەرایەتی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عیراق بوو.

ئەندازە (ن.) ماوەی نێوان دوو شت، دووری، بەر، پێوەر: ئەم بەر و ئەو بـەر ئەندازەكەی چەندە؟

ئەندازیار (ن.) ئەندازەناس گـرتن، موهەنـدیس: پێویسـتم بـە بەدەسـتهێنانی نمرەی چاكە تا ببم بە ئەندازیار.

ئەندام (ن.) ١- بەشـــەكانی لـــەش، بـــەهۆی دەســـتكاریكردنی تەقەمـــەنی ئەنـدامێكی لەشـی لـە دەسـتداوە.٢- هاوبـەش لـە كۆمەڵێكـدا یـا لەشوێنێك: عێـراق ئەنـدامی نەتـەوە یەكگرتووەكانـە. ٣- نـاوی كورانە ئەندام خوێندكارێكی زیرەكە.

ئەندێشە (ن.) خەیاڵ، بیر: هۆنراوە ئەندێشەی وردی دەوێ.

ئەنگلستان (ن.) وڵاتی ئینگلیزان. ئینگلستان وڵاتێكی خۆشە.

ئەنگوستیل (ن.) گوستیل، گوستیرك: (خەلەكا زێری یان زیڤی).

ئەوا (ئاك.) وشەی خەبەردان لە ڕوودان: ئەوها بكەی نایەم.

ئەوە (ج.ن.) ئەوە تۆ بوویت ئاوا بە توندی لە دەرگات دا؟

ئەوەندە (ئان.) ١- ئـەو هەنـدە: ئەوەنـدە چـەندە؟. ٢- هەرچـەندی: ئەوەنـدە دەكەم نایەتە ڕایە. (ئاك.) منداڵەكە ئەوەندە گریا.

ئنجا (ئام.) ئینجا، ئەم جار، ئەم جاریش، ئمجا: نانەكە بخۆ ئنجا برۆ.

ئومێد (ن.) هیوا، هیڤی: (گەنـج ئومێدی زۆرە).

ئوجاخ (ن.) بنەماڵ، مالبات، عەشیرەت، ئویجاخ. (ئەوان ئوجاغ زادەن).

ئۆتۆمبێل (ن.) ماشێن، ترومبێل، قەمەرە: ئۆتۆمبێلی ڕەنگ سپی لەبرەودایە.

ئۆردوگا (ن.) ئۆردوو، لەشكر: ئۆردوگای پێمالك دەكەوێتە پشت شارۆچكەی قەلادزێ.

ئۆغر كردن (چ.) سەفەر كردن، ڕۆیشتن، چوون. ئەمە كەی كاتی ئۆغر كردنە؟

ئێتیم (ئان.) بێبـــاب، بـــاب مـــری، هـــەتیو: دلێ مرۆڤـــی ب زارۆكـــێ ئێتـــیم دسوژیت.

ئێجگار (ئان.) زۆر، یەك جار زۆر: پیاوێكی ئێجگار باشە. (ئان.) پیاوەكە ئێجگار بەپەلە رۆیشت.

ئێدی (ئاك.) ئیدی، ئیتر، لەمەودوا، لەمەوپاش، ژ نهۆ وێڤە، ژ نهۆ پاشڤە: (ئێدی نە هیچی من و نە هیچی تۆ).

ئێران (ن.) ولاَتێكە دەكەوێتە كیشوەری ئاسیا رووبەرێكی فراوانی هەیە، پارچەیەكی كوردستانی پێوە لكاوە. ئێران لەگەڵ هەرێمی كوردستان هاوسنوورە.

ئێستا (ئاك.) ئێستە، نوكو، هەنوكە، نهۆ، وێستا، تازە، ڤێ دەمێ، ئەلحان: ئێستا گەیشتمە جێ.

ئێستر (ن.) هێستر، بارەبەر، قانتر: لە كۆندا هێستر بۆ گواستنەوە بەكار دەهێنرا.

ئێسقان (ن.) ئێسك هی مرۆڤ یا ئاژەڵ: خواردنی شیر ئێسقان پتەو دەكات.

ئێسك (ن.) ١- هسك، ئێسقان، ئێسك شكان ناخۆشە. ٢- شێوە: منداڵی ئێسك سووك خۆشەویستە. — قورس: لە گۆڕە بە كۆمەڵەكاندا ئێسك و پروسكی كوردان دەدۆزرێنەوە.

ئێش (ن.) ئازار، ژان، ئێش و ئازار، نەخۆشی، پەژیك: چ ئێش وەكی یا ددانی نینە.

ئێشا زراڤ (ن.) سیل، وەرەم. (وی ئێستا زراڤی یاهەی).

ئێشان (چ.) هەست كردن بەئازار و ژان: منداڵەكە چاوی دەئێشا، ئێشانی لەش بەئازارە.

ئێڤار (ئاك.) ئێوارە، دەمێ پشتی نیڤرۆ و بەری رۆژاڤا: (ئێڤاری دێ هێم).

ئێكجار (ئاك.) بەجارێك، ب جارەكێ. (ئێجكار بێ تامی كردووە).

ئێكسەر (ئاك.) راستەوخۆ، یەكسەر. (ئەڤ بەرنامە ئێكسەر دێتە وەشاندن).

ئێلەك (ن.) یەلەك، پارچەیەك لە جلك مرۆڤ لەبەری دەكات، سنگ دادەپۆشێت: ئێلەكێ تە یێ جوانە.

ئێوارێ (ئاك.) ئێڤارێ، عەسرێ: ئێوارێ سەرتان لێ دەدەم.

ئیسراحەت (ن.) ١- حەسانەوە دوای ماندووبوون: جووتیارەكە ئیسراحەتی كرد.
٢- مردن: ئەو ئیسراحەتی كرد لەكۆڵ ئەم دنیا بۆوە.

**ئیتر (ئان.):** ئیدی، ئێدن، ئیدیکە: کە هاتی ئیتر مەچۆرەوە.

**ئیرۆ (ئاك.)** ئەڤرۆ، ئەمرۆ: کاری ئیرۆ نەئێخە سبەهی.

**ئیسلام (ن.)** ١- ئـاییینی محەممـەد. ئـاینی ئیسـلام پـیرۆزە. ٢- دوایـی ئـاینی ئاسمان. ٣- ناوە بۆ نێرینە.

**ئیش (ن.)** ١- کار، فرمان: ئیشەکانی دابەش کـردووە. ٢-پیشـە: ئیشـت چـی یە؟.

**ئیشەڤ (ئاك.)** ئەڤشەڤە، ئەمشەو: ئیشەڤ هەیڤە شەڤە.

**ئیشتیراکی (ن.)** هاوبەشـی: لـە رژێمـی ئیشـتیراکی دەبێـت هـەموو کەسـێك کـار بکات.

**ئیلهام (ن.)** ١- کارێك یا مەبەستێك بکەوێتە دڵی کەسێکەوە، سروش، وحی: (زۆر جــار ئیلــهام ئافرانــدن فەراهــەم دێنــێ) ئێغەمبــەران ئیلهامیان بۆ دەهات ئەوجا قسـەیان بـۆ خـەڵك دەکـرد. ٢- نـاوە بۆ مێ: (ئیلهام کچێکی ژیکەڵەیە).

**ئیمان (ن.)** باوەڕ، بڕوا (دینی و کۆمەڵایەتی: خوا ئیمانمان بەهێزبکات. بێ ئیمان، بێ باوەر: کافرەکان بێ ئیمانن.

**ئیمزاکردن (چ.)** مۆرکردن، واژوو کردن: پەیمانەکەیان ئیمزاکـرد، ئیمـزا کردنـی رێکەوتنامەکە دواخرا.

**ئینان (چ.)** ئـانین، هـاوردن، هێنـان، ئینـا (کـاری رابردوویـە): شـاگردی ئـاڤ ئینا.- هدەر: ئینادەر، دەرئینان (چ.).

**ئینجا (ئا. م)** ئنجا، ئـەمجا، لەدواییـدا، لەپاشـان، دواتـر، پـاش ئـەوە: وانەکـەم خوێند ئینجا نووستم. تێبینی/ لە ڕووی واتاوە وەکو ئاوەلکـار خۆی دەنوێنێ بەڵام لە بنچینەدا (ئامرازی لێکدەرە).

**ئینحیسار (ن.)** بەرێوەبەرایـەتی تووتنـە(وشـەیەکی عـەرەبی یـە)ئینحیسـاری تووتن لە رانیە هەیە.

**ئینساف (ن.)** ویژدان: دەبێت مرۆڤ بە ئینساف بێت.

**ئینگلیز (ن.)** نەتەوەیە: زمانی ئینگلیزی زمانێکی جیهانییە.

**ئینکارکردن (چ.)** دان پێدانــەهێنان، نەدرکانــدنی ڕاســتی، حاشــاکردن، نکـۆڵی لێکردن: (ئیناکی کردن جۆرێکە لە کەللەرەقی).

# ب

| | |
|---|---|
| با (ن.) | ١- هەوا، بزووتنەوەی توندی هەوا کە لە شوێنێکەوە بەرەو شوێنێکی دی هەڵدەکا: شەوانە بایەکی فێنك لەو ناوە هەڵدەکا. ٢- نەخۆشیو ژانێکی لەشە: با لە لاقەکانی داوە، پێویستە بچێتە لای دکتۆر. ٣- ئارەزووی جانەوەری مێ بۆ نێر: پشیلەکە وە با هاتووە. ٤- بەڵێ، ئا: -ئازاد نەهاتووە؟ -با هاتووە وا لێرەیە. |
| باب (ن.) | باوك، بابە، بابا: مرۆڤ بێ باب ئێتیم و بێ دایك سێوی دبیت. |
| بابان (ن.) | ماڵە باب{ دە ڕەبی بابانت شێوێ نێوت کەوتە ولآتان}. ٢- میرنشینێکی گەورەی کورد بووە، کە سەردەمانێك حوکمی کوردستانیان کردوە: میرنشینی بابان ماوەیەکی درێژ حوکمی کوردستانیان کردووە. |
| بابەت (ن.) | ١- جۆر، تەرز، شێوە لە کالآدا: ئەم بابەتەی تۆ دەتەوێت نیمانە. ٢- باس، لێکۆڵینەوە، وتار: بابەتێکم دەربارەی ئەدەبی بەرەنگاری پێشکەشکرد. |
| باپیر (ن.) | ١- باوکی دایكو باوك، بابە گەورە: چوار ساڵ لە ماڵی باپیرم ژیاوم. ٢- ناوە بۆ نێرینە. باپیر جوتیارێکی کارامە بوو. |
| باخچە (ن.) | ١- باغ، ڕەزی بچوك: باخچەکە فێنکە. ٢- شوێنێك وەك قوتابخانەیە بۆ پەروەردەی منداڵان لە چوار ساڵی : باخچەی شنۆ لەگەرەکی ڕاپەرینە. |
| بادام (ن.) | بادەم: بادامی کوردستان بە تامە. |
| بادان (چ.) | زڤڕاندن: گولیزارێ کەزیێن خۆ بادان. |
| بادینان (ن.) | ناوچەیەکی کوردستانە: ناوچەی بادینان پانو بەرینە. |

باژێڕ (ن.) شار: باژێڕێ هەولێرێ پایتەختا هەرێما کوردستانێیە.

بار (ن.) ١- ئەوەی بە پشتی ولاّخ دەگوازرێتەوە یان ئۆتۆمبێل: زوو بڕۆ بۆ ئـەوەی بارەکـەت بفرۆشـی. ٢- حالّـەت، بـارودۆخ: کۆمـەڵگا لـەبارێکی خراپدایـە، پێویسـتی بـە چارەسـەرە. ٣- سـپیایی‌و قەتماغـەی سـەر لێـو: زمـانم بـاری گرتـوە. ٤- ئـەرك‌و ڕەنـج: تکایە، نەدارە باری زۆر گران مەکەن. ٥- نەخۆشی‌و نەساغی: بیمارو لەش بە بارە. (ئان.) ٦- ڕاستی‌و دروستی: پیاوێکی بێ بـارە. ٧- سـازو گونجـاو: دەرفـەتێکی لـەبارە بـا لـە دەسـتی نەدەین. (ئاك.) ٨- پشت، ئەو دیوی شت: لە گۆڕەپانەکەی بار گردەکە بووین.

باران (ن.) ئەو ئاوەیە کە لە هەورەوە پەیدا دەبێت و دێتە خوارەوە.

باڕەش (ن.) ڕەشەبا. بای توند و بەتۆز، زریـان: هەنـدێك جار ڕەشـەبا دار بەڕەگەوە لە خاك دەردەهێنێت.

بارەگا (ن.) خانوبەرە، بنە، مەقەڕ: تا پـێش ڕاپـەڕین بارەگـای پێشمەرگە هەر لە شاخ بوو.

باریك (ئان.) ١- تـەنك، دژی ئەسـتوور: نـاو قـەدی باریکـە.٢- لـەڕو لاواز بەمرنادشۆ لەڕو باریك بوو.

باریك (ئان.) زراو، زراڤ: بەژنی باریك رێکە.

بارین (چ.) ١- هاتنـە خـواری ئـەو ئـاوە (بارانـە) یـان بەفرەیـە کـە لـە هەورەوە پەیدا دەبێت. ٢- بـۆ هاتنـەوە دەسـتی شـتی زۆریـش بەکاردێت: بەختیار وەك باران پارەی لێ باریوە!

باز (ن.) ١- باڵندەیـەکی گۆشـتخۆری تیـژ رەوی جوانـە هـەڵۆ: بـازێکی جوانیـان راو کـرد. ٢— دان: بـازدان لـە کـاری خـراپ. ٣— ار: ئەمڕۆ بازاڕی ئازاد دروست دەکرێ. — بـازێن: نـارین لـە بـاز بازێن کەوت. ٥— رگان: بازرگانی ئـەمڕۆ پێشـکەوتووە. — گـە: دەبێت بازگەکانمان توندو تۆڵ بکەین.

بازاڕ (ن.) شوێنی تێدا کڕین‌و فرۆشتنی شتومەك، شار، بـاژێڕ: بـازاڕ بـۆ پێشکەوتنی پیشەسازی زۆر گرنگە.

بازار (ن.) شـوێنی مامەڵـەو سـەودا: پێویسـتم بـەبازار هەیـە. خـوا- ت دا:فرۆشتنت زۆر بێ:ز

بازدان (چ.) ١- پـەڕین بـە هـەنگاو، بەپەلـە ڕۆیشـتن، لەترسـان هـەڵاتن: پیاوەکـە هـەر بـەبازدان دەڕوات.٢- یارییـەکی کوردەواریـیـە: منالان یاری بازدان دەکەن.

بازدان (چ.) بازبازێن، خۆ دسەر کۆسپەکیدا پاڤێـژیت: هەسـپی خـۆ دسـەر دیواریدا بازدا.

بازرگان (ن.ب.) ئەوەی کەلوپەل دەهێنێ‌و دەیفرۆشێ، ماڵ فرۆش، سـەوداکەر: بۆ ئەوەی ببیتە بازرگان پێویستە پارەی چاکت هەبێت.

بازرگانی (ن.و.) سـەوداگەری، مـاڵ فرۆشـی، کـاری بازرگـان: بازرگـانی ئاسـتی ئابووری وڵات پێش دەخا.

بازوو (ن.) قۆڵ، باسك: بەبازووی میللەت وڵات ئاوەدانە.

باس (ن.) لێدوان، خەبەرو هەواڵ: زۆر بـە خراپـی باسـی تۆیـان دەکـرد. ٢- لێکۆڵینەوە، بابەت باسەکەت ناوەڕۆکێکی پتەوی هەیـە. ٣- ناوە بۆ نێرینە: لالە باس، ئەحمەد باس.

باسك (ن.) ١- لە جومگەی دەسـتەوە تـا ئانیشـك: باسـکی لـە ڕاکردنەکـەدا شـکاوە. ٢- گـردو تەپۆلکـە، ملـەی کێـو: بـە باسـکە جـودا هەلگەڕا.

باسکردن (چ.) گفتوگۆ کـردن، پاشملـە: باسـکردنی خـەڵکیم بـەلاوە پەسـەند نییە.

باش (ئان.) ١- دروست، چاك، شیاو، خاس: من لـە هەڵبەسـت لەبـەر کردنـا باشم.

باش چاوەش (ن.) ئەفسەر، پلەداری سوپا: باش چاوەش ناردوویەتی بەشوێنما.

باشترین (ئان.) ١- هەرەچـاك، چـاکترین: باشـترین خـانوو دروسـت دەکـەم. ٢- نایاب: مێوژی مام زۆراب نایابە.

باشوو (ن.) ناوی مەلێکە: باشوو مەلێکی ڕاوکەرە.

باشوور (ن.) ژێـری، خـوراوو، جنـوب: بەشـێك لـە باشـووری کوردسـتان رزگارکراوە.

**باغو باغات (ن.)** پارچــه زەوییــەکی دیــاریکراو کــه داری بــه بــەری تێــدا دەچێنرێت: شارۆچکەی شنۆ بە باغو باغات بەناوبانگە.

**باقە (ن.)** باوەشێك گیای بەستراو: باقە گیایەك بۆ بزنەکان بهێنەرەوە.

**باکوور (ن.)** بەرانبەری باشور،سەروو، یەکێك لـە چـوار لاکان: کوردسـتانی باکوور لە تورکیایە.

**باکوور (ن.)** ژووروو، سەروو، ژۆرێ، شـیمال: سـەفەری بـاکووری کوردسـتان دەکەم.

**باڵ (ن.)** ١- شاپەڕی باڵندەو پەلەوەر: ئەوەی باڵی نـەبێ نـافڕێ.٢-بـاڵی چـەپی بـەر گوللـەی وێـڵ کـەوتووە. ٣- جۆرێکـە لـە پێوانـە: قوماشەکە سێ باڵ دەبوو.

**بالۆر (ن.)** جـۆرە گۆرانییـەکی کوردییـە: کچـانو کـوڕان بـەدەم گـۆرانیو بالۆرە دەچن بۆ مازو چنین.

**باڵا (ن.)** بەژن، قام، قەد: ئەسرین کچێکی باڵا بەرزبوو. ٢- (ن.) بڵنـدی و بەرزی: دەستێکی باڵای لە نووسینی پەخشانە شعردا هەیە. خوێندنی باڵا: ماستەر و دکتۆرا. ئەمساڵیش لە خوێندنی بـاڵا وەرنەگیرا.

**باڵا بەرز (ئان.)** بەژن بەرز، بەژن بڵند: کچە باڵا بەرزەکە هات.

**باڵا کورت (ئان.)** ببەژن کـورت، قووتـە: مرۆڤـی بـاڵا کورت هەسـت بـە کـەمیی دەکــات. — بــاڵا دەســت: ســەروەر کەســێکی بــاڵا دەســتە. — باڵاپۆش، عەبا: باڵا پۆشەکەی لێدێت.

**بالیف (ن.)** سەرین، جێ سەر، بالگە، بالین: دوو بالیفم کڕی.

**بامەڕنی (ن.)** دێیەکە لە نزیك شارۆچکەی ئامێدی.

**بان (ن.)** ١- سەرپۆشێ خانوی، سەرپۆشی ژوورێ : بانێ ڤـی خـانوی یـێ بلنـدە.٢- سـەربان: رویـێ سـەرڤە یـێ بـانی.٣- بـن بـان: رویـێ ژوورڤە یێ بانی.٤- بەربان، بەربانك: بەربهاڤێ برەخ خانیڤە.

**بانە (ن.)** ١- هێڵی ئامادەکراو بۆ تۆچاندن: جوتیار بانەی ئامادە کرد. ٢- لەوەرگـەی بـەهاران پـێش چـوونە زۆزان: فێگنەلەکـەی بـردە بانە. ٣- ناوی شارێکە لە کوردستان: پار چوومە سەقزوبانە.

| | |
|---|---|
| بانەمەڕ (ئاك.) | ١- قەسىێ چـونە هـەواران: كـاتێ بانەمـەڕە بـۆ كوێسـتان. ٢- مـانگی دووەمـی بـەهار لـە ٢١ ی نیسـان تـا ٢١ ی مـایس: (لـە مانگی بانەمەڕە ئەم فەرهەنگە دەنووسم). |
| بانگ (ن.) | بانگو ئاگاداری بۆ نوێژ: هێشتا بانگی نیوەڕۆی نەداوە. |
| باهۆ (ن.) | شانو پیل |
| باهۆز(ن.ل.) | گەردەلوول، گێژەلۆكە، بایەلیسك: دوێنێ گەردەلوول هات. |
| باو (ن.) | ١- باوك، بـاب: بـاوت لـە كوێیـە كوڕیژگـە؟ ٢- لەبـەر چـاو، لـە ئارادابوو: لە ژیانی لادێ هەرەوەزی باو بوو. |
| باوەڕ (ن.) | ١- بـڕوا، نیـەت، نیـاز، متمانـە، ئیمـان: بـاوەڕێكی پتـەوم بـە كێشەی گەلەكەم هەیە. ٢- سنووری نێـوان دوو زەوی، مـەرز: باوەڕی ئـەو زەوییـە لێـرەوە بەدواوەیـە. ٣- نـاوە بـۆ نێرینـە: باوەڕ كتێبەكەی بردبووم. |
| باوەش (ن.) | ئـامێز، هـامێز: دوو باوەشـە گیـای بـۆ كارەكـە هێنـاوە. مەلۆتكەكەی لە باوەش گرت. |
| باوك (ن.) | باب، باو، بابە: باوكم وەك برادەرم وایە لە هەڵسوكەوتدا. |
| بایەخدان (ن.) | نـرخ، بـەها، گرنگی: پێویسـتە بایـەخ بـە خێزانـی شـەهیدان بدرێت. — بایەخدان: بایەخ دان بە بواری پەروەردە پێویستە. —بایەخ پێدان: بایەخ پێدان بە دارستانەكان ئەركە. |
| بە ( ئام.) | ١- بەئـەو: ئیشـەكەم بـە ئـەو كـرد. ٢- وەرە: بـەو بـەو لێرانـەم ئەم شەو. |
| بە- (ئان.) | ١- بە بڕشـتو بـەهێز لـە ڕاپەڕانـدنی كـاردا: پیـاوێكی زۆر بـە بـڕە. ٢- بەڕێژنـە، دانەوێڵەیـەك كـە زیـاد بكـا بـە كوڵانـدن: بزنجێكی زۆر بە بـڕە. لـە (ئـاك.) بـەبێ پێـوان، بـێ ژمـاردن: ئەم دارانە لە بڕ بە چەند بیانبەم. —دان (چ.) بوار دان، ڕێگا دان، ڕاوەسـتان: ئـەم ڕووبـارە بـڕ نـادا. — بـوون (چ.) دوور كەوتنـەوە، كـەرت بـوون، سـەر پـەڕ بـوون: ئـەم گیسـكە لـە مێگەلەكە بڕ بووە. |
| بە ... ەوە (ئام.) | بە خوێندنەوە سەر دەكەوێت. |

به ئازار (ئان.) به ئەزیەت، به ژان: شکان زۆر به ئازاره.

به پیت (ئان.) بەهێزی خاك بۆ کشتوکاڵ، بەسوود، به کەڵك: قەراج ولآتێکی بەپیته بۆ دەغڵ.

به ڕەوشت (ئان.) به ئاکار، به ئەخلاق: قوتابخانه منداڵ بەڕەوشت دەکات.

به سۆز (ئان.) ١- بـه ڕەحـم، بـه گفـت، بـه بـەزەیی: پیـاوی بەسـۆز بـه هەڵسوکەوتییەوه دیـاره. ٢- ورووژێنـەر: شـیعرەکانی زۆر بـه سۆز دەخوێندەوه.

به سوود (ئان.) به فایده، به قازانج: کۆڕەکەی دوێنێ به سوود بوو.

به گشتی (ئاك.) به تێکڕایی، هەموو: ئێمه به گشتی زیرەکین.

به کەڵك (ئان.) بەبەهرەو بەسوود: وتاری به کەڵك مێشك دەکاتەوه.

بەباشی ( ئاك.چ.) بەچاکی، بەڕێکی، بیروڕاکان به باشی خرانه ڕوو.

بەبه (ن.) ١- منداڵی شیرەخۆر، ساوا: بەبەکەتان چۆنه؟ ٢- کورتکراوەی بابان: سلێمان پاشای بەبه شاری سلێمانی دروست کردووه.

بەبەر (ئان.) ١- بـه میـوەو بـه بـەهره: باخچـەیەکی بەبـەریان هەیـه. ٢- کوتـاڵی بـەرینو پـان: ئـەم جۆرەیـان گـرانتره، چـونکه بـه بەرتره.

بەبەرداکردن (چ.) ١- دان دانه پەلەوەر: دانەکەم بەبەردا کـردن. ٢- بـۆ هێنانـەوه، تێ ئاخنین، چاککردنەوه، هێنانەوه سەر پێ: دەرمانەکه گیـانی بەبەردا کردەوه.

بەبیرداهاتن بـیرو فکرێـك کـه مێشـك توانـای ڕاگرتنـی هەیـه بـه خـەیاڵ داهـاتن: وتم ئـەی نیشـتمان تـۆم هـەر لـه بـیره.( هـێمن موکریانی) هەر کات یادی ئەوم به بیردا دێت.

بەتیژی (ئاك.) بـەگوڕ، بـەخوڕ، بەتونـدی، بـەهێز، بـەتین: بایەکـه بەتیـژی هەڵی کرد. (ئان.): ڕۆیشتنەکەی به تیژییه.

بەتین (ئان.) بەهێز، پتەو، خورت، زیخ، چەلەنگ: ئەو باوەڕی زۆر بەتینه.

بەپەله (ئاك.) بەخێرایی، بەگورجی: بەپەله هاتم بۆ زانکۆ.

بەپیتو فەڕ (ئان.) بەسوودو بەرەکەتو بەهێز. ولآتێ ئێمه بەپیت و فەڕه.

بەجەرگ (ئان.) ئازا، بوێر، بەغیرەت، مەرد، نەترس: پیاو گەر بەجـەرگ بێت

لەچاوی شێر ناگەڕێتەوە.

بەجەرگ (ئان.) مەرد، ئازا، قارەمان: پێشمەرگەی کورد بەجەرگە. (ئاك): پیاوەکە بە جەرگ دەدا.

بەجێهێشتن (چ.) ١- جێهێشتن، نەهێنانەوە: قەڵەمەکەم لەماڵەوە بەجێهێشتووە. ٢- بەپێشکەوتنەوە لە ڕاکردنو ڕۆیشتندا: هەموویانم بەجێهێشتن.

بەخۆوە (ئان.) گەورە، قەبە، زەلام، کەتە، کەڵەگەت: سیروان کوڕێکی بەخۆوەیە.

بەختیار (ئان.) ١- بەختەوەر، بە بەخت، بەخت بۆ هاتوو: لەهەموو هەوڵێکدا بەختیار بووە. ٢- دڵخۆش، کەیفخۆش: بەهاتنتان بەختیار دەبین. (ن.) ٣- ناوە بۆ نێرینە: بەختیارم لەبازاڕ بینی.

بەختیاری (ن.و.) ١- خاوەن بەختی: بەختیاری ئێمە لەوەدایە، کە هەمیشە یەکگرتوو بین.

بەخشین (چ.) ١- پێدان بەبێ بەرامبەر، پێشکەشکردن:خەڵاتی یەکەمی پێشبڕکێکە بە من بەخشرا. ٢- گەردەن ئازا کردن، لێبوردن، واز لێهێنان: ئەمجارە دەتبەخشم بەو مەرجەی دووبارەی نەکەیتەوە.٣- فیدابوون، گۆڕی بوون، قوربانی بوون: خۆمان لە ڕێی وڵات بەخشیوە.

بەخێو (ئان.) ١- بەخاوەن. —کردن (چ.) ٢- پەروەردە کردن، ئاگاداریکردن، سەرپەشتیکردن: بەخێو کردنی ئاژەڵ سامانی وڵات زێدەتر دەکا.

بەخێو کردن (چ.) پەروەردە کردن، گەورە کردن: بەخێو کردنی هەنگ سوودی زۆرە.

بەد (ئان.) ١- خراپو دوور لە چاکە: بۆ وادەکەی، کاری بەد لە تۆ ناوەشێتەوە. ٢- هاروسەرپێچی کەرو لاسار: منالێکی بەدە.

بەد خوو (ئان.) بەد ڕەفتار، خوو ڕەوشتی خراپ، هەڵسوکەوتی ناشیرین: مرۆڤی بەد خوو نا پەسەندە.

بەد فەڕ (ئان.) نا موبارەك، بێ سوود، بێ ودم: بەد فەڕ مەبە بۆ ئەوەی

هەمووومان ڕێزت بگرین.

بەدەستەوەدان (چ.) دانەدەست ، تەسلیم کردن: بەدەستەوەدانی پێشمەرگەکە خیانەتێکی گەورەبوو.

بەدەم (ئان.) ١- قسە زانو بە قسە، زمان درێژ: خۆتی لێ مەدە زۆر بە دەمە. ٢- زۆر خۆر: منداڵێکی بەدەم و جەم نییە. (ئام.) ٣- لەگەڵ، هاوشان، بە: بەدەم قسە کردنەوە ڕۆیشتین.

بەدەمار (ئان. ل) ( بە + دەمار ): ١ـ کەسی ئازاو نەترس ، بەغیرەت. ٢ ـ کەسێك کە خەڵکی دیکەی لێ بترسێن، بەشەرەف، بەناموس: مرۆڤی بە دەمار هەرگیز سڵ ناکات.

بەدەر (ئان.) لە سنووردەرچوون، زیاد لەحەدی خۆی: زوڵمی سەددام ئەندازە بەدەر بوو.

بەدڵ ( ئان.) ١- بەڕاست، لەناخی دڵەوە: بەدڵ تێبکۆشە. ٢- بەخشندە، سەخی: پیاوێکی بەدڵە.

بەدڵداچوون (چ.) ئاقڵ گرتن، خۆش ویستن: من تۆم بەدڵدا چووە.

بەدی (ئان.) ١- دیتن : لەڕووەوە بەدیم کرد.٢- بەگومان و مەزەندە: بەخەیاڵم شوێنیم بەدی کردووە.٣- بەڵێ، بەرێ، ئارێ: نەچووی؟ بەدی چووم.٤- خراپ: تۆ بەدی لە هەڵستو کەوتدا.

بەدیکردن (چ.) دیتن، ئاشکرا بوون، هەست پێکردن: تا نزیك نەبینەوە بەدیمان ناکەن.

بەر (ن.) ١- سنگو بەرۆك: پەلاماری داو توند بەری گرت. ٢- میوەی دارو بەرهەمو بێستان: دارەکان بەری باشیان گرتووە. ٣- تۆڵ، پز، بەچکەی ناو سك کە دەمرێ: بزنەکە بەری هاویشت. ٤- لا، تەرەف، ئەوبەر گوند: ماڵیان لەو بەرییە. ٥- ڕادەو ئەندازە، بەرینی: ئەم قوماشە بەری تەسکە. ٦- روو لە قوماشدا، رووی سەرەوە، لا: ئەمە بەرەکەیەتی. ٧- ئەو تووکەی لە دیوی ناوەوەی قاپووتو پاڵتۆدا هەیە: پاڵتۆکەت بەرێکی گەرمی پێوەیە. ٨- پاشماوە یا نەوەکانی کەسێك:

ئەوانــەی بــەرەی ســنەیلی خدۆیینــە. ٩- ڕووی خــانوو، لای پێشەوەی خانوو: خانووەکەیان بەری لە ڕۆژئاوایە. (ئـاك.) ١٠- خـوار، ژێـر، بـن: ماڵیـان کەوتۆتـە بـەر جـادە. خـوێن بـەری جادەی گرتووە. (ئاك.) ١١- پێش، بەرامبەر، بـەردەم: ڕاکـە تـا هەڵنەهاتووە بەری بگرە.

بەراز (ن.) گـاکۆل، گیانــدارێکی قــورس‌و بــەهێزە: بــەراز گیانــدارێکی بەهێزە.

بەرامبەر (ئاك.) بەرانبەر، ڕووبەڕوو: بەرامبەر پەنجەرەکە دامەنیشە.

بەرامبەر (ئاك.) بەرانبــەر، هەمبــەر، بەرهەمبــەر: پەنجــەرێن دلان بەرامبــەر ئێکن.(پەندە)

بەرانان (ن.د.) ناوی شاخە: بەرانان زنجیرە شاخێکی سەرکەشی کوردستانە.

بەراو (ن.) زەوی‌و میوەیە کە بەراوبێ، ئاوی، ئاویژە، پـاراو، دەراو: بـرنـج لە زەوی بەراودا دەچێنرێت.

بەراورد کردن (چ.) بەرامبەر یـەك کـردن لـە هەڵسەنگاندندا: مـن‌و ئـازاد لەگـەڵ یەك بەراورد مەکە.

بەربەرەکانێ (ن.) ١- لــە ڕوودا وەســتان، وەگــژ ڕاچــوون: ئاگــات لــەخۆت بــێ بەربــەرەکانێی لەگەڵـدا نەکـەی. ٢- کێبڕکـێ، ڕکەبـەرێ: لـە بەربەرەکانێی دوێنێدا رزگار خێراتر بوو.

بەربەست ( ن.ل.) ١- بەربەس، لەمپەری ئاو گەڕانەوە: بەربەستی ئاوەکـەم چـاك کرد.٢- لەمپەری سەر ڕێگا، ڕێ بەندان: بەربەستی چوونە ناو گوندەکە هەلگیرا.

بەربەست (ن.ل.) ڕێگر، لەمپەر، ئاستەنگ: من بەربەستی تۆ نیم.

بەڕە (ن.) رایەخ، گلێم، بەڕ ەڵای ئەنکی یەوە دەدرێ.

بەرە مێو (ن.د.) ئــەو مێوەیــە کــە لــە زســتاندا کــون‌و کەلەبــەری کــورەی پێدەگیرێت: کورەی هەنگ بە بەرە مێو دادەپۆشرێت.

بەرەو پێشچوون(چ.) پێشــکەوتن، گەشــە کــردن، هــەنگاونان: دوای ڕاپــەڕین کێشەکەمان بەرەو پێش چووە.

بەرەبەرە (ئاك.) لەسەرخۆ، وردە وردە، پەیتا پەیتا: خوێندکارەکـە بـەرە بـەرە

زیرەك دەبێت.

بەرەبەیان (ئاك.) بەربەیان، تاریكو ڕوون: لە بەرەبەیانەوە تا ئێستا لێرەم.

بەرەبەیان (ئاك.) كازیوە، كاتی بەیان: بەرەبەیان بەرەو كار دەكەومە ڕێ.

بەرەڤ (ئاك.) بەرەو: ئازادی و دیموكراسیەت بەرەڤ بنەجهیێ دچێت ل كوردستانێ.

بەڕەڵڵا (ئان.) ١- لەدەست دەرچوو، بەر هەڵبوو: گۆلكەكە بەرەڵڵا بوو، بیگرەوە. ٢- ئازاد كراو، بەرهەڵدراو، واز لێهێنراو: هەموو گیراوەكان بەڕەڵڵا كران. ٣- ڕووتو قووتوبێشەرم: كچێكی بەرەڵڵایان هەیە.

بەرەنگاربوونەوە (چ.) بەگژاچوونەوە: بڕیاری بەرەنگاربوونەوەمان داوە.

بەرەو (ن.) برەو بەكارەكە دەدەین. بۆ ئاست بەرەو سەركەوتن دەچن.

بەرپابوون (ك.) سازبوون، دامەزران، هەڵگیرسانی شەڕو ئاژاوە: بەرپابوونیشەڕی ناوخۆ نیگەرانی دەخاتە ناو خەڵكەوە.

بەرپاكردن هەڵگیرساندن، سازكردن: بەرپاكردنی شۆڕشەكانی كورد لە پێناوی ڕزگاری بوو.

بەرخۆدان (ن.) خۆڕاگری، بەڕەڤانی: بەرخودانا كوردان نیشانا سەرووەریا وانە.

بەردار (ن.) بەرهەمدار، داری بەبەر، داری بە بەرهەم: دارێن بەردار ل كوردستانێ زۆرن.

بەردان (چ.) دەركرن، ئازاكرن، ئازادكردن، دەست ژێ كێشان. بەردا (كاری رابردوویە): سترانبێژی دەنگێ خۆ بەردا.

بەردین (ن.د.) لەبەرد دروستكراو، لەبەرد داتاشراو: خانووی بەردین بەرگەی سالآنێكی زۆر دەگرێ.

بەرز (ئان.) ١- بڵند، بالآ: لووتكەی هەلگورد بەرزە. ٢- گەورە، مەزن، پیرۆز: شەرەفنامە كتێبێكی مێژوویی بەرزە.(یادەوەریەكە بەرز راگیرا).

بەرز كردنەوە (چ.) بڵند كردن: بەرزكردنەوەی ئاستی هۆشیاری پلانی باشی دەوێ.

| | |
|---|---|
| بەرزبوون (چ.) | بڵندبوون، ڕاست بوونەوە، هەڵستان: بەرزبوونەوەی ئاستی خوێندن بە هەوڵدان دەبێ. |
| بەرزەبوون (چ.) | ونبابوون، هندابوون، بزربوون، بەرزەبوو ( کاری رابردوویە): فرۆکە هند بلند بوو تا لبەر چاڤێن من بەرزەبوو. |
| بەرزکردنەوە (چ.) | هەڵکێشان، بڵندکردن: بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندن بە بەرنامە دەبێ. |
| بەرسڤ (ن.) | وەلاّم، بەرپەچ: ئەگەر تۆ بەرسڤا دروست نەزانی، نەدە. |
| بترسی (ئان.) | بە تەنیا، بە تەنها، بە وشکی، بهشکی: خوارنا نانێ بێ پێخوارنە. هەژار یێ نانی بترسی دخۆت. |
| بەرچاو (ئان.) | دیار، زەق، ئاشکرا، لەبەرچاو: شوێنێکی بەرچاوتان هەیە. |
| بەرچاو کەوتن (چ.) | دیتن، وە پێش چاو هاتن، ئاشکرا بوون: شتێکی لەو جۆرەم لەبازاڕ بەرچاو کەوت. |
| بەرچاوتێر (ئان.) | سەخی، دڵ فراوان: مام پیرۆت پیاوێکی بەرچاوتێرە. |
| بەرچایی (ن.) | پێخۆر، ئەو شتانەی لەگەڵ چا دەخورێن: بەرچایی باشیان هەبوو. |
| بەرگ (ن.) | ۱- پۆشاك جلك: بەرگی سپی جوانە. ۲- گەڵا، پەلك: دۆڵمەی بە بەرگە مێویان لەگەڵ خۆ بردبوو. بەرگ: بەش volume: فەرهەنگی خاڵ سێ بەرگە. |
| بەرگ (ن.) | ۱- گەلاّ، پەڵك: لەپایزدا بەرگی دار دەڕوێ. ۲- پشتەکتێب: بەرگی کتێبەکە بە وێنەی جوان رازاوەتەوە.۳- بەش: دیوانی پیرەمێردی شاعیر سێ بەرگە. فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە یەگ بەرگە<br>٤- جلك، پۆشاك: دەستێك بەرگی جوانم بە دیاری بۆ هات. |
| بەرگەگرتن (چ.) | خۆگرتن، هەڵکردن، پێوەستان، تەحەمول کردن: دایکم بەرگەی ئەوخەمانە ناگرێ، حەزناکەم هەواڵەکەی پێڕابگەیەنم. بەرگە گرتنی دووری تۆ ئەستەمە |
| بەرگری (ن.و.) | ۱- بەرهەڵستی لە ئاست کەسێك. ۲- بەربەرەکانیو پێشگرتنی دوژمن. وەزیری بەرگری عێراق بەرپرسە لە کۆمەڵکوژی |

کورد.

**بەرگری کردن (چ.)** بەری دوژمن گرتن لە بەرامبەری وەستان: بـەرگری کـردن لـە ولاّت وەفادارییە.

**بەرفرەھ (ئان.)** پان و بەرین، فراوان: زەڤیا مە یا بەرفرەھە.

**بەرکەڤتی (ئان.)** هێژا، بەهادار، بەنرخ. زەلامەکی بەرکەڤتیە.

**بەرماڵ (ن.)** ئەوی نوێـژی لەسـەر دەکـەن، دوگـرد: بـەرماڵێکم بـۆ هـاتووە. _(ئاك.) پێش دەرگا: بەرماڵیان گوڵ و گوڵزارە.

**بەرهەڤکرن (چ.)** ئامادەکردن. ئەڤ کتێبە ژ بەرهەڤکرنا هەڤژینێ منە.

**بەرهەم (ن.)** ١- داهات،بەهرە،بەروبووم: بەرهەمی تووتن بـە نـرخـە.٢- نـاوە بۆ نێر: بەرهەم چیرۆك نووسە.

**بەرهەم (ن.)** بەرهەڤ: پەڕلەمانو حکومەتی هەرێم بەرهەمی راپەڕینن. — بەرهەمهێنان: پێگەیاندن: تا ئاستی بەرهەم هێنـان زۆر بێـت، خـەڵك خۆشـگوزەران تـر دەبێـت. — بەرهـەمهێن: کوردسـتان پێویستی بە بەرهەم هێنی زۆر هەیە.

**بەرهەم هێنان (چ.)** وەبەرهێنان، رەنێوهێنان: بەرهەم هێنانی دانەوێڵە پێویستە.

**بەروبووم (ن.ل.)** بەرهـەم، حاصـلات، رەنجـی کـارکردن: ئەمسـاڵ بـەروبوومان زۆرە.

**بەڕوو (ن.)** ١- جـۆرە بــەروبوومێکی داری لێــڕە، دەخـورێو دەشــکرێتە ئالیك. (ئان.) ٢- بە حورمەت، ڕووسپی، بەڕێز: پیـاوێکی زۆر بـە ڕووە. ٣- بـێ شـەرم، چـاو دانەنـەر، ڕوو قـایم: ئـەو زۆر بەڕووە هێشتا قسان دەکات.

**بەری (ئاك.)** پێشی، بەرلە. ئەو بەری تویە.

**بەرێ (ئان.)** کەڤن، کۆن. ئەو تشتێن بەرێ دێرۆ کامە ڤەدگێرن.

**بەڕی (ن.)** دەشت، بیابان، چۆڵ. ئاژەلە کال بەڕی یە.

**بەرێ خۆدان (چ.)** تەماشـاکردن، سـەیرکردن، ئاوڕدانـەوە، بـەرێ خـۆکرن، بـەرێ خۆدا ( کاری رابردووە): تە بەرێ خـۆدا یاریـا تۆپـانێ؟ بـەرێ خــۆ کــرە (کــاری رابردوویــە): زارۆکــان بــەرێ خــۆ کــرە تێلەڤزیۆنێ.

بەڕێز (ئان.) ١- بە قەدر، بەشانو شەوکەت، خۆش ڕوو: پیاوێکی زۆر بەڕێزە. (ئاك.) ٢- بەتەنیشت یەکەوە: بەڕێز لەبەردەم دووکانەکە وەستابوون. (ن.) ٣- ناوە بۆ مێینە. بەڕێز قوتابییەکی ژیکەلەیە.

بەریك (ن.) گیرفان، بەرك: دەستێ خۆ نەکە دبەریکێن خەلکێدا!

بەڕێکەوتن (چ.) ١- چوونە ڕێ، ڕۆیشتن، وەڕێکەوتن: لە بەری بەیانەوە بەڕێکەوتین. (ئاك.) ٢- بێ چاوەڕوان کردن، بەبێ زانین: بە ڕێکەوتن هەردووکیان لەوێ دیتران.

بەرین (ئان.) پان، فراوان، گەورە، فرەھ: بەری قوماشەکە بەرینە.

بەڕێوەبەر (ن.) مودیر، کارگێڕ، پیچاران: بەڕێوەبەری خوێندنگاکە لێوەشاوەیە.

بەڕێوەبردن (چ.) ١- بەخێو کردن: براکەمان بەڕێوەمان دەبا. ٢- کار ڕایی، سەرپەرشتیکردن، ئیدارەوان: ئەو کارەی لەبەر دەستییەتی باش بەڕێوەی دەبا.

بەڕێوەچوون (چ.) بەڕێوەبردن: بەڕێوەچوونی تاقیکردنەوەکان سەرکەوتوو بوو.

بەز (ن.) ( ز.)ەکە ناسکە، قەڵەوی. ئەم مەڕە بەزی زۆرە.

بەزەیی (ن.) دڵنەوایی، سۆز: بەزەییت بە هەژاراندا بێتەوە.

بەزەیی (ن.و.) دل پێسوۆتن، دل پێڤەمان، دلۆڤانی: بەزەییم بە منداڵە نەخۆشەکە هات.

بەزم (ن.) ١- خۆشیو کەیف، بەزمو ڕەزم: کە گەیشتینە مەیدانەکە دامانە بەزمی خۆمان. ٢- تەشقەڵەو گاڵتە پێکردن: یەك بەزمم پێکرد خەریك بوو ناوی خۆی لەبیر بچێتەوە.

بەس (ئام.) ١- لێ، بەلێ، بەلاّم: ئەز چووم بەس من نەدیت.٢- هند، چیدی: بەس باخڤە.

بەسۆز (ئان.) ١- بەعاتیفە: عەلی مەردان دەنگێکی بەسۆزی هەیە.٢- ناوی ژنان: بەسۆز کچەبێژەرێکی کوردە.

بەست (ن.) ١- قەراخ، چەمی زیخەلاّن: بەستەکەی بەرماڵانی گوندەکەمان ڕێکخرایەوە. ٢- چەمی نیوە وشك، کەم ئاو: بەستی خاسەی

کەرکووك هەر کەم ئاوە.٣- کۆبوونەوە: ڕۆشنبیران لەیادی زیرەك لە هۆڵی میدیا کۆڕیان بەست. ٤- گرێ: کۆمپانیاکە بۆ دروستکردنی قوتابخانەیەك گرێ بەستی مۆرکرد.

بەستە (ن.) ١- کورتە گۆرانی کە لە فۆکلۆردا هەیەو دوای حەیران دەگوترێت: بەستەیەکی خۆشمان بۆ بلێ. ٢- فایدەو بەهرە: چی تێدا بەستە نی یە. ٣- چمك، دەستە، دەسك: گوڵەکانم کرد بەبەستە. ٤- پەیوەند، پەیوەست: خۆ بەستەی تۆ نیم.

بەستەڵەك (ئان.) زەمینی سەهۆڵاوی: لەناوچەی بەستەڵەك ژیان زەحمەتە.

بەسەر (چ.) کات بەرێ کردن، ژیان بەرێوە چوون: کاتێکی خۆشی بەسەر برد.

بەسەرکردنەوە (ك.) سەردان، لە هەواڵو بار پرسین، لێ پێچانەوە، لێ تۆژینەوە، تاقی کردنەوە، پێکەوتن: لەرۆژی جەژندا خزمان بەسەر دەکەمەوە. بەسەر کردنەوەی خزمان فەرمانێکی دینییە.

بەسەرهات (ك.) ڕووداو، سەربوردە، سەرگوزشتە، ئەفسانە: کابرا بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە.

بەسوود (ئان.) بە قازانج: خوێندنەوە هەمیشە بەسوودە.

بەش (ن.) ١- پار، بێش، حیسە، پشك، بەرکەوت: دەبێ بەشەکەی من زیاتر بێت. ٢- بەس، تێر، رادەی گونجاو: ئەو پارەیەی پێتە بەشمان دەکات. (ئان.) ٣- بە ئاژەڵێك دەگوترێ کە نێو چەوانی سپی بێ: بزنە بەشەکە فرۆشراوە. ٤- بەگوێرە، بەقەد: بەش بەحاڵی خۆم ڕازیم.

بەشدار (ن.) ١- خاوەن بەش، شەریك، هاوکار، پشکدار، هاوپشك، هاوبەش: لە خەمەکەتاندا بەشدارم. ٢- ناوە بۆ نێرینە. بەشدار وێنەگرێکی ناودارە.

بەشوێن ناردن (چ.) بەدوا ناردن: ئازادیان بە شوێن ناردبووین.

بەشێنەیی (ئان.) بەهێمنی، بەبێ دەنگی، بە ئارامی: کێشەکە بەشێنەیی کۆتایی هات.

بەچکە (ن.) بێچوو، بەچکەی باڵدار، جووجەڵە: چۆلەکەکە بەچکەکەی

هەڵفڕاند.

بەگ (ن.) گەورە، خاوەن موڵك و دەسەڵات. نازناوی ئاغـاو خـان: کـەریم بەگ سەرۆکیان بوو.

بەگژ داچوون (چ.) بێ گوناه سووچ قسەو شەر لە گەل یەکێك: نەیزانی لـە خـۆرا بەگژی داچوو

بەگوێرەی (ئاك.) بەپێی، وەك: بەگوێرەی پێویست خۆم ماندوو دەکەم.

بەفر (ن): بەرف کلۆیەکی سپی شەشپەڕ کە زستان لە هەورەکانەوە دێتە خوارێ: روخساری وەکو بەفری یەك شەوە پاك و ڕوون بوو.

بەفر (ن.) ١- بـەرف، ئـەوکولوە سـپیانەی بـە زسـتانان دەبـارنو لوتکـەی شاخەکان دادەپۆشن. ٢- سەهۆڵ، بوز: بەفرێکی زۆر باریوە.

بەفرەمبار (ن.ل.) بـەفرانبار، هـەوەڵ زسـتان، کـانونی پێشـێ، مـانگی بـەرایی زستان: لە مانگی بەفرەمبار براکەم گەڕایەوە کوردستان.

بەفرین (ئان.) ١- شـوێنی بـەفراوی: چـیاکانی کوردسـتان بـەفرینن. ٢- نـاوی ژنانە: بەفرین چیرۆکی منداڵان باش دەنووسێ. ٣- سۆروسپی: ئەو بەفرینە بەفرو ڤینە.

بەفیڕۆچوون (چ.) فەوتاندن، لە دەست چوون: کـات بەفیڕۆچـوون خوێنـدکار لـە خوێندن دوا دەخات.

بەکار (ئان.) بە ئـیش، کەسێك کـاری هـەبێت، سـەرقاڵ، پـڕ ئـیش: نـاتوانم بێم زۆر بەکارم.

بەکار هێنان (چ.) ١- بەکار بردن، خستنە کـار: ڕێـژەی بـەکارهێنانی ئینتـەرنێت زیـادی کـردووە. ٢- خـەرجکردن، سـەرفکردن: زەخیرەکـەمان کەم ماوە، چونکە زۆرمان بەکارهێناوە.

بەکارە (ئان.) ١- بــە توانــا، بــەهێز، چــەلەنگ: منــداڵێکی بەکارەیــە. ٢- کاریگەرە: ئەم دەرمانە زۆر بەکارە یەکاویەکە.

بەکارهێنان (چ.) دەکارکردن: بەکارهێنانی کەلوپەلی نەخۆش خراپە.

بەکرەجۆ(ن.ل.) نـاوی شارۆچـکەیەکە: بـەکرەجۆ شارۆچکەیەکە لـە سـنووری سلێمانی.

بەکرێ گیراو (ن.ب) ١. هەر کەسێك کە بە پارە لای کەسانێك کار بکات.

٢ـ کەسێك یان کەسانێك کە نۆکەری کەسێکی هێزدار و دەسەڵاتدار بکەن یان بۆ بەرژەوەندی ئەو هەوڵ بدەن و سیاسەتی ئەوان ڕەچاو بکەن (خۆ فرۆش)

بەلاتینك (ن.) پەلاتینك، پەپوولە، پەروانە، بالاتەنك، بەلاتیتك: بەلاتینك پێشیکەکا زۆر جوانە.

بەلاڤ (ئان.) بلاّو، پەرت.

بەلاّم (ئا.م) بەلان ، ئەمما، بەس: چاوەروان بووم بەلاّم نەهاتی .

بەلەزەت (ئان.) بەتام و خۆش: خواردنێکی بەلەزەت دەخۆین.

بەلگە (ن.) ١- دەلیل، سەنەد، گەواهی، شتێك کە بکرێتە پێناوی ئاشکرا کردنو زانینی شتێکی دی: بۆ تۆمەتبار کردنی تاوانبارەکە، دادگا بەلگەی تەواوی پێ دەردەست نەبوو. ٢- نووسراو و شتی بەجێماو لە کۆنەوە: بەلگەی مێژوویی زۆر ماونەتەوەو دەری دەخەن شارستانییەتییەکی کۆن لەو ناوچەیەدا هەبووە. ٣- پێناس، ناسنامە: ئەگەر رایانگرتین هیچ بەلگەت پێیە؟

بەڵکو ( ئام.) ئەگەر، هەروەها، هەروەك، بەشکو، بەشکم، بەلکی، تەنانەت: نەك هەر ئەو بەڵکو هەمووشیان بێن لەگەڵیان ناچم.

بەڵکو (ئام.): بخوێنە بەڵکو سەر بکەویت.

بەلکی (ئام.) بەڵکو، بەشکو، لەوانەیە، دوورنیە. خۆ بگرن بەلکی ئەو بهێت.

بەلنگاز (ئان.) پەرێشان، شپرزە، پەرێشان: مرۆڤێ بەلنگاز هەر یێ تەپە سەرە.

بەڵێ (ن.) دژی نەخێر، بەرێ، ئا، با: بەڵێ بۆ یەککگرتن.

بەڵێن (ن.) پەیمان، دەستەبەری، شەرت بۆ ئەنجامدانی کارێك، قەول، گفت، مەرج: بەڵێن دەدەم لەمەولا کاری سەرەڕۆیی ناکەم.

بەڵێن دان : سوزدان، قەولدان: گۆران بەڵێن دەدات ئەمساڵ لە وانەکانیدا دوا نەکەوێت.

بەم جۆرە (ئان.) بەمشێوەیە، بەم ڕەنگە: بەم جۆرە قسانە باوەڕ ناکەم.

بەمۆ (ن.) ناوی شاخێکە: لوتکەی شاخی بەمۆ بەرزە.

بەن (ن.) ١- هەودای لە خوریو موو دروستکراو: گوریس لە بەن دروست دەکرێت. ٢- داو، پەتك، بەستەر: بەو بەنە بیبەستەوە. ٣- دار قەزوان، دارە لێڕ: بنێشتی کوردی لە دارە بەنەوە بەرهەم دەهێنرێ.

بەناو بانگ (ئان.) ناودار، بەناوو دەنگ، بەشۆرەت: گۆران شاعیرێکی بەناو بانگە.

بەناوبانگ (ئان.) ١- خاوەن ناوبانگ، بەناو و دەنگ: خانەوادەیەکی بەناوبانگن. ٢- گەورە، سەرۆك، پیاو ماقووڵ: بەناوبانگیان کێیە؟ کێ لە ئێوە بەناوبانگە؟

بەند (ن.) ١- بەستی بەرگیری لافاو و ئاو: بەندی دوکان یەکێکە لە سەرچاوەکانی کارەبای کوردستان. ٢- پارچە، کۆپلەیەك لە شیعر: شیعری نوێی کوردی حیسابی بەندی بۆ دەکرا نەك حیسابی کۆن کە لە کلاسیکدا دەکرا. ٣- مادده لە دەستوورو بڕیار نامەکان: دەبێ تەواوی بەندەکانی دەستوور جێبەجێ بکرێن. ٤- کورتە گۆرانی دوای حەیران: حەیرانێكو دوو بەندمان پێگوت. ٥- دەستە: دوو بەند کاغەزمان بۆ بێنە. ٦- کاتو وەخت: لە سەروبەندی پێکەوە نانی حکومەتدا خۆی کێشایەوە. ٧- دیل، گیراو: تەواوی بەندەکانتان بەرهەڵدەن. ٨- کۆیلە، عەبد: هەڕەمەکانی میسر بە دەستی بەندەکان دروست کراون.

بەنداڤ (ن.) سکر، دەربەند. بەنداڤا دهۆك یا بچیکە.

بەندایەتی (ن.) کۆیلایەتی، عەبدایەتی: بەندایەتی وەك سیستەمێك تا سەدەی نۆزدەش لە ئەفریقیا هەر باو بوو.

بەندە (ن.) ١- کۆیلە، بەنە، بەنی، بەند: شوورەی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆما بەندەکانی ئەوکات دروستیان کردووە.

بەندەخوێن (ن.ل.) دۆخین، قایشی بەستنی پانتۆڵ، بەن دۆخین: بەندەخوێنێکم کڕی.

بەندك (ن.) بەن، كندر، ژ هریێ چێدكەن و بۆ گرایدانێ بكار دهێت. ئەڤ لیفكە یێ ژ بەندكی چێكری.

بەنرخ (ئان.) بەقیمەت، گران: قسەی جوان بەنرخە.

بەنرخ (ئان.) بەمەزەندە، بە بەها، بەقیمەت، نرخدار، مێرخاس، گرانبار، هێژا، گران، بەهادار، گران مایە: شوێنەوارەكانی كوردستان شوێنی بەنرخن.

بەتەنێ (ئان.) بەتەنیا، بەتەنها: بتنێ تەمبەل ل ئەزموونێ دەرناكەڤن.

بەهەشت (ن.) باغاتی خودا لەو دونیا: بەهەشت پاداشتی خودایە.

بەهەشت (ن.) باغاتی خودا لەو دونیادا: بەهەشت لەژێر پێی دایكاندایە.

بەهدینان (ن.) ناوچەیەكە لە كوردستان: ناوێكی كۆنی ئایینی زەردەشتە واتە
( باشترین دین ): ناوچەی بەهدینان دەكەوێتە باشووری كوردستان.

بەهر (ن.) بەش، باهر، بار. بەهرا من ژ بیر نەكە.

بەهرە (ن.) ١- بەخشراوی خوا، نیعمەت، خوا شتێكی بە عەبد بەخشیبێ، دەست ڕەنگینی، سیفەتێكی دەگمەن كە لە مرۆڤدا هەبێت: ئەو زیرەكایەتییەی ئەو بەهرەیە. ٢- كەڵك، سوود، قازانج، داهات: ماندوو بوونەكەت بێ بەهرەیە. ٣- ناوە بۆ مێینە. بەهرە شاعیرێكی دڵناسكە.

بەهرەدار (ئان.) خاوەن بەهرە: ئازاد لە خوێندنگای بەهرەدارانە.

بەهی (ئان.) ١- سیس، سیسبووی، زەربووی، هشكبووی، بەیی ، بەهی ( كاری رابردوویە.): بهارا ئەڤساڵە زوی بەهی.٢- پرسە، تازی، تازیمەنی: رێوڕەسمێن بۆ مری دهێنە كرن. ئەز چوومە بەهیاوی.

بەهێز (ئان.) بە توانا، بە تاقەت، بەكار، بە هەرەكەت، بە دەسەڵات: ئەو لە من بەهێز تر بوو.

بەهێز كردن (چ.) بە توانا كردن، تاقەت پێدان، هێز پێدان: وەرزش لەش بەهێز دەكات. خولی بەهێزكردن ئاستی قوتابیان بەرز دەكات.

بەو ١- بە ئەو: نامەکەم بەو دا نارد.

بەوەستایی (ئاك.) بە زانایی، بە شارەزایی، بەرێکوپێکی: بەوەستایی گەیشتە مەرامی خۆی.

بەیان (ن.) ١- سپێرە، کاتی پێش ڕۆژ هەڵاتن: لەگەڵ بەیان ڤاسپەی کەودێت.٢- شەرح و ڕوون کردنەوە: پرسیارەکەمان بۆ بەیان بکە. ٣- ئاشکرا: ناوی تاوان بارەکە بەیان بکە. ٤- ناوە بۆکچ : بەیان لە پۆلی شەشەم.

بەیانی (ئاك.) ١- سبەینێ، سبە، پاش ئەورۆ: بەیانی هەمووومان پێکەوە دەڕۆین. ٢- کاتی بەیانی: هەمان ڕۆژ بەیانییەکەی زوو بەڕێ دەکەوین.

بەیانی (ئاك.) بەیانی، سبەینێ، سپێدە، سبێ، کێشتان: ئەمڕۆ بەیانی هاتم. تاڤێك لە رۆژ: دانی بەیانی هاتم.

بەیت (ئان.) بەبەرەکەت و فەڕ: زەوی بەپیت بچێنە.

بەیەکدا هاتن (چ.) ١- بەم لاو بەو لادا هاتنی مرۆڤ، شلو خاو بوونەوەی مرۆڤ: هەر کە بەسەرماندا دان شڵەژانو بەیەکدا هاتن. ٢- لەگەڵ یەك بەشەڕ هاتن: بۆ بەیەکدا هاتن؟ ئێوە تا ئێستا عەیبتان نەبوو.

بەیەکداچوون (چ.) چوونە ناو یەك، تێکچڕژان، تێکەڵاوبوون، بەگژیەکداچوون، تێك پەڕین: زانا و دانا بەگژ یەکداچوون.

بجهینان (چ.) بەجێ هێنان، جێ بەجێ کردن، ئەنجامدان. پێدڤیە ئەڤە بهێنە جێهێنان.

بدەستە هینان (چ.) بەدەستەوە هێنان، دەست خستن، بدەستڤە ئینان: ژ من کێش و ژوی کێش، بدەست منڤە هات.

بدەستڤە هاتن (چ.) بەدەستەوە هاتن، دەست کەوتن، سەرکەوتن. ل سەرهەڵدانێ گەلەك تشت بداستڤە هاتن.

بژوین (ئان.) پاکژ، پاك، خاوێن: کراسەکێ بژوین بکە بەرخۆ.

بڕ (ن.) ١- تیرەو تایەفە، بەرە باب: لەکام بڕی؟ (ئان.) ٢- کەمێك، هەندێك، راددەیەك: بڕێك پارەم بدەرێ. — کردن (چ.) ١-

کـەرتکردن، دابڕانــدن، لەیەکپچــڕاندن: گــورگ چــەند ســەر مەڕێکی بــڕ کــردووم. ٢-هێــزو توانــا لــە بیــنینو کــارکردن: تــا چاوت بڕ دەکا لە ئاسۆ بڕوانە.

بڕان (چ.) ١- تەواو بوون، نەمان و پەك کەوتن: ئاویان لێ بڕا.٢- بەدەست کەوتن: چیم پێ نەبڕا. برینی قژی کچەکە ناسکە.
٣- زامداربوون، بڕین: پەنجەی بڕا.

بڕانەوە (چ.) ١- کۆتاییهاتن، نەمان: بە بڕانەوەی کێشەکە کەوتینــە خۆشــی. ٢- لــەتکردنی داروبــار: بــۆ ڕاگرتنــی جــوانی سروشــت دەبــێ دارستان لە بڕانەوە بپارێزین. ٣- قڕ بوون، لەناو چوون: بـە دەرمانە نوێیەکە هەموو مێشوولەکان بڕانەوە.

بڕنۆ (ن.) ناڤێ تفەنگەکێ یە یا درێژە، فیشەکان ئێـك ئێکـە دهاڤێـژیت. درویشمێ پێشـمەرگەی بـوو: دلێـری بڕنـۆ ب ملـی خـۆ ڤـەکر. بڕنۆ ڕەقەم حەڤدەیە نیشانەی پێشمەرگەیە.

بڕوا (ن.و.) بــاوەر، متمانــە، ئیمــان: بــڕوا بــوون بــە خــود کەســایەتێکی بەهێزمان بۆ دروست دەکات.

بڕیار (ن.) ١- قەرار: خێرا بڕیار مەدە. ٢- بڕینی جل وبەرگ: بڕیارەکانی جوانن.

بڕیار (ن.) فرمان، قەرار، شەرت، پەیمان: بڕیارم دا بە چاکی بخوێنم.

بڕین (ئان.) زام، لە ئەنجامی چەقۆ یـان زەبرێـك پەیـدا دەبـێ: برینەکـەی پیس بووە.

بڕین (چ.) ١- کــەرتکردن، پســاندن، پارچــە کــردن: تــەواوی دارەکانتــان بــڕین؟ ٢- ڕۆیشــتن، تــەیکردن: ماوەیــەکی باشمــان بڕیــوە، هێندەمان نەماوە. ٣- دزین: ئەمشەو ماڵەکەمیان بڕییوە.

برۆ (ن.) ئەوەی لەسەر چاوە، ئەبرۆ: برۆی وێنەی مانگە.

برا (ن.) نێرینەی هاو دایكو باوك: دوو برای لەخۆ گەورەترم هەن.

برازا (ن.) بــرازێ، کــوڕێ یــان کچـا بــرای: برازایــێ مــن ل خوێنــدنێ یــێ زیرەکە.

برەو (ن.) ڕەواج، شتێك کە خواستی لەسەر بێ: ئەم تەرزەیان بـەرە زۆر

به بره‌وه.

بردن (چ.) برن،به‌رانبـــه‌ری هێنـــان: فه‌رهه‌نگه‌کـــه‌م بـــرد. _ ه‌وه(چ.) گه‌ڕاندنه‌وه: وێنه‌که‌م بۆ برده‌وه. ٢- دژی دۆراندن: گره‌وه‌که‌ی برده‌وه.

برسی (ئان.) ١- برچی، نێز، دژی تێر، ورگ به‌تاڵ: به‌یانی نانم نه‌خواردووه بۆیه زۆر برسیم. ٢- ره‌زیل، مردیی، چه‌نه‌دیو ماڵ نـه‌خۆر: پیاوێکی تابڵێی برسییه.

برسی: ئه‌و مرۆڤه‌یه که پێویستی به‌خواردنه: زکێ تێـر ئاگه‌هـ ژیێ برسی نینه.(په‌نده)، زگی برسی له هیچ ناپرسی. (په‌ند)

برسێتی (ن.م.) برچـی، زاد نـه‌خواردوو، سـك بـه‌تاڵ: برسـێتی ره‌گێکـی لـه هارییه.

برن (چ.) بردن، دویرئێخستن: مخابن باپیرێن مه گه‌له‌ك په‌ند دگه‌ل مرنا خۆدا برن.

بریتی (ن.) ١- بـه‌واتای ده‌کاتـه: حـه‌وت بریتییـه لـه سـێ کـۆ چـوار. ٢- له‌جیاتی: ئه‌و له‌بریتی باوکی هاتووه.

بریقه (ن.) تریسکه، بریسکه: قوماشه‌که بریقه‌ی هه‌یه.

برین (ن.) زام: پێشمه‌رگه‌که برینه‌که‌ی چاك بووه‌وه.

برین (ن.) زام: جهێ برینێ دڤێت پیس نه‌بیت و ته‌ڕژی نه‌بیت.

بزاڤ (ن.و.) خه‌بات، تێکۆشان. بزافا کوردان دێ هه‌ر ب به‌رده‌وام بت.

بزڤین (چ.) لڤین، لڤلڤین، جووڵانه‌وه: زارۆك ژ جهێ خۆ بزڤی.

بزمار (ن.) مێخ، ته‌له ئاسنی سه‌ر تیژ: نازانم ئه‌وه‌نـده بزمـاره چییه لـه خانووه‌که‌یان داوه.

بزن (ن.) ئاژه‌ڵێکی شیرده‌ره، دایکی گیسك‌و کار: چوار پێنج سه‌ر بزنـی له ماڵه‌وه ڕاگرتوون.

بزواندن (چ.) جووڵاندن: بزواندنی هه‌ستی لاوان به‌رده‌وامه.

بزوتنه‌وه (چ.) جووڵانه‌وه: بزووتنه‌وه‌ی رزگاریی خوازی کۆنه.

بزووتنه‌وه (ن.) جووڵانه‌وه، بـزاڤتن: بزووتنـه‌وه‌ی کـورد لـه مێـژه ده‌سـتی پـێ کردووه.

بست (ن.) پێوانەی دەست: بستێك زەویم لەم ولاتە نىيە.

بست (ن.) پێوانـەی دەسـتە لـە سـەری تووتـە تاسـەری قامگـە گـەورە بەبلاوی: زمانی یەك بست درێژە.

بسەرڤەچوون (چ.) بەسەرچـوون، بەسـەرتێپەڕبوون. نوكـە گەلـەك تشـت بسـەر ڤەچوون.

بچووك (ئان.) گچكە: مندالی بچووك خۆشەویستە.

بچویك (ن.) بچووك، زارۆك، منـدالٚ، كۆرپـە، گچكە وورد، هـویر: بچـویكان گەلەك ماف لسەر دایكوبابان هەنە.

بكوژ (ن.ب.) كوژەك. ئەو بكوژێكی هوڤانی بوو.

بلا (ئام.) با: هەرە رێكێ بـلا یـا دویـر بیـت، بـدە بـۆڕی بـلا یـێ كویربیـت، كچێ بینە بلا یا پیر بیت. (پەندە)

بلاٚو (ن.) ١- بەلاڤ، پرژ: پەخشنامەی شۆڕشگێڕان بلاٚو بووەوە.٢- گوشاد، فرە: بێ ژنگی كون بلاٚوم ناوێ.٣- پێ زانراو: خەبەر وا بلاٚوە.

بلاٚوبوونەوە (چ.) پـەرش بـوون، پـەرت بـوون، دەنـگ دانـەوە: بلاٚوبوونـەوەی زانست بە سوودە.

بلاٚوكردن (چ.) ١- بلاٚڤ كردن، پرژاندن، پەخش كردن: هەوالەكەی بلاٚوكردەوە.

بلٚتە بلٚت (ئان.) بۆلە بـۆلٚ، پرتـە و بۆلـە: لەبـەرخۆی بلٚتـە بلٚتـی بـوو. (ئـاك.) قسەكانی بە بلٚتە بلٚت وەلاٚم دایەوە.

بلەز (ئاك.) خێـرا، بەپەلـە، زوی، زوو، بلەزوبـەز: مـن بویكـەك ئینـا بلەرزوبەز، سڤكا مالێ هەر بوومە ئەز.( پەندە)

بلٚح (ئان.) بێ كەلك، خراپ، ناشیرین، نا بەجێ: شتی بلٚح سوودی نییە.

بلٚند (ئان.) بەرز: سەرێ مرۆڤێ خۆ نەفرۆش هەرێ بەرزە.

(ئاك.) ئالاٚكەی بلٚند ڕاگرت.

بلندكرن (چ.) بلٚنـدكردن، بـەرزكردن، دژی نـزم كردنـە. دەنگـی خـۆت بلٚنـد نەكە.

بلٚێسە (ن.) ١- بەگڕی ئـاگر: بلٚێسـەی ئاگرەكـە زۆر بـەرز ببـووەوە.٢- نـاوە بۆكچ: بلٚێسە كچێكی زیرەكە.

بلٚێسە (ن.) ١- گـڕی ئـاگر كـە بـەرز دەبێتـەوە، گـڕ، كلٚپـە، بلٚێـز: لـەیادی

جەژنی نەورۆزدا بڵێسەی ئاگری لە هەموو شوێنێك بەرز دەبێتەوە.٢- ناوە بۆ هەردوو توخم.

بلیمەت (ئان.) ١- هەڵكەوتە، پیاوی كەم وێنە: كورد بلیمەتی وەكو پیرەمێردی كەمە.٢- ناوی كوڕانە: بلیمەت خوێندكارێكی بەتوانایە.

بلیمەت (ئان.) پبنۆل، زیرەك: زانا لە خوێندن بلیمەتە. (ئاك.): منداڵەكە وەكو بلیمەت قسەی وەڵامی دایەوە.

بلیمەت (ئان.) زۆر زیرەك، زیرەكی ی رادەبەدەر: خەییام زانایەكی بلیمەت بوو.

بن (ئاك.) ١- خوارەوە، ژێرەوە: لە بن كەپرەكە دانیشتم.٢- نەمام، دار: چوار بنە نەمامم چاند.٣- ببن: ئێوە وەكو باوكتان بن.٤- دوای كۆتایی: سەروبنی ئەو كارە كێ دەیزانی.

بن (ئاك.) ژێر، پێچەوانەی (سەر)ە، بنی مەنجەڵەكە رەش بووە، ل بن: لەژێر، كانیە ئاوەكە لە بن بەردەكە دەزێ.

بن باڵ (ئاك.) بن پیل، بن شان: هەژارەكان بگرنە بن باڵی خۆتان. خۆت بشۆ بن باڵت بۆنێكی ناخۆشی لێدێت.

بناڤودەنگ (ئان.) بەناوبانگ، دیار، بەرچاڤ: مەلایێ جزیریو خانی دوو هۆزانڤانێن بناڤودەنگن.

بناوان (ن.) ١- ئەو شوێنەی كە سەرەتای ئاوی لێ دێتەدەر، كانی، سەرچاوە: ئاوی بناوان دەدرێتە كشتوكاڵ. ٢- ئافرەتێكە ئیش وكاری ناو ماڵ راپەرێنێ، مشوورگێر: خۆشكی بناوانی ماڵەوەیە.

بنبڕ (ئان.) كۆتاییهاتوو، یەكجارەكی، تەواو: بەدوای چارەسەرێكی بنبڕ دەگەڕێین.

بنبڕ كردن (چ.) كۆتایی پێهێنان، لە ڕیشەوە دەرهێنان: هەموومان بۆ بنبڕكردنی تیرۆر كار دەكەین.

بنە (ن.) ١- بنكە، بارەگا. ٢- پێداویستی سەفەر، كەلوپەل: بنەو بارگەتان تێك نێن با بڕۆین. ٣- گای ناوەند لە گێرەكردندا:

خۆ گای بنە نی بۆ ناجووڵێی؟! ٤- ئەو شوێنەی ڕاوچی خۆی تێدا حەشار داوە: ڕاوچییەکە بنەکەی تێکچوو بوو بۆیە شڵەژا بوو. ٥- هەوار، ماڵی کاتی بۆ وەرزی: بنەی روغزایی جافان لە گامە خەلە.

بنەڕەت (ن.) بناغە، بنچینە: خوێندنی بنەڕەتی گۆڕانێك لە بەرنامەی خوێندن دەکات.

بنەڕەت دانان (ن.ل.) بناغەدانان، بنەچەك، ڕەگو ڕیشەی دار: کۆششەکەی ئەوان بنەڕەت دانانە بۆ ئایندە.

بنەماڵە (ن.ل.) خانەوادە، خانەدان، گەورەماڵ: بەدرخانیەکان بنەماڵەیەکی ناودارن.

بنج (ن.) بنەرەت، ریشە: چوویتە بنجی بابەتەکەوە. ٢- گژو گیاکە بڵند نەبن: گیاو گۆڵ بنجی کردووە.

بنج (ن.) ڕەگ، ڕیشە، بنچینە، بن: کارەکەمان لە بنج و بنەوانەوە دروستە.

بنچینە (ن.) بنەما، بناغە، بنەڕەت: بنچینەی کێشەکە ئەو هەر خۆی بوو.

بنکە (ن.) بنە، جێ، مەکۆ، بارەگا: بنکەکانمان بۆ ماوەیەك لە قەندیل بوون.

بنیات (ن.) ١- بنیاد، بناغە، بنەڕەت: گیانی یەکتر قبوولکردن بنیاتی کۆمەڵگا بەهێز دەکا. ٢- ناوە بۆ نێرینە.

بنیاتنان (چ.) دامەزراندن، پێکهێنان، هەڵچنین، بناغەی داڕشتن، دروستکردن: بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی دروستو شایستە پێویستە دیموکراسی سەروەر بێ.

بها (ن.) بەها، بوها، نرخ: بهایێ تشتی بزانە پاشی بکڕە.

بهار (ن.) بەهار، وەرزەکە ژ چار وەرزێن ساڵێ، بدویڤدا هاڤین و پاییز و زڤستان دهێن، سەرێ (بهارێ خەلك دچیتە دەرڤەی باژێڕو گوندان بۆ سەیرانێ).

بهەڤڕا (ئاك.) پێکڤە، پێکەوە، بەیەکەوە، دگەلێك، لەگەڵ یەکدا: کوردان

بهەڤرا ئازادی و دیموکراسیەت خوازتیە.

بۆ (ئام.) ١- بـۆ پرسـیارکردن، بۆچـی؟ : بـۆ ناخوێنیـت؟ ٢- تـەرخان کردنی شتێك بـۆ یـەکێك: ئەسـپەکە بـۆ تـۆ بێت. ٣- هۆیـەتی دەگەیەنێ: بۆ خوێندن هاتووم.

بۆ (ئام.) لەبەرچی، لۆ: بۆ بە گوێی مامۆستاکەتان ناکەن؟

بۆری ( ئاك.) رابردوو، بەسەرچوو، ڕۆیشتوو. ئەشقار مە بوری

بۆسە (ن.) سیپە، رەبەت، کەمین، حەشارگە: ئاگامان لێ نەبوو تـا لـەناکاو کەوتینە ناو بۆسەکەیان.

بۆیە (ئام.) ١- لە بەر ئەوە، ژبەر هەندێ: بانگت کردم بۆیە هـاتم. ٢- (ن.) رەنگ: بۆیەی ئاوی لە کاری وێنەکێشان بەکاردەهێنم. وێنەکـەی بۆیـە کـرد، سـبوغ: پێلاوەکـەم بۆیـە دەکـەم ئـەوجا دێم.

بۆیە (ن.) ١- بۆیاخ، ڕەنگ: پێویستە ڕۆژانە لە بۆیەی پێلاوەکانت ئاگادار بی. (ئام.) ٢- لەبەر ئـەوە، چـونکە: تـۆ نـەهاتی بۆیـە منـیش نەچووم.

بوختان (ئان.) هەڵبەستە، تۆمەت: بوختان لە کوشتن خراپترە.

بورج (ن.) ١- ژوورێکی خڕ یان چوارگۆشە کە لەسـەر قـەڵاو دیـواری شـار بۆ چاودێری بەرگری دروست کراوە. ٢- قەڵا. ٣- هـەر کـام لـە دوازدە بەشـی فەلـەکی. ٤- قولـە: لەسوچـەکەوە چـاودێری ئێمەیان دەکرد.

بورین (چ.) رابوردن، دەربازبوون، چوون، رۆیشتن. ئـەوان بـەر دەریـا مـە بورین.

بولبول (ن.) تەیرێکی بچوکی دەنگخۆش: بەیانیان دەنگی بولبول خۆشە.

بومب (ن.) گوللەی گەورەی وێرانکەر: مرۆڤ دژی درووست کردنی بۆمبە.

بووژاندنەوە (ك.) نـوێ کردنـەوە، دروسـت کردنـەوە، ئـاوەدان کردنـەوە: بووژاندنەوەی کانیاوەکان ئەرکێکی نیشتمانییە.

بووك (ن.) ١- کـچ کـە دەگوازرێتـەوە: چـرپە بـووکێکی جوانـە.٢- بـووکی منـدالآن، بووکـە شووشـە: بووکەکـەی چـرا جوانـە.٣-

پیاوەدارینە: بووکە بەبارانە .. ئاوی بن دەغلانە.

بوون (چ.) بەرچاو زیندوو، ئامادە بوون: بوونی تۆ لە ئاهەنگەکە پێویست بوو.

بوون (چ.) لە ژیان، گەردوون، هەبوون: بوونی تیرۆریش کار ناکاتە سەر پێشچوونمان.

بێ (ن.) ١- ناوی دووەم پیتی ئەلف بێی کوردییە. ٢- جۆرە میوەی دارێکە، بەی، بەهی: لە دووری نازەنینم ڕەنگ زەردم وەکو بەی. (کار): ٣- کاری داخوازییە بەمانای وەرە: با بێ ئەو کات دەزانێ. (ئام.) ٤- نەرێیە: بێ تۆ ناژیم.

بی (ن.) جۆرێکە لە دار: داری بی لە باغەکەمان زۆرە.

بی (ن.) دارە بی شۆرە: لقی داربی شۆرە.

بێ باك (ئان.) ١- کەم تەرخەم: زانا پیاوێکی بێ باکە لە کارکردن. ٢- مەرد: ئازاد لەشەڕ بێ باکە. ٣- بێ منەت: بێ باکم لەوەی بەسەرم دێت.

بێ بەریکردن (چ.) بێ بەش کردن: ژنەکەی لە میرات بێ بەری کرد.

بێ بەش (ئان.) ١- بێ پار، بێ حیسە:هەر من لە قازانجەکەی بێ بەش مامەوە. (ن.) ناوە بۆ نێرینە: مەلا مەسعودی شاعیر نازناوی بێ بەشی بۆ خۆ هەڵبژارد بوو.

بێ پەروا (ئاك.) بێ دوودڵی، بەباوەڕەوە: من بێ پەروا تێکۆشاوم بۆ گەلەکەم.

بێ دەرامەت (ن.د.) بێ داهات، بێ دەستکەوت: خێزانی بێ دەرامەت لەم شارە زۆرە.

بێ دەنگ (ئاك.) بێ خوست، بێ چرپە، بێ هەست، کپ: پەروانە بێدەنگ دەسووتێ.

دەنگ (ن.) هەرچییەك گوێ دەبیستێ. دەنگی دەهۆڵ لە دوورەوە خۆشە.

بێ دەنگ (ئان.) کڕ، مت: مافێ مرۆڤێ بێ دەنگ هەرێ خوارێیە.

بێ دەنگی (ن.و.) خامۆشی، کپی، کڕی، بێهەستو خوستی: بێ دەنگی جوانی مرۆڤە.

بێ دەنگ کردن : بێ دەنگم کرد، هەموو شتێکم پێ بڕیەوە.

بێ سنوور (ئان.) ١- بێ مەرز، بێ کیانو قەوارە: وڵات بێ سنوور نابێ. ٢- لە رادە بەدەر، زێدەڕۆیی: بێ سنووری لە هەموو ڕەفتارێکدا خراپە.

بێ گومان (ئاك.) بێ شك: بێ گومان هەر دێتەوە بۆ لامان.

بێ گومان (ئاوەڵکار) بەبێ‌شك، بێ دوودڵی: بێ گومانم لە سەرکەوتنی هاوڕێکەم.

بێ فەڕ (ئان.) بێ سوود، بێ کەڵك: مرۆڤی بێ فەڕ وەك داری بێ بەر وایە.

بێ نەوایان (ن.ك.) هەژاری گەدا، بێ سەرپەرشت، بێ کەس، بەلەنگاز: بێژەن پاڵەوانی ڕۆمانی بێ نەوایانە. هەر خودا کەسی بێ نەوایانە.

بێ هۆش (ئان.) ١- بێ فکر، بێ عەقڵ، بێ بیر: پیاوێکی زۆر بێ هۆشی. ٢- ئاگا لە هیچ نەبوو، ئاگا لەخۆ براو: تا بێ هۆشە زووکە با بڕۆین. ٣- دڵ بوراوە، لە خۆ چوو: بێ هۆش کەوتبوو ئاگای لە ئێمە نەبوو. ٤- وڕو گێژ، توخوا لێم گەڕێ بێ هۆشم، ئاگام لەخۆم نییە.

بێ هاوتا (ئاك.) بێ وێنە، بێ نموونە: سۆران بێ هاوتایە لە زیرەکی.
(ئان.): خوێندکارێکی بێ هاوتایە.

بێ هێز (ئان.) لاواز، بێ توانا، بێ جەرگ: ئاردێکی بێ هێزە نابێتە نان.

بێ وچان ( ئان ) بێ پشوو، بێ وەستان، بێ پچڕان، بێ‌حەسانەوە، بەردەوام: ئەم پرۆژەیە تا وەسەرپێ دەخرێ هەوڵی بێ ووچانی دەوێت.

بیاڤ (ن.) بوار، مەیان، ماوە.رۆڵ دی د بیاڤی ئۆلداری یا دیارە.

بیر (ن.) ١- هزر، فکر: ئەوەی تۆ ئێژی لە بیری کەس جێی نابێتەوە. ٢- چاڵاو: بەهاران تا درەنگ بیرەکەمان وشك نابێ. ٣- یاد، یادەوەری، یاداشت: بیرتە کە پێکەوە رۆیشتین.

بیر چوونەوە (چ.) وە بیر نەمان، لەیاد چوونەوە: بیرچوونەوەی یادگاری منداڵی زەحمەتە.

بیرەوەری (ن.ل.) ماوەیەکی بەسەر چووە کە مرۆڤ تێدا شتی لە بیر مابێ، یادگاری، یادەوەری: بیرەوەرییە تاڵو خۆشەکان لە بیر ناکرێن.

بیرکردنەوە (چ.) تێ ڕامان، لێ وردبوونەوە، تێ فکرین، قووڵ بوونەوە: من

بیرکردنەوەم تەندروستە.

بیرکردنەوە (چ.) هزکردن، لێ وردبوونەوە: بیرکردنەوەی چاك بەرهەمی چاك دەبێ.

بیرهاتن (چ.) بیرهاتنەوە، هاتنەوەبیر: بیرهاتن هەنە دخۆش و هەنە نەد خۆشن.

بیروباوەڕ (ن.) بیرو بۆچوون، بڕواو عەقیدە: بیروباوەڕمان بەخۆمان و سەرکردایەتی خۆمان زۆر بەهێزە.

بیستن (چ.) گوێ لێ بوون، شنەفتن، ژنەوتن: بیستنی هەواڵی خۆش دڵ و دەروون ئاسوودە دەکات. بیستن وەك دیتن نییە.

بیچم (ن.) روخسار، شێوە، شکل، دەم و چاو: بەخوا بیچمێکی ناشرینی هەیە

بێچوو (ن.) ١- ساوا، بچووك، فەرخە: هەموو گیانلەبەرێك پارێزگاری لە بێچووەکانی دەکات. ٢- جۆرە پارەیەکی بچکۆڵەی زیوینە: جاران بێچوو شتی پێ دەکردرا.

بێگانە (ئان.) بیانی، غەوارە، نەناس، غەریبە: بە یەکێ دەوترێ خزم نەبێ یان خەڵکی ئەو شوێنە نەبێ: سەد ساڵ بکەی بێگانە پەرستی هەر ئەهێنی نوشستی.

بێگانە پەرست (ئان.) کەسێك بێگانەی پێ لەخزم و کەس و کارو ئاشنا باشتربێت: بێگانە پەرستن تاوانێکی گەورەی نەتەوەییە.

بێگانەبوون: بێگانە خۆش ویستن: سەد ساڵ بکەی بێگانە پەرستی، هەر دەهێنی نوشستی.

بێگومان (ئان.) بێخش، بێشك، بێ دوودڵی. بێگومان ئەرباز دەبێ.

بێگیان (ئان.) مری، مردوو، دژی زیندوو، هشك، وشك. شتی بێگیان بزەی نییە.

بێهن (ن.) ١- بۆن، بۆ: بێهنا گولا نێرگزێ گەلەکا خۆشە. ٢- هەناسە: بێهنا مرۆڤێ ئاریشە هەی یا کورتە. ئەو کەسەی هەناسەی کورت بێت زوو هەڵدەچێت.

بانگەواز (ن.د.) فریاد: بانگەوازی شۆڕشی نوێ هەموو خەڵکی ڕاچڵەکاند. داواکردنی خەڵك بۆ ئایینی نوێ، بانگەوازی ئیسلامی هەموو ئەوروپای گرتۆتەوە.

# پ

پاتە (ن.) کۆتاڵ، پارچە پەڕۆ: پاتەی دمێزێ بدە دا پاقژ ببیت.

پاتەکرن (چ.) پینـــەکرن، پنیکـــرن، پاتـــەکری ( نـــاڤێ بەرکارییـــە): هـــەژاری شەلوالەکێ پاتەکری د بەر بوو.

پاپۆڕ (ن.) کەشـتی، گـەمی: ژێـر ئـاو کـەوتنی پـاپۆڕە میسـرییەکە زیـانی زۆری هەبوو. — ەوان: کەشتییەوان: پاپۆڕەوانەکان لێهاتوون.

پاپۆرەوان (ن.د.) کەشتی لێخوڕ، شوفێری پاپۆر: پاپۆرەوانەکە ماندوو بوو.

پادشاە (ن.ل.) هـەر میرێـك خـاوەنی تـەختو تـاج بـێ، سـوڵتان، دەسـەڵاتدار: پادشای گەورە حوکمڕانی میرنشینی سۆرانی دەکرد.

پار (ئان.) ساڵا بۆری، ساڵی ڕابردوو: ساڵ بەساڵ خۆزگەم بە پار.(پەندە)

پاراستن (چ.) ئاگـاداریکردن، حەواندنـــەوە، ڕاگـــرتن، پـــارازتن، چـاولێبوون: پاراستنی کتێب لە ئەمەکدارییەوەیە.

پاراو (ئان.) پاك وبێ گەرد: زمانی پاراوە لە قسەکردن .

پاراو (ئان.) پاك، بێگەرد، روون، ساف: زمانی کوردی زمانێکی پاراوە.

پارە (ن.) ١- پووڵ، دراو، دراڤ، پەرە: پێویسـتە پـارەی دیـتراوە بدرێـتەوە خاوەنەکـەی. ٢- شـڕودڕاو. ٣- لـەت، بـەش، پارچـە: لـە خـەما جەرگی پارە پارە بووە.

پارە پارە: پارچە پارچە، هەلا هەلا: جەرگی پارە پارە کردین.

پارەدار: مرۆڤی پارەدار پێویستە دەستکراوە بێت.

پارچە (ن.) کەرت، بەش، لەت، کوت: پارچە زەوییەکەم فرۆشت. — پارچە: کـەرت، لـەت لـەت، بـەش بـەش، کـوت کـوت، پچـڕ پچـڕ، ونجـڕ ونجڕ، لەتو پـەت: قوماشـەکەی پارچـە پارچـە کـرد. — کـردن (چ.) کەرت کردن، لەت کردن، بەش بەش کردن: پارچە کردنی

کوردســتان کاریگــەری زۆری هــەبوو. — بــوون (چ.): لــە دژی پارچــە بــوون تێدەکۆشــین. — فــرۆش: شــتەکانم بــە پارچــە فرۆشەکە فرۆشت.

پاری (ن.) پارۆ، پارچەیەکا بچویکا خوارنێ: پاریێ خۆ بـاش بجوی پاشـی داعیرە.

پارێزەر (ن.) داکوکیکـار، ئاوقـات، محـامی: بـاوکم پـارێزەرە. ئـەو بەڕاسـتی پارێزەرە.

پارێزگا (ن.) شـار، ولایـەت، لیـوا: پارێزگـای هـەولێر پایتـەختی هـەرێمی کوردستانە.

پارێزگاری (ن.د.) پاراستن، چاو لێبوون، پاسـەوانی کـردن: پارێزگـاری لـە خـاکی خۆمان ئەکەین.

پارێزگە (ن.د.) ١- حەشـارگەی ڕاوچـی: ڕاوچـییەکە لەپارێزگەدایـە بـۆ ڕاوی کەوەکە.٢- مەڵبەندێکی گـەورەی دەوڵـەت: پارێزگـەی کـەرکوك دەگەڕێتەوە سەر کوردستان.

پاش (ئاك.) ١- پێچەوانەی پێش، ئەو دیـو، جار: ئـەو لـەپاش مـن دێـت. ٢- دوای، پشــتی: پــاش چــەند خولــەکێکی دی یارییەکــە دەســت پێدەکا.

پاشا (ن.) ١- گەورەی وڵات، سەرۆك، میر، شـا، مـەلیك، حوکمـدار: شۆڕشـی فەرەنسـا بەســەر پاشـا لویسـی شـازدەهەم کـرا. ٢- نازنـاوێکی تورکییە بۆ پیاوە گەورەکانیان. ٣- ناوە بۆ نێرینە.

پاشا (ن.) پادشـا، شـا: پاشـای داد پـەروەر خۆشەویسـتە. — گـەردان: بـێ ئومێـدی: ئـەو تووشـی پاشـا گـەردانی هـاتووە. — م: پارشـێو: پاشم خواردن لە مانگی رەمەزاندایە.

پاشان (ئاك.) دوای ئەوە، پاش ئەوە، ئینجا. نانیا خوارد پاشان نووستن.

پاشەڕۆژ (ئاك.) ئاییـنـدە، دواڕۆژ، کـاتێکی دوور: دەبـێ پاشـەڕۆژی گەلەکـەمان مسۆگەر بکەین.

پاشەوان (ن.) ئەو دەفرەیە کە دەدرێت لە دواوەی دەفـری شـانەو دواوەی پـێ دادەخرێت.: پاشەوانەکە بە جوانی لێدراوە.

پاشگەزبوونەوە (ئان.ل.) ( پاش + گەز + بوونـەوە )، پەشـیمانی لـە کـارو کردەوەیـەك، پەرگەشت: پیاو نابێ لە قسەی خۆی پاشگەز بێتەوە.

پاشماوە (ن.ل.) ١- ئـەوەی لەبـەر شـتێك مابێتـەوە، بـەرماوە، بـاقی: پاشمـاوەی خـواردن فـڕێ مەدەنـە سـەر شۆسـتە. ٢- زینـدووی کـەس‌وکار مردوو: پاشماوەی مام هۆمەر دوو کوڕی ژیکەڵەنە.

پاشی (ئاك.) پاشـان، دوایـی، ئـەوجا، بدویڤـدا، پشـتی هینگـێ: دڤێـت مـرۆڤ ئەرکێن خۆ بجهبینیت پاشی داخازا مافێن خۆ بکەت.

پاقژ (ئان.) پاکژ، پاك، خاوێن، بژوین: خوارنا پاقژ بخۆو ئاڤا پاقـژ ڤـەخۆ، تۆ نەساخ نابی.

پاقڵاوە (ن.) شـیرینەمەنی، دروسـتکراوێکی شـیرین و خۆشـە: پـاقلاوە زۆر مەخۆ.

پاك (ئاك.) ١- خاوێن، پاکژ، پاقژ، تەمیز: پـاكو خـاوێنی دەروون ئاسـوودە دەکـات.٢- بـاش، پەسـند، چـاك: کچـی داوێـن پـاك لەکوردسـتان زۆرە.٣- هەموو، تەواو: پاککردنەوەی کوردستان لـە داگیرکـەران ئەرکێکی نەتەوەیی بوو.

پاڵ (ئاك.) ١- پشـت: لـەپاڵ ئـەوەوە نووسـتووە.٢- تەنیشـت: لـەناو پاسـەکە لـەپاڵ یـەك دانیشـتوون.٣- لـەخۆوە، لـەناوەوە: لـەپاڵ خۆیـدا تووڕەیە.٤- پاڵپشتی، پەیوەندی: بۆبەرگریکردن لـە کوردسـتان بە هەزاران کەس چوونە پاڵ پێشمەرگەکان.٥- ملەی کێـو: لـەو پاڵە سەری دەرهێنا. ٦- بنارو قەدی کێو: لەپاڵ چـیای قەنـدیل بارەگایـان دامەزرانـدووە.٧- جێگـەی پشـت پێـوەدان: پاڵپشـتی لێدان درابوو. ٨- زمـان بـەگرێو گـۆل ( لاڵو پـاڵ ): منداڵەکـە زمانی لاڵو پاڵە. ٩- پاڵ پێوەنـانی بـەهێز: بـەبێ پـاڵ نـابزوێ. ١٠- زبڵ، پەینو پاڵ: پەینو پاڵ زەوی بەهێز دەکات.

پاڵە (ن.) ١- درووێنـــەوان، درووێنەکـــەر: پاڵەیـــەکی بـــەکارە بـــوو لـــە درووێنەکـەدا. ٢- کرێکـار، ڕەنجـدەر: کـەس خـۆی لەبـەر هێـزی یەکگرتووی کرێکارو پاڵەو ڕەنجدەران پـێ نـاگیرێ. ٣- سـەپان، ئـــەوەی لەســـەر زەوی یـــەکێکی دی کـــار دەکـــا. ٤- دەربـــارو

دیوەخانی گەورە پیاو و ناوداران. ٥- ناوە بۆ مرۆڤ.

پاڵتۆ (ن.) ساقۆ، قاپووت: پاڵتۆکەم فرۆشت.

پاڵەپەستۆ (ن.ل.) فشار، تەنگەتاو کردن: پاڵەپەستۆی هەوا بەرزە.

پاڵەوان (ئان.) پیاوی ئازا، قارەمان، بەجەرگ، خۆڕاگر، دوژمن شکێن: فەرهاد لەپێناو شیریندا بوو بە پاڵەوان.

پاڵپشت (ن.ل.) پشتو پەنا، لایەنگیر، پشتیوان: ئاسۆ پالپشتی ئێمە بوو.

پالدان (چ.) پاڵدان، جوڵانەوەی شت بەرەو پێشەوە، پاڵدا ( کاری رابردوویە): پیاوەکان ئۆتۆمبیلەکەیان پاڵدا تا ئیشی کرد.

پاڵدانەوە (چ.) درێژبوون، ڕاکشان، رازان: لەسەر پشت پاڵدانەوە باشە.

پالڤەدان (چ.) پاڵدانەوە، درێژبوونەوەی سەر تەنیشت: رێنجبەر هندی وەستیابوو، پاڵڤەدا سەر تەنیشتێ.

پان (ئان.) درێژە: پانی ژوورەکە چوار مەترە.

پایە (ن.) ١- پلە، دەسەلاّت: وەرگرتنی پایە مانای خزمەتکردنی گەلە.

پایە دار(ئان.): سمکۆی شکاك سەرکردەیەکی پایەدار بوو.٢- پێچکە، دارێك کە شتێ هەلگرێت.

پایەبەرز(ئان.): کابرا پایە بەرزە.

پایتەخت (ن.ل.) شاری سیاس: هەولێر پایتەختی حکومەتی هەرێمی کوردستانە.

پایز (ن.) وەرزێکی ساڵە لە دوای هاوینە: پایز کاتی گەڵا رێزانە.

پایسکل (ن.) دوو چەرخە، ئەسپە ئاسنینە: قوتابیان بە سواری پایسکل دەچن بۆ قوتابخانە.

پاییز (ن.) وەرزێکی ساڵە دوای هاوین لە ٩\٢١ تا ١٢\٢١ سەرەتای سەرما: پاییز، وەرزی گەلاّ وەرینە.

پەت (ن.) ١- گوریس، کندر، پەتك: بۆ بەرگریکردن لە نەتەوەکەی ئامادە بوو بچێتە ژێر پەتی سێدارەش. ٢- پارچە چارچە: لەتو پەتی ئێمە هەر دوژمن کەیف خۆش دەکا.

پتەو (ئان.) قایم، ئەستوور، سفت، پندر، بە تین، بە هێز: مرۆڤێکی پتەو و بەهێزو بە خووەیە. مەترسن پردەکە زۆر پتەوە بەئاسانی

ناکەویّ.

پەپکە (ن.) ١- جۆری کولێرە نان : هەویرەکەی کردە پەپکە.٢- خۆیانی فەرمان:فەرمانەکەیان پەپکەکرد. ٣- پاپۆکە: مارەکە پەپکەی دابوو.

پەپکە شان (ن.ل.) دروستکردنی شانەی هەنگ یەك لە دوای یەك پڕ بە پڕی دەفرەکە.

پەخشان (ن.) ١- پەخش، بڵاو بوونەوە: نابێت پارە پەخشانو تەخشان بکەین. ٢- ژانرێکی ئەدەبییە: پەخشانێکی بەهێزم خوێندەوە. ٢- ناوە بۆ مێینە.

پەژارە (ئان.) ١- دڵ بەغەم، غەمبار، کەسەر: بەبۆنەی تۆ پەژارە دایگرتووم. ٢- تاسە، ئارەزووی دیدار. ٣- نیگەران.

پەژیك (ن.) دەرد، پەتا، نەساخی، نەخۆشی.

پتر (ئاك.) زۆرتر، زێدەتر، زیادتر: پتر هزرا خۆ دئاخفتنێدا بکە بەری ببێژی.

پتر (ئان.) زۆر: ئەم کارە هەوڵی پتری دەوێت.

پەڕ (ن.) ١- باڵی باڵندە، لا باڵ: کۆترەکە پەڕی شکابوو، بۆیە نەیتوانی بفڕێ. ٢- داوە مووی درێژو تیژی سیخوڕو ژووژك. ٣- وەرەقە، کاغەز: پێویستە هەر پرسیارەو لەپەڕێکدا وەڵام بدرێتەوە. ـ بوون(چ.) دوور کەوتنەوە: ئاگادار بن، لە ڕێگا پەڕ نەبن.

پەڕ (ن.) ١- تووکی باڵی مەل: پەڕی هەڵۆکە هەڵوەری. ٢- قاقەز، وەرەقە: لەپەڕی کتێبەکە مەنووسە.

پەڕ (ن.) گەڵا، کاغەزی نووسین: دەفتەرەکەم پەڕپەڕ کرد.

پەرەستاندن (چ.) گەشەکردن، بەهێزبوون، ڕوو لە هەستان و زیادبوون: وشیاری نەتەوایەتی پەرەی ستاندووە.

پەرەسەندن (چ.) بەرەوپێش چوون... 

پەرەسەندن (چ.) گەورە بوون، زیاد بوون، فرەوان بوون: ئاگرەکە تا دەهات

پەرەی دەسەند.

پەرەکردن (چ.) فێــر کــردن، بــەخێو کــردن، گۆشــکردن: بــۆ بنیاتنــانی کۆمەڵگایـــەکی هاوچـــەرخ پێویســـتە پـــەروەردەکردنێکی هاوچەرخمان هەبێ.

پەرتووك (ن.د.) کتێب، تێنووسراو: پەرتووکێکی بە سوودم خوێندەوە.

پەردە (ن.) ١- ڕوو پۆشــی دەرگــاو پەنجــەرە: بــەدوای قوماشــێکی ناســکدا دەگـەڕێین بیکەینـە پـەردە. ٢- شـەوی پـەردە: ژووری بـووك و زاوا لە شەوی گواستنەوە. ٣- ئەو پێـوەرەی کـە پەنجـەرەی پـێ دەپێــورێ و لێــی دروســت دەکــرێ: پەنجەرەیــەکی چــوار پەردەییان لە ژوورەکەی پێشەوەدا هەبوو.

پەرژین (ن.) تانۆك، حەشار، شوورە، چیلە: باخەکەم پەرژین کرد.

پەرست (ئان.) ڕەزیل و ڕژد: پارە پەرست خووەکی پیسە.

پەرستگا (ن.م.) شوێنی خوا پەرستی، مزگەوت، کەنیشتە: پەرستگاکان لەلای من پیرۆزن.

پەرسیف (ن.) پەسیو، هەلاّمەت، ئەنفلوەنزا. هشیار بە وی پەرسیف هەیە.

پەرش (ئان.) بلاّو، پەرژ، بڕژ. شتەکان پەرش مەکە.

پەرش بوونەوە (ئان.د.) پرژو بلاّوبوون. سوپا بەهەموو لایەم پەرش و بلاّو بوونەوە.

پەڕش و بلاّو (ئان.) بلاّو، پەڕاگەندە. خەڵکە بە وڵاتان پەرش و بلاّو بوونەوە.

پەروا (ئان.) ترس، هەراس، باك: بێ پەروابە لە ژیان.

پەروەر (ئان.) ١- بەخێوکەر، پەروەردەی لاوان وریایی دەوێ. ٢- ناوی پیاوانـە: پــەروەر مامۆســتای بەشــی شــانۆیە. ٣- حــەزکردن بەشــتێك: قانعی شاعیر کورد پەروەرێکی مەزن بوو.

پەروەردە (ن.) بەخێو کردن، فێرکردن، ڕێنمایی، ڕێنوێنی: شـێوازی پـەروەردە لای ئێمە هێشتا زانستییانە نییە. پـەروەردە کردنـی منـداڵ لـە بەڕێوەبردنی دەوڵەت گرانترە.

پەڕینەوە (چ.) ١- لە ئاو یا لە شەقام چوونە ئەو بـەر: پیرەکـەم پەڕانـدەوە. ٢- نەخۆشی یەك لە یەك بۆ یەکیتر بگوازرێتەوە: هەڵامەتەکە بۆ من پەڕێ یەوە.

| | |
|---|---|
| پەست (ئان.) | دڵ توند، گوشراو، بێزار: بەکاری ناڕێك پەست دەبم. چی تر پەستم مەکەن. |
| پەست (ئان.) | عاجزو دڵ توند: بە هەموو شتێ پەست مەبە. |
| پەسەند (ئان.) | باش، چاك: لە کاری پەسەند بگەری |
| پەسندکردن (چ.ل.) | بەچاك و دروست زانی: بڕیارەکەتم پەسەند کرد. |
| پەشیمان (ن.و.) | پاشگەز: کاری خۆکردە پەشیمانی بە دواوەیە. |
| پەچە (ن.) | چارشێو، لەچکە، رووپۆش: (پەچە باوی نەماوە). |
| پەك (ن.) | ١- ناچاری، هێزو توانا. ٢- تۆپە سوف، داو: دوو گورە پەك بەشی کڵاوەکە دەکەن. -کەوتن (چ.) لەکار کەوتن، لە تاقەتدا نەمان، لە دەستدان: باوکم بەجارێ پەکی کەوتووە. |
| پەل پەل ( ) | لەت لەت، پەل: دەستو پەل، باسكو پەنجە. مەڕەکەیان پەل پەل کرد. |
| پەل داکوتان (چ) | خۆگرتنو ڕیشە داکوتانی گیا. تازە پەلی داکوتاوە. |
| پەل کردن (چ) | لەبەین بردنی قووڵایی شتێك. |
| پەل کوتان (چ) | هەوڵدان، پەلگرتن، دەستگرتن، یارمەتی دان. ناتبەم و پەل کوتانی ناوێ. |
| پەلو باڵ (ن) | پەلەوەر، پەل بزاوتن، دەست بزاوتن، جوولەکردن. |
| پەلو پۆ (ن.) | ١- تەقەڵلا، هێزو تونا، جموجۆڵ. ٢- لقو پۆ، تاروپۆ، لك: کاریگەری نەخۆشییەکە لە پەلوپۆی نەخستووە. |
| پەل و پۆخستن (چ) | شپرزەکردنو جوولە لێ بڕین. لە پەل و پۆیان کرد. |
| پەلامار (ن.) | شاڵاو، هێرش، هەڵمەت، خۆ پێدادان. لە پەلامارێکدا شەهید بوو. |
| پەلاماردان: | - پەلاماردان: بە هێمنی هەڵسوکەوت بکە پەلاماری کەس مەدە. |
| پەڵە (ئان.) | ١- لەکە: کراسەکەی پەڵەی زۆرە. ٢- بارانی تێری دەغڵ: باران پەڵەی داوە. شەرمەزاری ئەو بۆتە پەڵەیەکی ڕەش بۆ بنەماڵەکەی. |
| پەلە هەور (ن.) | پارچە هەور: پەڵە هەورەکە ئاسمانی گرتووە. |

پەلك (ن.) بەلگ، پەل، گەلاٚ: پەلکێن داران ل پاییزێ د وەرن.

پەلێك (ن) لەت، پەلێك نان، پەل، دەستو پەل. پەل و باڵیان کرابوو.

پەمبلۆك (ن.) کەڕوو، کیفکی.

پەنا (ئاك.) پشتیوان، دالدە، لەخۆگرتن، حەشاردان: لە پەنای تۆ دەژیم.

پەناو هانا (ن.) ١- پشتیوان، پشتگیر، ئامان: پشتو پەنام هەر تـۆی خودایـە. ٢- سووچو قوژبن. ٣- لا، تەنیشت، کن: وەرە پەنای من دانیشـە. ٤- پەنا، ئاگادار: پەنامان هەر تۆیە خودایە.

پەنابەر (ن.) پەناهەندە، ئەو کەسەیە کە روو دەکاتە پەنایـەك: ژمارەیـەکی زۆر لە کوردان بووینە پەنابەر.

پەنجە (ن.) ١- دەست بـە ئەنگوسـتەوە: دەبێـت ڕۆشـنبیرەکان جـێ پەنجـەی کاریگەریان لە بە مەدەنی بوونی کۆمـەڵگاوە هـەبێ. ٢- قامـك، ئەنگوســت: پەنجــەی گــەورەی پــێم دەیەشــێ. ٣- چــڕنووکی جانەوەر: ٤- جۆرە نەخشێکی تەونی بەڕە.

پەند (ن.) ئامۆژگاری، راوێژ: پەندە کوردییەکان بپارێزن.

پەنگیای (ئان.) مەند، مەنگ.

پەنهایی (ئاوەڵکار) شاراوەیی، نهێنی: هەواڵەکەم بە پەنهایی پێ گووت.

پەنیر (ن.) بـەروبوومێکی سـپیاییە، پێخـۆری بـرای ماسـت: نـانو پـەنیر خواردنی بەیانییانە.

پەی (ئام.) بەپێی، بەگوێرەی، لدووڤ، ل گۆر.

پەیامنێر (ن.ل.) هەواڵنێر، پەیامبەر، نێردراو، پێغەمبەر: پەیامنێرەکە کوژرا.

پەیتا پەیتا (ئاك.) یەك لە دوای یەك: هاوڕێکانم پەیتا پەیتا بەدیارکەوتن.

پەیدابوون (چ.) ئاشکرا بوون، دیاردان: لەکورد دەوڵەمەندێکی زۆر پەیدابوون.

پەیدابوون (چ.) دەســتکەوتن، دابینبــوون، دەســتکەڤتن، پەیــدابوو: کــاری رابردوویە. بەهاری ٩١ دەرفەت بۆ کورد پەیدا بـوو رابپـەڕێتو لە دەست رژێمی فاشستی بەعس رزگاری ببێت.

پەیداکردن (چ.) وەدەست هێنان، دۆزین وئامادە کردن: دەرمانەکەی پەیدا کرد. ئەمڕۆ پارە پەیداکردن زەحمەتە.

پەیڕەوکردن (چ.) لەسەر ڕۆیشتن، بـەجێهێنان: پـەیڕەوکردنی گوفتـار و کـرداری

چاك بن.

پەیك (ن.) پۆستەچی، نامەبەر، تەتەر: پەیك نامەكەی گەیاند.

پەیكەر (ن.) ١- لـەش، بـەدەن، بـالاً، قالـب، كۆتـەڵ، مرۆیـەكی دەسـتكردو سازكراو له بەردو گێچ یـان ئاسـن: حـاجی قـادر لەشاری كۆیـە پەیكەرێكی بـۆ دروسـت كـراوە. ٢- یـان پەیكـەری خـانوو، واتـە بناغـەو دیـواری خـانوو بـە تـەنها تـەواو نـەكرابێ. خانووەكـە تەنها پەیكەرە.

پەیكەر (ن.) هەیكەل، بت: خۆزگە پەیكەرێكی ئازادیمان دەبوو.

پەیمان (ن.) بەڵێن، مەرج، شەرت. — بەستن: مـەرجو بـەڵێنی دوو كەسـی و بەڕێوەبردنی قەولو قەرار پێكەوە دانان، بـەڵێن نامەیـەك كـە دوو یان چەند دەوڵەتی لایەنی شەڕ پێكیدێنن هەلو مـەرجی ئاشتی تێدا دەگونجێنن. مەمو زین پەیمانی عەشقیان بەست. ناوە بۆ مێینە: پەیمان لە دواناوەندی سۆرانە.

پەیوەست (ن.) ١- پێكـەوە لكـاو، نووسـاو: ئاسایشـی وڵات پەیوەسـتە بـەباری ئابوریـیەوە.٢- نـاوی كوڕانـە: پەیوەسـت خوێنـدكاری كۆلێـژی مافە.

پەیوەندی (ئاك.) پێوەندی، نێوان، بەین: پەیوەندی دۆستایەتی چاكە.

پەیوەندی (ن.) نێـوانی دوو كـەس، دوو خێـزان، هاموشـۆ، عیلاقـە: دەبێـت پەیوەندی نێوانمان مكومتر بكەین.

پڕ (ئان.) ١- تـەژی، تـەواو، زۆر، مشـە، تـژی، مەنـد، رادەی پێویسـت: تانكییەكە خـۆی پـڕە پێویسـتی بـە پـڕ كـردن نییـە. ٢- زیـاد، ئاپۆرە، زۆر جمە: سەیرانگاكە پڕ بوو لە گەشـتیاری بیـانی. ٣- ڕكو تووڕەیی: هەر چەندە دڵم لێـت پـڕە، بـەلاًم ئاشـتبوونەوە بە ڕەواتر دەزانم.

پڕ (ئان.) ١- زۆر، گەلـەك: قسـەكانی پـڕ پەنـدن. ٢- بـێ مانـا: قسـەی پڕوپووچ مەكە.٣- پیر: قسەی پڕو پیرێژنانە. ٤- بـۆ تورەبـوون: دڵـم لێـت پـڕە. ٥- بـۆ خـەم: دڵـی پڕبـوو گریـا._ كـردن (چ) ١- تـژەكردنی واڵـا: دەفرەكـەم پـڕ ئـاو كـرد. ٢- توندوتیـژكردن:

خەلكیان لێ پڕكرد.

پرۆتستانت (ن.) ئاینو مەزهەب: پرۆتستانتو كاسۆلیكەكان ململانێی توندیان لەشیدانە.

پرۆژ (ن.) گەڵاڵە دانان بۆ كارێكی گرنگ و بە بەهرە: پرۆژەی ئاوی ئیفراز تەواو بوو.

پرۆژە (ن.) نەخشە، پلانێكی داڕێژراو بۆ كار لەسەركردن: حكومەتی هەرێم پرۆژەی ئاوەدانكردنەوەی دەست پێكرد.

پرۆگرام (ن.) بەرنامە: كاری پەرلەمان بە پرۆگرامێكی باش بەڕێوە دەچێت.

پڕاڤ (ئان.) پڕئاڤ، پڕاو، پڕئاو، تژی ئاڤ، تێرئاڤ. ئەڤ زە بەشە بڕاڤە.

پراوەكردن (چ.) راهێنان، خۆئامادەكردن: بەیانی پراوە دەكەم.

پرت (ن.) پارچە. هەر پرتێكی بەر نەكەوت.

پرزەبڕان (چ.) شەكەت، ماندوو، بێ تاقەت: مناڵەكە پرزەی لێ بڕا.

پرزی لێ بڕان (چ.) ماندوو، هیلاك، شەكەت: لە كاركردن پرزی لێ بڕاوە.

پرس (ن.) وتەكە وەڵامی گەرەكە، پرسیار: پرسەكەت بێ وەڵامە._ ین (چ.) پرس كردن: بۆ تێگەیشتن زۆر بپرسە._ ە (ن.و) ١- ئەو لەپرسەی باوكی نەبوو. ٢- سەرەخۆش، تازیە: پرسەكەیان لە مزگەوتی گوندە.

پرسە (ن.و.) تازیە: پرسەكەیان تەواوبوو.

پرسیار (ن.ب.) پرس: پرسیارەكەت بكە.

پرسین (چ.) پرسیار كرن. بپرسیت: ( كارێ رانەبردوویە.)، تشتێ مرۆڤ نەزانیت بپرسیت شەرم نینە.

پڕشنگ (ن.) ١- تیرۆژ، تیشكی رۆژ: پرشنگی هەتاو جوانە. ٢- تیشكی ئاگر: پرشنگی ئاگرەكەم بۆ هات.٣- ناوە بۆ مێینە: پڕشنگ كچێكی شۆخو شەنگە.

پرشنگدار (ئان.) گەشاوە، درەوشاوە، بریقەدار، بریسكاوە: دووی رێبەندان رۆژێكی پرشنگدارە بۆ كورد.

پرچ (ن.) ڤژ، پۆڕ، مووی سەر: زوی زوی پرچا خۆ بشۆ.

پزیشك (ن.) نوژدار، دكتۆر، حەكیم: سەردانی پزیشكی ددانم كرد.

پسپۆر (ن.) : زانا له كارێكدا: پزیشكەكه پسپۆره له نەشتەر گەری.

پسپۆر (ن.ئان.) تایبەتمەند: شارەزا د مەیدانەكێدا. ئەو له بواری نەشتەرگەری پسپۆره.

پسمام (ن.) كورمام، ئامۆزا، مامۆزا، پسەرمام: پسمامێ باش بۆ خودانی پشته.

پشت تێكردن (چ.) ڕوو لێ وەرگێڕان، گوێ پێنەدان: پشت لە خزمو كەس و كارت مەكه.

پشت گوێخستن (چ.) گوێ پێ نەدان، فەرامۆشكردن: پشت گوێخستنی گەنجان كۆمەڵگا دوا دەخات.

پشتاو پشت (ئان.) دەماو دەم، كوڕ لە باوكەوە، نەوە لە دوای نەوە، بابلباب: پاشایەتی حوكمێكی پشتاو پشته.

پشتگیری (ن.و.) پشتگرتن، یارمەتی دان، پشتیوان. — كردن: پشتیوانی كردن: ئێمه پشتگیری دەكەین.

پشتی (ن.) ئەو بارەیێ مرۆڤ ب پشتێ هەلدەگریت: پشتیێن گران هەلنەگره.( ئاك.) دوای، لە پاش: پشتی تە جگاره هێلاین لەشێ تە یێ خۆش بووی.

پشك (ن.) بەش، پارچە، بەهر، باهر. پشكی ئەو نادەن، پشكا زمانێ كوردی ل كۆلیژا ئادابێ هەر سالێ وەرزەكا رەوشنبیری ڤەدگێریت.

پشكنین (چ.) ١- ماڵ پشكنین، لەبەریەك جیاكەرەوە، گەڕان بەدوای شت: پشكنینی ماڵەكه لەلایەن پۆلیسەوە ئەنجام درا. ٢- پشكنینی لای پزیشك: پزیشكەكه نەخۆشەكەی پشكنی.٣- لەیەك جیاكردنەوەی خوریو لۆكه، توێ توێ.

پشوو (ن.) ١- تاو، وچان، بێن، نێم: بۆ پشوو لاماندایە گوندەكەو دواتر ڕۆیشتین. ٢- هەناسە، نەفەس: تۆ پشوو بێنەوه بەرخۆت ئەوجا قسان بكە. (ئاك.) ٣- ڕۆژێك كە دەوام نەبێت، ڕاوەستان: هەمو ساڵێك پێنجی ئازار پشووی فەرمییە لە وڵاتدا.

| | |
|---|---|
| پشوودان (چ.) | ١- حەسانەوە، ماوەدان دوای ماندوێتی: پشوودان پێویستە. |
| پچران (چ.) | پسان، لێك ترازان: پەیوەندی یەکەیان پچراند. |
| پچڕاندن (چ.) | قرتاندن، پساندن: داوەکەمان لە پێ پچراندو باڵندەکەمان ئازاد کرد. |
| پچڕپچڕ (ئان.) | ١- بەش بەش، لەت لەت: داوەکە پچڕپچڕ بووە.٢- ماوە لە نێوان هەندێ شت: باران پچڕپچڕ دەبارێ. |
| پلار (ن.) | ١- دار دەست بۆ هاوێشتن: شوانەکە پلاری لە مەڕەکە گرت. ٢- تانەو سەرکۆنە، قسەی بە توێکڵ: کوڕەکە پلاری لە کچەکە گرت. |
| پلان (ن.) | رێو شوێن، کەینو بەین، نەخشە، بەرنامە: زۆر لە حکومەتەکان پلانی پێنج ساڵە بۆ بواری ئابووری لە وڵات پەیڕەو دەکەن. —دانان (چ.) گرتنە بەری ڕێو شوێن، بەرنامە ڕێژی، نەخشە دانان، ڕەنگڕشتن: بۆ ئەوەی کاروبارەکانی وڵات باش بەڕێوەچن پێویستە پلان دانان هەبێ. |
| پلان کێشان (چ) | نەخشەکێشانو بەرنامە داڕشتن بە دژی کەسێك. ئەمە پلانکێشانی زۆری بۆ کراوە. |
| پلە (ن.) | ١- پوورێ، میمك، خوشکی دایكو باوك: پلە خاتوون لە هەموو خوشکانی دایکم بچووکترە. ٢- پایە، دەرەجە، نمرە: پلەی گەرمی ڕوو لە بەرزبوونە. ٣- پت بە قامك لە شتدان: منداڵەکە پلی نایە ناو ماستەکەوە. ٤- پێ پلکەی ناردەوان: ناردەوانی ماڵمان پازدە پلەیە. |
| پلەپلە (ئاك.) | هەنگاو هەنگاو، پایە پایە: پێشمەرگەکە پلەپلە چووە پێشەوە. |
| پڵنگ (ن.) | گیانداری دڕندەی بەناوبانگ: پڵنگ گیاندارێکی بە توانایە. |
| پۆپ (ن.) | پۆپیتەی کەلەشێرو مریشك، قژی ژن، پۆپکە: پۆپەی کەلەشێرەکە جوانە. |
| پۆست (ن.) | ١- پێست، چەرم، پوس. ٢- توێژێکی ناسکی سەر گۆشتو ماسوولکەی لەش کە کاری هەستکردن بەسەرماو گەرماو ئێش. ٣- توێکڵ. ٤- کەوڵ. ٥- پۆست: ئەم پۆستە هەر لایەق بە |

تۆیه. ٦- نامه: هیچ پۆستی نوێ نییه.

پۆشین (چ.) دەبەر کردن: جله تازەکەت بپۆشه. ٢- وەشاردن: دایکی هەردەم هەڵەکانی دەپۆشن.

پۆڵ (ن.) پشکۆی ئاگر، پۆلی، پەنگر: دەڵێی بەسەر پۆڵا کەوتووە.

پۆل (ن.) کۆمەڵێك کەس یان گیانلەبەر، یەکە: پۆلێ مەل بە ئاسماندا فرین.

پۆڵاین ( ئان.ل.) ( پۆڵا+ ین.) ١- هەر شتێك لە پۆڵا دروست کرابێت. پێشمەرگە بەباوەڕێکی پۆلاینەوە شەڕی دەکرد.

٢- قارەمان، ئازا، خۆڕاگر: واته وەك پۆڵا توندو بەهێز.

پۆیلانه (ن.) دیاری بۆ تازه بووك یا زاوا: پۆیلانەم برد بەدیاری.

پوخت (ئان.) پاكو تەکوز، ڕێکوپێك: دڵخۆش دەبم ئەگەر کارەکانم پوخت بن.

پوخته (ن.) کورته، کاکڵه: پوختەی بابەتەکەم خوێندەوە.

پول (ن.) پاره، دراو: پولێکی زۆرم خەرج کرد.

پوور (ن.) پلك، خوشکی دایك، خالەت: پوورەکەم ئەندازیاره.

پووره هەنگ (ن.ل.) شانەی هەنگ: پووره هەنگێکی باشیان دۆزیەوە.

پووش (ن.) گیاو گۆڵی وشك، وشکەگیای دەشت: گیا دەبێته پووش.ـ وپەڵاش(ن.ل.): پووش و پەڵاشه کە کۆبکەنەوە .ـ پەر (ن.) ناوی مانگێکی کوردییه دەکەوێته نێوان حوزەیران و تەمموز و ٣١ ڕۆژه: له مانگی پووشپەڕ گەنم هەڵدەگیرێ.

پووشپەڕ (ن.ل.) کاتو جەنگەی گیا درووونەوە کە گیا ورده ورده وشك دەبن، یەکەم مانگی وەرزی هاوین: دوای مانگی پووشپەڕ مانگی گەلاوێژ دێت.

پووچ (ئان.) ١- بێ ناوك، بێ کاکڵ، ناو بۆش: زۆر له گوێزەکان پووچ بوون. ٢- روخساری ناشیرین، ژاکاو، وێك هەلاتوو، چورچ: سێوەکان جوان نین پووچن. ٣- بێ مانا: هەموو قسەکانی پووچ دەرچوون. ٤- چورچ: دەم و چاوی پووچ ببوو.

پویش (ن.) پووش، گیایێ بەهیو هشكو زەربووی:١- پویش زوی دسوژیت.

٢- شەڕێ خویشکان، ئاگرێ پویشکان.(پەندە)

پێ (ن.) قاچ، پا: بە پێ ڕۆیشتن بۆ مرۆڤ باشە.

پێ بەخشین (چ.) دانی بێ بەرامبەر: بەڕێوەبەرەکە دیاری پێ بەخشین.

پێ داگرتن (چ.) سووربوون، مکوڕبوون، دانەنوانـدن: پـێ داگـرتن لەسـەر مافەکانمان ئەرکە.

پێ دەشت (ن.ل.) زەوی تەختانی کەناری چیا و رووبار: زەوی کوردستان زۆری پێ دەشت وشاخە.

پێ ڕەوکە (ن.) ساوا، منداڵی تازە سەرپێ بکەوێ: پیاوی پیر وەکو منـداڵی پـێ ڕەوکە وایە.

پیادە (ن.) ١- کەسێك بە پێی خۆی ڕێگا دەبڕێت، تاقمێـك لـە لەشـکر کـە ئەسپیان پێ نییەو بە پێیان دەڕۆن شەڕ دەکەن: نـە بـە پیـادە دەیگەمێ نە بە سوار.

پیاسە (ن.) ڕۆیشتن، هاتوچۆ بەبێ ئیش و کار: لە کەناری دەریاکە پیاسەم دەکرد.

پیانۆلێدان (چ.) لێدانی پیانۆ، پیانۆ ژەنین: ئاشنا لە پیانۆ لێدان شارەزایە.

پیاو (ن.) ١- مـرۆ، مرۆڤـی نێرینــە، زیـاتر دوای ژن هێنـان دەگرێتــەوە: پیـاوی کـورد بـە توانایـە. ٢- نۆکـەر، خـولام، خزمـەتکار. ئـەو پیاوی زۆری هەیە.

پیاو خراپ: پیاو خراپی لە ئێمە ناوەشێتەوە.

پیاو چاك: كاك ئەحمەدی شێخ پیاو چاکێکی کورد بوو.

پیاو ماقووڵ (ئان.) ڕیـش سـپی، گـەورە، ڕێنیشـاندەر. ئەنجومـەنی پیـاو مـاقووڵان لەوڵاتی ئێمەدا نیە.

پیاوانە: پێویستە کاری پیاوانە ئەنجام بدەین.

پیاوەتی، جوامێری: پیاوەتی لە دەست هەموو کەسێك نایەت.

پیاوچاك (ن.ل.) پیـاوی بـاش، پیـاوی ئـایینی و چـاکەکردن، گـۆڕی پیـاوە ڕۆحانییەکان: گۆڕی پیاوە چاکەکە نوێ زایەحە.

پیاوکوژ: پیاو کوژ چارەنووسی هەر کوشتنەوەیە.

پیت (ن.) ١- تیـپ: ئـەو وێنانـەی بـۆ دەنـگ لـە زمانەکانـدا کێشـراون: لـە

نێوان زمانی کوردیو عەرەبییدا چەند پیتێکی جیاواز هەن.
٢- خێرو بەرەکەتی زەوی: خاکی کوردستان بە پیتە.

پیتاك (ن.) باروبوو، کۆمەك، ئابۆنە: پیتاکی ئەم مانگەمان کۆکردەوە.

پیتە (ن.) بایەخ، سەخبێری، پەروەردە. ئەڤ گوڤارە پویستە ب زمانێ کوردی د دەت.

پێجان (ن.) پەرژین، سنووری باخچەو بیستان و رەز، کە بە داروچیلکەدار دروست دەکرێت.

پێخەف (ن.) نوێن: پێخەفەکەم گەرم بوو.

پێخواس (ن.د.) پا پەتی، بێ پێڵاو: بە پێخواسی مەڕۆ دەرەوە.

پێخواس: پێخاوس: بە پێ خواسی گەڕان باش نییە.

پێخوران (ن.) پێخور، ئەو تشتێن نان پێ دهێتە خوارن وەکی ( ماست، پەنیر، ژاژی، هێلک، تەحین، لۆرك، نیڤیشك، قەیماغ.. تد): مرۆڤ هەرۆ نەشێت نانێ بترسی بێ پێخوارن بخۆت.

پێداکردن (چ.) ١- خۆل یا ئاو بەسەر داکردن: ئاوەکەیان بە چیمەنەکە داکرد.٢- فڕکردن، هەڵقوراندن: نانی خواردو ماستاوی پێدا کرد.

پێدەشت (ن.) کەنار ڕووبارو دەشتایی قەد پاڵ چیاکان

پێدڤی (ن.) پێویست، پێداویست: پێدڤیێن ئیپراخێ زۆرن.

پیر (ئان.) ١- بە تەمەن، بەساڵا چوو: کە پیرێکت دی پێویستە هاوکاری بکەیت. ٢- پیاو چاكو شێخی تەریقەت: پیری موغان، پیری ماویلیان.

پیرۆز (ئان.) تشتەکێ یان جهەکێ گەلەکێ بهادارە، وەکی قورئانا پیرۆز: جێژنا قوربانیا پیرۆز.

پیران (ن.) ١- لە هۆش خۆچوون، پیرانی کردووە. ٢- ناوی دێیەکە لە سنووری ئێران لە ناوەندی هەورامانو مەریوان: شێخ سەعیدی پیران سەرکردەیەکی مەزن بوو.

پێز (ئان.) پیت، فەڕ، پتەو، بەنرخ: خواردنێکی بەپێزم خوارد.

پیزا (ن.) شارێکە لە ئیتالیا. شاری پیزا خۆشە.

پیس (ئان.) چڵکن، دژی پاك، ڤرێژی: ئاڤا پیس نەڤەخۆ.

پیست (ن.) پێست، چەرم، کەڤل: کورد پەنیری د پیستاندا دپارێزن.

پێست (ن.) چەرمی لەش، پێست: پێست رەشەکان چەوساوە بوون.

پێستەخۆشکردن (چ): دەباغی. هەولێریەکان بە پێستە خۆشکردن ناسراون.

پێش (ئاك.) ۱- بەردەم: لەپێشم دا مەنیشە. ۲- زووتر: ئەو پێش من هات.__ ینان(ن.) باو باپیران، ئەوانەی پێشتر ژیاون: پەندی پێشینانمان زۆرە

پێش نوێژ (ن.ل.) مەلای دێ، ئیمام، ئەوکەسەی لەکاتی نوێژکردن پێشڕەوی خەڵك دەکات.

پیشان (چ.) بەتینو تاوی ئاگر پێگەیاندن، کوڵان: لە گەرمان پیشام.

پیشاندان (چ.) نیشاندان: هەر چەندی کرد شوێنەکەیان پیشان نەدا.

پێشاندان (چ.) نیشاندان، خستنە پێش چاو: کارە باشەکانی پێشان دام.

پیشە (ن.) ۱- کارو سنعەت: پیشەی باوکی دارتاشی یە. ۲- سیفەتێك: پیشەی هەرهات و چۆیە. _ سازی (ن.و.) سنعەت کاری: شۆرشی پیشەسازی ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی گۆڕی.

پیشە (ن.) ئیش، کاروبار، کار، شوڵ: خوێندنەوەم کردووە بە پیشەی رۆژانە.

پیشەسازی (ن.) کارێ دەستی، سنعەتکاری. کورد وەزارەتی پیشەسازی هەیە.

پێشەکی (ن.) ۱- بیع، بەیعانە، عەرەبوون، ئەو برە پارەیەی کە لەکاتی کرپیندا پێش وەختە دەدرێ: پێشەکی شەش مانگی داوە. ۲- بەرەیی، بەرایی، دەستپێك، سەرباس، سەرەتا: لە پێشەکی کتێبەوە بەناوەرۆکەکەی ئاشنا دەبین.

پێشەنگ (ن.) ۱- پێشەوا، پێشڕەو، رابەر، سەروەر، سەرقافلە: شەونم پێشەنگی قوتابیانە. ۲- ناوە بۆ نێرینە.

پێشەوا (ن.د.) رابەر، سەرۆك، سەرکردە، گەورەی نەتەوە، پێشڕەو: قازی پێشەوایەکی دڵسۆز بوو.

پێشەوە (ئاك.): پێشەوەی هۆڵەکەم ڕازاندەوە.

پێشخستن (چ.) ۱- پلە زیادکردن: سەربازەکە پلەپلە پێشیان خست.۲- بردنە

پێش: پێشخستنی کارگەکە بە ئەندازیاری کارامە دەبێ.٣- بۆ ڕێزلێنان لەدوا ڕۆین: ئازاد میوانەکانی پێش خست بەرەو ژووری نان خواردن.

پێشڕەو (ن.ب.) ١- سەرکردە، رابەر: پێشڕەو پێشمەرگەیەکی دلێرە.

پێشڤەچوون (چ.) بەرەو پێشەوە چوون. پێشڤەچوونەك دکارێ ویدا هەیە.

پێشکەشکردن (چ.) ١- پێ بەخشین، پێدان: ئەم کتێبەت پێشکەش دەکەم. ٢- پێناساندن: حەز دەکەم ئەم برادەرەت پێشکەش کەم.

پێشکەڤتن (چ.) پێشکەوتن، بەرڤ پێشڤەچوون، بەرەو پێشەوە چوون: پێشکەڤتنا هەرێما کوردستانێ پشتی سەرهەڵدانێ یا دیارە.

پێشکەوتن(چ.) ١- بەرەو پێش چوون: پێش کەوتن بەخوێندنە.٢- لەپێش خەلکەوە ڕۆیشتن: لە پێشبرکێ یەکە پێش ئێمە کەوت.

پێشکەوتووخواز (ئان.) هاوچەرخ، نوێخواز، سەردەمیی: گۆران هۆنەرێکی پێشکەوتووخواز بوو.

پێشمەرگە (ن.) چەکدارێ خۆبەختکەرێ کوردە، بەرگری ژ کوردستانێ و مافێ کوردان کریە. (فیدراڵیەتەکەمان بەرهەمی دەستی پێشمەرگەیە). ئەڤ ناڤە سالا ١٩٤٦ قازی محەمەد ل کۆمارا مەهابادێ بکارئینایە.

پێشێلکردن (چ.) سەرپێچی کردن، دژ وەستان، لە بن پێ نان، جێبەجێ نەکردن: پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ هەڕەشەیە بۆ سەر هێمنیو ئاشتی جیهان.

پێچاوپێچ (ئان.) خوارو خێچ : پێچاو پێچەکانی ڕێگای پیرمام کەم کرانەوە.

پێچان (چ.) بەرگکردن، پەریێ دەرسۆك د سەرێ خۆ پێچا.

پیچەك (ئان.) کێمەك، کەمێك، تۆزێك، هەندێك، چۆڕێك، دژی ( گەلەك، زۆر.) پیچەك خۆ بوەشینە.: گەلەکێ نەدە ب پیچەکێ.

پێچەوانە (ئان.) دژ، بەراوەژو: بیرکردنەوەی پێچەوانەی منە.

بە پێچەوانە (ئان.) لەگەڵ وشەدا بەکار دێت.

پێگەهشتن (چ.) گەیین، ڤێڕاگەهشتن. ئەوان پێگەهشتن.

پێگەیشتن (چ.) ١- ڕەسینی میوەجات، گەورە بوون، نەشونما کردن: ترێیەکە

هێشــتا پێنەگەیشــتووە. ٢- تووشــهاتن لــە ڕێــدا: لــە ڕێــدا پێیگەیشتم‌و ناسیم.

**پێغەمبەر (ن.)** پەیامبەر، نێردراو: (ئاڤێستا کتێبی پێغەمبەر زەردەشتە).

**پێغەمبەر (ن.)** راسپاردەی خودا: محەمەد پێغەمبەری ئیسلامە.

**پێك هاتن (چ.)** ڕێککەوتن، دروست بوون، هاتنە ئارا: هێزە نیشتمانییەکان لەسەر هەندێ شت پێك هاتن.

**پێکەوە (ئاك.)** بەهەڤرا، لەگەڵ یەکتر، بەیەکەوە، پێکڤە: پێکەوە کار دەکەین.

**پێکەوەژیان (چ.)** بەیەکەوە ژیان بردنەسەر: پێکەوە ژیانی بووك‌و خەسوو کێشەی لە دوایە.

**پێکڤە (ئاك.)** پێکەوە، بهەڤڕا، دگەلێك، بەیەکەوە، لەگەڵ یەك، کارێ پێکڤە مرۆڤی ناوەستینیت.

**پێکهاتن (چ.)** ڕێککەڤتن، ڕێککەوتن، جێبەجێ بوون. ئەوان تەواو پێکهاتن.

**پێل (ن.)** شەپۆڵ: پێلێن مەزن بەلەمان بناڤدکەن.

**پیلان (ن.)** بەرنامەو نەخشەیەك بە دزی کەسێك بۆ لە سەر ڕێ لابردنی. پیلانی تالانکردنی ولاتیان دارشت بوو.

**پێلاو:** کەوش، قۆنەر، قۆندەرە: پێلاوی تەنگ ئازاری پێ دەدات.

**پێڵوو (ن.)** پەلکی چاو: پێڵوو ئاگاداری چاو دەپارێزێت.

**پێمەڕە (ن.)** ئامرازی هەڵکەندنی زەوی ڕاگوێزتن: باخەوانەکە بە پێمەڕە باخەکەی کێلا.

**پێناو (ن.)** ١- هۆکار، هۆ، سۆنگە، ڕێگە: بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکی پێناو بە. ٢- ئەو کچەی پەیوەندی نێوان کوڕ و کچێك دەکات ئەو پێناوی هەردووکیانە.

**پێنڤیس (ن.)** پێنووس، خامە، قەلەم. پێنڤیس خۆ ب کار بینە.

**پێوەبەستراو (ئا.ك.د.)** پێکەوەگرێدان، پێکەوە هەڵواسراو.

**پێویست (ن.)** ١- پێداویست، پێویست، لازم، گرنگ پێویستیم بە هاوکاریتان هەیە.

**پێویستن (چ.)** لــزووم: ئــیش و ڕیــش پێویســتن. نــەدار، هــەژار. ئــەوان زۆر پێویستن.

# ت

**تا (ن.)** ١- دانه، لا، بێ: دەبێت تـای تـەرازوو بـاش دابکـەوێ، خـۆ زێـڕ نییـە. ٢- جـۆرە نەخۆشـییەکە لەگـەڵ نەخۆشـییەکانی دی پەیدا دەبێ، گەرمی: لەگەڵ نەخۆشییەکەی تایەکی گەرمیشی لێیـە. ٣- هـەودا، تـاڵ: تـا تـا زوڵفـت بەسـەر ڕووتـا بـڵاوە گوڵو ڕەیحانو سونبڵ تێکەڵاوە "بابا تاهیری هەمەدانی" ٤- هاوتـا، هاوشـان: پیاوێکـە تـای نییـە. ٥- تـەنها، تـەنێ، یـەك: چـۆن دەبـێ بـەو سـەرمایە بـەتای کـراس بـی. ٦- تایـە، تـای ئۆتۆمبێل: تایـەی ئۆتۆمبێلەکـەمان تـەقی بۆیـە دوا کـەوتین. (ئـام.) ٧- هـەتا، تـاوەکو، هـەتا وەکو: تـا تـۆ نەیـەیت منـیش ناچم.

**تابلۆ (ن.)** وێنە، نەخشەی کێشراو: تابلۆی عومەری خاوەر بەسۆزە.

**تاژی (ن.)** سەیی نێچیرێ. (ڕاوچییەکە بە تاژی کەروێشکەکەی گرت).

**تارمایی (ئان.)** سێبەر، سایە، نسێ: تارمایی مرۆڤەکە ترساندمی.

**تاری (ن.و.)** تاریکی، تاریستان، دژی ( رووناهی، روون): تاری یا نەخۆشە. تاریك ( ئان.): شەڤا تاری یا ب سامە.

**تاریك (ئان.)** رەشـایی، شـوێنێك کـە روونـاکی تێـدا نـەبێت: بـە خوێنـدنو زانست دەتوانین شەوی تاریك رووناك بکەینەوە.

**تاریك و نووتەك:** شوێنێکی زۆر تاریك: لە ژووری تاریكو نووتەك دامەنیشە.

**تاریك و ڕوون:** کۆتایی شـەو و سـەرەتایی بـەیان: لەگـەڵ تاریـكو ڕوونـدا بـە ڕێکەوتین.

**تاریکایی:** لە تاریکایی شەودا دوژمن شکێنرا.

**تاریکەشەو:** شەوی نوتەك، ئەنگوستە چاو، تاریکە شەوی درێژ ناخۆشە.

| | |
|---|---|
| تاریکیی: | دەبێت تەنگ بە تاریکی هەڵچنین. |
| تازە (ئان. ئاوەلکار) | ١- نوێ، هاوچەرخ، سەردەمی، نوو، باش، نوی: کراسێکی تازەم کڕیوە.٢- ئاوەلکار: ئێستا، ئەو دەمـە، حـاڵی حـازر: تـازە خـۆم قسەم لەگەڵ کرد. |
| تازە (ئان.) | ١- نوێ، نو: کراسە تازەکەم لەبەرکرد. ٢- باش، چاك، پەسـند: لە ماستە تازەکەم کڕی. |
| تازەکردنەوە (چ.) | نوێکردنەوە: تازەکردنەوەی مۆڵەتی چێشتخانەکە پێویستە. |
| تاس (ن.) | ١- حەز، ئـارەزوو، مـەیل. ٢- حەپەسـان. ٣- کـڵاوی سـەری ژن: تاسی سەری زێڕە. زۆر بەتاسم بۆت. |
| تاسان (چ.) | گێژو وڕبوون، واق وڕمان: بەهەواڵەکە تاساین. |
| تاسڵوجە (ن.) | ناوی شوێنە: تاسڵوجە لە سنووری پارێزگای سلێمانی یە. |
| تاشەبەرد | بەردێکی زل و گەورە: خۆی لە پشت تاشە بەردەك شاردەوە. |
| تاف (ن.) | ١- هـەڕەت: لـە تـافی جوانیمـدا کارەسـاتی ناخۆشـم بینـی.٢- گوڕەو هاڕەی ئاو: تافی ئاوی گەلی زۆر جوانە. |
| تاق (ن.) | ١- دیـوار، شـوورە: دەتـوانی بەسـەر ئـەم تاقـەدا سـەرکەوی. (ئان.) ٢- تاك، یەك: بە تاقە کەسێك ئەم کارە ناکرێ. ٣- بـێ هاوتا، تاك، بێ هاوشان: کە چاوت پێـی کـەوت، دەیناسـییەوە، چـونکە ئـەو تاقـە لـەنێو هەموویانـدا. ٤- نیـوە، دان: تاقـە رۆژێك بەدوایدا گەڕام. |
| تاقانە (ئان.) | تاك، تاکە کەس، تەنها منداڵێك: زانا تاقانەیە. |
| تاقەت (ئان.) | هێز، توانا، تین، گوڕ، ورە: بێ تاقەت بووم لە کارکردن. |
| تاقی (ن.) | ١- ئـەزموون، تەجرەبـە: لێـی مەترسـێ تـاقی کراوەتـەوە. ٢- جۆرە کڵاوێکی ژنانەیە. |
| تاقی تەنیا (ئان.) | بەتەنیا، بێ کەس: ئەو بە تاقی تەنیا رەنجی داوە. |
| تاقیکردنەوە (چ.) | جەڕبانـدن، ئـەزموونکردن، تەجرەبـە کـردن: تاقیکردنـەوەی کوردی کەوتە ڕۆژی سێ شەممە. |
| تاکێك (ئان.) | یەکێك، دانەیەك، قلێك: تاکێکم نارد بۆلاتان. |
| تاڵ (ئان.) | ١- تامی ناخۆش، پێچەوانەی شیرین، تـەحل: کـەبات تـامێکی |

تـالّی هەیـە. (ن.) ٢- هـەودا، داو، تالّـە مـوو: بـەینمان تالّـە مووێکی پێوە ناچێ. ٣- ناخۆش: ژیـانێکی تالّە. (ژیـان تـالّو شیرینە.) ٤- دەرمانی پێستە خۆشکردن، هەلاّڵ.

تال (ئان.) تالّ، تفت، دژی شیرین: راستی یا تالە!!

تالاّنکردن (چ.) بەتالاّن بردنی شتی خەڵك: تـالاّنکردنی مـالّی خـەڵك کـارێکی نارەوایە.

تامەزرۆ (ئان.) ١- ئاواتەخواز بۆ خواردن: هەژارەکە تامەزرۆی خواردنە. ٢- شەیدا: لەمێژە تامەزرۆی دیتنی تۆم.

تانە (ن.) سەرکۆنە، تەشەر، پلار، توانج: تانەو تەشەرگرتن لـە خـەڵکی کـارێکی دزێـوە.٢- پەڵـەی سـەر گلێنـەی چاو: منداڵەکـە تانـە لەسەرچاوی راستیەتی.

تانجەرۆ (ن.) شارۆچکەیەکە سەر بە پاریزگای سلێمانی.

تاو (ن.) ١- هـەتاو، تیشـکی خـۆر: خـۆی لەبـەر تـاو هەڵخسـتبوو. ٢- رێژنەی باران، گـەوارە: تـاوە بـارانێکی باشـی لێهـات. ٣- کـات، وەخت، دەم: تـاوێکی دی دەرۆیـن. ٤- پشـوو، راوەسـتان، بـێن: تاوێـك دەدەیـنو خێراتـر دەرۆیـن. ٥- رێگـە، پێنـاو، سـۆنگە: لـەتاو تـۆ وام بەسـەر هـات. (ئـان.) ٦- بـەهێز، بـەتێن، تیـژ: هەتاوێکی زۆر بەتاوە. ٧- بە پەلـە، بەلـەز، خێـرا: مـن بـەتاو ترم. بۆ وا بەتاوی؟

تاوان (ن.) گوناه: تاوانەکانی سەدام زۆرن.

تاوان (ن.) گونەه، گوناه، گرفتاری: خۆفروشتن تاوانە.

تاوسەندن (چ.) ١- تیژ بوون لە گەرمی: ئاگرەکە تاوی سەند. ٢- توند بوون لۆ سووڕان: خولخولەکە تاوی سەند.

تاوێك( ئاك.) نەختێك، تۆزێك، هەندێك، کەمێك: تاوێك حەسامەوە.

تایبەت (ن.) تاوبەت: مامۆستای تایبەتی هەیە.

تایبەت (ن.) تایبەت بۆ شتی دیاریکراو: ناو لە رووی ناوەرۆکـەوە تایبـەتو گشتی و کۆمەڵە.

تایدەر (ئاك.) دەمی تاریکایی، ڕۆژ ئاوا بوون: لە تاریدەردا بەرێکەوتن.

| | |
|---|---|
| ته (ج.) | تۆ، جێناوی کەسی دووەمی تاکە، لەگەڵ کاری تێپەڕ لە کاتی رابردوودا بەکار دێت: ته ئەرکێ خۆ ب جێهینا؟ |
| تەپ (ن.و.) | ١- دەنگی کەوتنی شتێك: هەڵۆیەکە کەوت و تەپەی هات. ٢- تەمبەڵ لە ڕۆیشتن: بەخوا لەشێکی تەپی هەیە. ٣- تۆز: تەپ و تۆز هەڵی کرد. |
| تەپۆلکە (ن) | ١- شتێکی خڕ لەخوری: تەپۆلکە خوری یەکی ڕست. ٢- گردۆلکە: بەسەر تەپۆلکە کان کەوتین. |
| تەپە (ن.) | ١- تەپۆڵکە، گرد، بەرزایی: ٢- دەنگی بەر یەککەوتنی دوو شت، یان بەربوونەوە. تەپەی لێوەهات. |
| تەپڵ (ن.) | ١- دەهۆڵی لەشکر بۆ ترساندنی هێزی بەرامبەر: دوانزە سوارەی مەریوان لەکاتی هێرش بردنیان تەپڵیان وەك چەکێك بەکار بردووە. ٢- تەپۆڵکی سەر، کاسە سەر، تەوقی سەر: لەسەر تەپڵی خۆی دانابوو، بەڵام ئەفسووس ئەو حەرامزادە بوو. |
| تەپڵ (ن.) | ١- نەخشی سەر پەنجەی دەست لە کاغەز دەگیرێ. ٢- پێستی وشك کراو بۆ دروستکردنی ئامێری مۆزیك (دەمبك): بە تەپڵو مۆسیکا ئاهەنگیان گێڕا. |
| تەپڵە سەر (ن.) | کەللەی سەر، بان سەر: تەپڵە سەری بووە بەخوری. |
| تەخت (ئان.) | پان، راست: رژێمی بەعس زۆربەی گوندەکانی کوردستانی تەخت کرد. — ە: پارچە دارێك کە رووێکی راستی هەبێت: مێزێکم لە تەختە دروست کرد. — ایی: شوێنی تەختایی بۆ دانیشتن خۆشە. کاری بەوەختی پاشای سەر تەختی. (پەند) |
| تەژی (ئان.) | تژی، پڕ، مەند، داگرتی: فۆلکلۆرێ کوردان تەژی پەندو سەرهاتینە. |
| تەڕ (ئان.) | ١- شتێك بەهۆی ئاوەوە شلو نەرم بووبێتەوە: ئاردەکە لابە با تەڕ نەبێ.٢- ناسكو شلو بە ئاو: خیاری تەڕ زوو دەفرۆشرێ. ٣- زستانێك کە بەفرو بارانی زۆر بێ: ئەمساڵ ساڵێکی تەڕ بوو. بێوەژنە، بەڵام هێشتا تەڕە. پیرە، بەڵام |

هێشتا دڵتەڕە.

تەرازوو (ن.) ١- ئـامێری کێشـانی شـتو مـەك، قـەپان: ئـەم پارچـەیەش لەتەرازوو دە ٣ کێشانی ئەندازەیی دیوارەکە تـەواو تـەرازووە. ٢- کۆمەڵە ئەستێرەیەك لەئاسمان، پێرۆ.

تەرخان کردن (چ.) ئامادەکردن: ژیانی بۆ خزمەت تەرخان کرد.

تەرم (ن.) لەشێ مرۆڤـێ مـری کەلـەخ: تـەرمێ شـەهیدی ب ڕێوڕەسمڤـە هاتە ڤەشارتن.

تەرمۆمەتر (ن.) پێوەری گەرمی: تەرمۆمەتر جیوەی تێدایە.

تەزوو (ن.) ١- تــەزی، موچــڕك، ســوزەی ســەرماو بــای ســارد: بــە خوێندنــەوەی شـیعرەکانی تـەزوو بـە گیـانی ئامادەبووانـدا دەهات. ٢- تەزووی کارەبا کوشتی.

تەزی (ئان.) سارد، زۆر سارد: ئاڤا تەزی ل گەرمێ یا خۆشە.

تەزین (چ.) سڕبوون، گۆدبوون، ساردبوون: هەردوو دەستم تەزین.

تەسەووف (ن.و.) خـوا پەرسـتی: سـۆفیگەری، سـۆفیاتی، زۆربـەی شـیعرەکانی مەحوی لە جیهانی تەسەووفدا دەخولێتەوە.

تەشەنەکردن (چ.) بلاوبوونەوە: نەخۆشییەکە تەشەنەی کرد.

تەشی (ن.) تەشوی، ئامرازی بەن بادان و ڕستن: ژنەکە تەشی دەڕێست.

تەشی ڕستن (چ.) بـادانی خـوری و لۆکـە بـۆ داو دروسـت کـردن: تەشـی ڕسـتن هونەرە.

تەڤ (ج.ن.) هـەموو، هـەمی، گشـت، تـەڤا، هـەمیا: تـەڤ یـاریزان بەرهـەڤ بوون.

تەفتیش کردن (چ.) گەڕان و پشکنین: گالیلۆ برا بۆ دادگای تەفتیش.

تەفروتوونابوون (چ.) لەناوچــوون، پەراگەنــدەبوون، فــەنابوون. پەرتــەوازەبوون، فەوتان، نەمان: یاخوا دوژمنمان تەفروتونابن.

تەڤاوێتی (ن.و.) خانە نشین: مووچەی تەڤاوێتی کەمە.

تەقەڵاندن (چ.) هەڵ وکۆشش دان: پیرەمێردی شاعیر تەقەڵای زۆری داوە.

تەقەللا (ئاك.) کۆشـش، هـەوڵ، خۆمانـدووکردن: تەقـەللا دەکـەم لـە پێنـاوی ئاشتی.

تەڤین (چ.) ١- ژەکیـان، تـۆڤین، بۆمـب و تـۆپ: تۆپیـان تەڤانـد. ٢- شـەق بوونی دیوار و زەوی: دیـواری ماڵەکـە تـەڤیوە. ٣- بـۆ خـەم و خەفەت: لەخەما تەڤیم.
٤- هەڵوەشانی دورمان: قۆڵی کراسەکەی تەڤی.

تەڤینەوە (چ.) ١- پـەڤین: تەڤینـەوەی بۆمباکـە دەنگـی دایـەوە.٢- تەنینـەوە: بلاّوبوونەوەی خەبەرو بـاس: هـەواڵی دەسـتگیرکردنی سـەدام تەڤییەوە.

تەکبیرکرن (چ.) خۆئامـــادەکردن، خۆبەرهـــەڤکرن، لێکدانـــەوە، نیـــازکردن: فەرەچی ئێڤاری تەکبیرنەکر، سپێدێ بارنەکر. (پەندە)

تەکنیکی (ن.و.) هونەری: تەکنیکی چیرۆك نووسین تازەیە.

تەڵەکەبازی (ن.و.) فێڵبازی، حیلە کار: کەس بە تەڵەکە بازی نەژی.

تەلیسکۆب (ن.) ئالەتی دووربینین: ئەستێرەزان تەلیسکۆب بەکار دەهێنێ.

تەمومژ (ن.ل.) کاتێـك هـەوا شـێدارو غوبـار دەبێـتو چـاو چـاو نابینێـت: بەیانی زوو کە چووم بۆ قوتابخانە تەمومژ بوو.

تەماع (ن.) چاو چنۆکی، داوای ناڕەوا: تەماع ڕەوشتێکی پیسە.

تەمەشاکردن (چ.) سەیر کردن بەچاو: تەمەشای بەفر بارینم کرد.

تەمەڵ (ئان.) ئیش نەکەر، لەش قورس، تەوەزەڵ: ژیانی مرۆڤی تەمەڵ بـێ سوودە.

تەمەڵە (ن.) بناغەی دیوار: تەمەڵەکەیان جوان داڕشتووە.

تەمەن (ن.) ١- عومر، مەودای ژیـان: لـە تەمەنیـدا چاکەی زۆرە.٢- نرخـی شت: تەمەنی شتومەك زۆر بووە.

تەمەن (ن.) ١- عـومر، مـەودای ژیـان: تەمـەنی لاویـم لەسـەر کوردایـەتی دانا.٢- ناوی کوڕانو کچانە: تەمەن لاوێکی بەهرەمەندە.

تەمموز (ن.) مانگی حەوتەمە لە ساڵی لەدایك بووندا: مـانگی تـەمموز زۆر گەرمە.

تەن (ن.) ١- لـەش، بـەدەن: تەنـە پاکەکـەیان بـەخاك سـپارد. ٢- سـیان، قورم و رەش: دەم و چاوت هەموو تەنییە بڕۆ بیشۆ.

تەنانەت (  ) ١- خۆ ئەگەر، هەتاکە: تەنانـەت لـە نـاو بێگانەشـا ئاشـنایت.٢-

بەتایبـــەت: هاتنـــە ژوورەوە قەدەغەیـــە تەنانـــەت بـــۆ کارمەندانیش!

تەناهی (ن.و.) ئاسایش، ئارامی، هێمنی: تەناهی ل وەلاٚتێ مە بەلاٚڤە.

تەندروستی (ن.) ساخ و سەلامەتی: تەندروستیت باشە.

تەنگ (ئان.) ١- تەسك، دژی فـراوانو گوشـاد: پـێلاٚوی تـەنگ ئـازار بـە پـێ دەگەیەنێ.

تەنگ (ئان.) تەسك: ژووری تەنگ ناخۆشە.

تەنگ پێ هەڵچنین: ناچار کردن، هەراسان کردن، تەنگ پـێ هەڵچـنین بـە دوژمـن ئازاییە.

تەنگو چەڵەمە (ن.) گیروگرفـتو نەخۆشـیو دەردی زەمانـە، نالـەباری: کـورد بـە درێـژایی مێـژووی خـەباتو تێکۆشـانی بەسـەر زۆر تـەنگو چەڵەمەدا زاڵ بووە.

تەنگو چەڵەمە، گرفت: نابێت تەنگو چەڵەمە بۆ خەڵك دروست بکرێت.

تەنگانە (ئان) ناخۆش، کۆسپ، تەنگ و چەڵەمە، زەحمەتی، دژوار، مەترسی ئەو هەر لە تەنگانەیە

تەنگاو ئەو بە تەنگاوی هات. انـە: پیـاو دەبێت لـە تەنگانـە خـۆڕاگر بێت. ئەو تەنگاوە پێویستی بەسەرئاوە.

تەنگە (ن.) ١- کەمەر بەندی ولاٚخ، ناو قـەد: ولاٚخێکـی تەنگە ئەسـتوورە. ٢- ناوقـەدی مرۆڤـی کەتـە: ئـەو مـل پـان و تەنگەسـتوورەت نەدیت؟

تەنگە تاوکردن (چ.) ناچارکردن، نارەحەتیان کرد: دزەکەیان تەنگەتاوکرد.

تەنگەبەر، تەسك: ماڵمان لای کۆلاٚن تەنگە بەرەکەیە.

تەنگەنەفەس: هەناســە تـــەنگ بـــوون، پشـــیگیران، تەنگـــە نەفەســـی نەخۆشییەکی سەختە.

تەنك (ئان.) ١- پێچەوانەی ئەستوور: ئـەم قوماشـە تەنکە بـۆ هـاوین زۆر گونجاوە.٢- نەپڕ، کـەم، بـە یـەکێك دەگـوترێ کـە ڕدێنـێ کـەم بێ.

تەنك (ئان.) دژی ئەسـتوور: بـەرك ژ لایـێ تەنکڤـە ددرپێـت. چـەند و

کرمـانجی یـا ژوورو نییـە ب ڤـێ ڕامـانی ژ سـۆرانی هاتییـە وەرگێڕان. (پەندە)

تەنکاو (ن. ل): ئاوی چەم و ڕووبار کە قووڵ نەبێ: ڕووباری تەنکاو مەترسی نییە.

تەنکاو (ن.) پێچـەوانەی قووڵـە، شـوێنێك لـە ڕۆخـەکانی رووبـار: لـە تەنکاوەکە مەلەم کرد.

تەنهایی (ئان.) تەنیایی: تەنهایی هەر بۆ خودا باشە.

تەنوور (ن.) لەقوڕە بۆ نان پێوەنان: نانی تەنور خۆشە.

تەنویر (ن.) تەندوور. نانپێژ نانی ژ تەنویری چێ دکەت.

تەنیا (ئان.) ١- تـەنها ژیـان: لەماڵـەوە بەتـەنیا دەژی. ٢- تاقانـە: تـەنیا کچێکی هەیە.

تەنیا (ن.) ١- تـەنها، بێهـاودەم، بـەتاك کـەوتن: پیرەمێردەکـە بـە تـەنیا ژیـان بەسـەردەبا.٢- نـاوی کچـانو کـوڕان: تـەنیا عـارەب حەیرانبێژێکی باشە.

تەنیا( ئاك.) تەنها، بەس: تەنها بەخۆی هات.

تەنیشت (ئاك.) ١- لا کەلەکـە: ئـەو لا تەنیشـتەم ژان دەکـات.٢- نزیـك: لەتەنیشتمەوە دانیشتووە.

تەنیشت (ن.) کەلـەك، کێلـەك، کەمـەر، پارچـەیەکە لـە لەشـی مـرۆڤ و گیانلەبەر. ژانا گوڵچیسکێ تەنیشتا مرۆڤـی دگـەل دئێشیت. تەنیشتم هیلاکی کردووم. (ئان.) لا، رەخ: من و ئامۆزاکەم لە تەنیشت یەك دانیشتووین.

تەنینەوە (چ.) داگرتن، بلاْوبوونەوە: ئەو ئاگرە لە تەنینەوە دایە.

تەواو (ئان.) ١- تـەمام بێکـەم و کـوڕی: خۆزگـە نووسـینەکەم تێـر و تەواوبێ.
٢- نـەمان: کارەکـەی زوو تـەواو کـرد. ٣- مـرد، برینـدار بـوو، دوایی تەواو بوو.

تەواوبوون (ك.ل.) تـەواوکردن: ١- ڕاسـت بـوون: ئـەوان تـەواو بـوون. ٢- کۆتـایی هاتن تەواوبوونی کارەکە زۆری نەماوە.

تەواوکردن (چ.) نـــەمام کـــردن بـــێ کـــەم و کـــوڕی: وشـــەکانی فەرهـــەنگم تەواونەکردووە.

تەوەر (ن.) ١- چەقی گۆی زەوی: زەوی لە دەوری تەوەری دەسووڕێتەوە. ٢- لا: لە دوو تەوەرەوە هێزشیان کردە سەرمان.

تەور، بیور: دار بە تەور دەبڕدرێتەوە.

تەورێز (ن.) تەبرێز شارێکە لە ئێران: تەورێز شارێکی خۆشە.

تەوێڵە (ن.) گـەوەڕ، شـوێنی بـەخێوکردنی ئـاژەڵ: ١- گاڕانەکـە گەڕایـەوە تەوێڵە. ٢- ناوچەوان: لەپیریا تەوێڵەی لۆچ بوبوو.

تەی (ئان.) ١- کەیی، رام: ئەم منداڵ چـەتوونە پێویستی بەتـەی کردنـە. (چ.) ٢- گەڕان‌و سووڕان، بڕین، ڕۆیشتن: بـۆ خوێنـدن ڕێگـای زۆری تەی کردووە.

تژی (ئاك.) پڕ، زۆر، گەلەك، مشە، زاف. گلاس تژی بوو.

تر (ئان.) ١- دیکـە، دی: یـەکێکی تـر بگـرە. ٢- لەگـەڵ وشـەی (لار، لاڵ) دەدرێتە پاڵ کەسێك کە لەکاتی ئاخاوتندا زمانی بگیرێ: ئـەم لاروترە چۆن دەتوانێ کۆڕ بگێڕێ؟ (پاگ.): ٣- دەچـێتە سـەر ئاوەڵناو بۆ پلەی بەراورد: کەوەکەی من باشتر دەخوێنێ.

ترار (ن.) ئامان، قاپ، سێنیکەکا کویر: ئاڤە ماست ب تراری یا خۆشە.

تڕاش (ن.) تەڕاش، درەخت، دارێکی نزمو بە لق‌و گەلاً: تـڕاش ژی دبیتـە دار)پەندە)

ترس (ن.) بـاك، وێـران‌و نـەوێران، سـام، سـاف: ترسـی ئـەوەمان هـەبوو نەبادا دوژمن شوێنمان هەلگرێ.

ترس (ن.و) ١- باك: بێترس هەوڵبدە. ٢- فێـراری، نەخۆشـی: لەمنداڵیـەوە ترس بەری نادات.

ترسان (چ.) ترسیان، دترسن ( کارێ رانەبردوویە.): زارۆك ژ دەنگێن بلند دترسن.

ترسان (چ.) نەوێران: ترسان دیاردەێکی سروشتییە.

ترساهندێ (ن.) ترسا وێ چەندێ، ترسا وێ یـەکێ: پشـتی سـەرهەڵدانێ ترسـا

هندێ ژ دلێ مە دەرکەڤت جارەکا دی دوژمن بشێت مە بئـیش نیت.

| | |
|---|---|
| ترشۆك (ن.) | ناڤێ گیایەکێ خۆرِستێ ترشە دهێتە خوارن. |
| تروسکە (ن.) | ١- بروسـکە، شـتی بـە هێـزو خێـرا: وەك تروسـکە بـۆ دوژمـن دەچین. ٢- رووناکی: تروسکەی چراکە دیارە. |
| تروکاندن (چ.) | ١- لێك نانەو کردنەوەی پێلوی چاو، نوقاندن و کردنەوە: چاو تروکانـدن نیشـانەی ترسـە. ٢- شـکاندنی هێلکـە لەلایـەن جووجکە و مریشکەوە: مریشکەکە هێلکەکەی تروکاند. |
| تریفە (ن.) | ١- تیشکی مانگ: تریفەی مانگ جوانە. ٢- ناوە بۆ مێ: تریفـە ئاواتی زۆرە. |
| ترین (ن.) | ١- تەنـدور، تـەنور: (پـاگ.): ٢- دەچـێتە سـەر ئاوەڵنـاو بـۆ پلەی بالاْ: باشترین سێو لەم باخەدا دەست دەکەوێ. |
| تشت (ن.) | کەلوپەل، شت، شتومەك: تشتێ نەدەتە بخودا نیڤەیێ دیتیێیە یان ییێ دزی یە. (پەندە)، زۆر تشتمان بۆ جەژن کرِی. |
| تشرینی دووەم (ن.ل.) | مانگی یازدەمە لەساڵی لـەدایك بوونـدا: لـە تشـرینی دووەمـدا بارانێکی زۆر باری. |
| تفەنگ (ن.) | چەکی لوول درێژ: دەستکارییکردنی تفەنگ دروست نییە. |
| تکا (ئاك.) | ١- دوعـا، پارِانـەوە، داوا لێ کـردن، خوایشـت، نـزا: تکـا دەکـەم بخوێنن. ٢- رژان، چۆرِانەوە، دلۆپە. تکەی خانووەکـە بێـزاری کردووم. |
| تکا (ن.) داوا: | تکـا بـۆ شـتی بـاش بکـە. — کـار: تکـای تکـا کـاران جێبـەجێ دەبێت. — کردن: پێویستە تکا کردن لە کەسی شیاو بکرێت. |
| تمەز (ئاك.) | وا دیـار ئـەدا، خوبایـە، بـە مەزەنـدە: تمـەز نیـازی سـەفەری هەبوو. |
| تنێ (ئاك.) | تەنیا، تەنها، بتنێ. تنێ ئەو بێت. |
| تۆ (ج.) | بۆکەسی دووەمی تاك: تۆ سوود بەخشی. |
| تۆ (ج.ك.) | ئەتۆ، ئەتو، تو، خۆت: تۆ بووی کتێبەکەی منت بردبوو؟ |
| تۆبە (چ.) | (وشەیەکی عەرەبییە کە دەچێتە فەرهەنگـو زمـانی کـوردی |

دەبێتە تۆبە کردن، پەشیمان بوونەوە، وازهێنان، گەڕانەوە: هەزار گوناه و یەك تۆبە.

تۆپ (ن.) ١- ئەو شتە خڕەی کە یاری پێدەکرێ: تۆپەکەی فڕێدایە دەرەوەی یاریگاکە. ٢- جۆرە چەکێکەو جۆری هەیە: تۆپێك بەر ماڵەکەی کەوتو خۆیو منداڵەکانی تیا چوون. ٣- شتی لوولدراو و بەسەر یەکدا، وەك قوماشو بەنو...تد: تەنها یەك تۆپمان لەو ڕەنگە ماوە.

تۆخ (ئان.) ١- پڕ ڕەنگ، ڕەنگ تێر، ڕەنگ تاریك: کراسێکی ڕەنگ سووری تۆخی لەبەر دابوو. ٢- تەواو، وشك: حزبییەکی تۆخە.

تۆران (چ.) زویربوون، زیزبوون، ڕەنجان: ژنەکە بۆ چەندەمین جارە دەتۆرێ.

تۆز (ن.) ١- ئەندازەی کەم: تۆزێ مانوبووم. ٢- بابردەڵەی خاك، غوبار: دارستان تۆز کەم دەکات.

تۆز (ن.) ١- بابردەی خاكو خۆڵ کە بە هەوادا بڵاو دەبێتەوە: ئەم کتێبانە تۆزیان گرتووە. ٢- ئەندازەیەکی کەم، بڕێکی کەم: با تۆزێکی لێ تام کەم بزانم چۆنە.

تۆز (ن.) خۆڵ، گەرد: تۆزی سەر تەلەفزیۆنەکەم سڕییەوە.

تۆزێك (ئان.) کەمێك، نەختێك، هەندێك، بڕێك: تۆزێك پارەم دەست کەوت.

تۆسقاڵ (ن.) کەمترین ئەندازە، نەختۆکەیەك، تۆزۆکەك: تۆسقاڵێك بەزەییت پێم دابێ.

تۆڤ (ن.) تۆو: تۆڤێ خوزیکان شین نابیت.(پەندە)

تۆف (ن.) ١- سەرمای زۆرو بارینی بەفرو باران.٢- هەڕەت، تاف، سەردەم: لەتافی لاوێتیدا زۆر ئازا بووم.

تۆف (ن.) ١- هەڕەت، تاف: لاوەکە لە تۆفی لاویدا لەسێدارە درا.٢- کڕێوە، باپێچ: زستانێکی باراناویو کڕێوەو تۆفە.

تۆفان، لافاو: لە هەندێ ناوچە تۆفان زوو هەڵدەکات.

تووشو شووم (ئان.ل.) سەختو ناخۆش: گەلێ ڕۆژگاری تووشو شوومان بەسەر

داهاتووه.

**تۆقاندن (چ.)** ترساندن، تیرۆرکردن، زراوبردی کردن: تۆقاندنی دوژمن کۆڵی به کورد نهدا.

**تۆڵه (ن.)** تۆڵه، وهرگرتنا مافهکێ خواری: کوردان تۆلا خۆ ل دوژمنی ڤهکر.

**تۆمارکردن (چ.)** نووسین له پهڕو دهفتهر دا: تێبینی یهکانم تۆمار کرد. قهید کردن: ناو کوڕهکهم لهمهکتهب تۆمار کرد.

**تۆو (ن.)** ١- تۆ: گهنم به تۆو دهچینرێ. ٢- سپێرم: منداڵ له سپێرم و هێلکهوه دروست دهبێت.

**تۆی دووبهرهکی (ن.ل.)** دوژمنایهتی لهنێوان چهند هۆزێك یان چهند کهسێك: تۆی دووبهرهکی وڵاتی وێران کرد.

**توانا (ن.)** ١- توانست، هێز، تاقهت: توانای من بهقهد ئهو کاره نییه. ٢- ناوه بۆ نێرینه. توانا خهڵکی دێکهی ئهوبهر.

**توانهوه (چ.)** تاوانهوه، لهڕهقیهوه بۆ شل، حهل بوون: بهفری شاخ توایهوه.

**توانج (ن.)** سهرکۆنه، تانهو تهشهر، تیروپلار: توانج گرتنه خهڵك کارێکی دزێوه.

**توانین (چ.)** توانست، له وزهدا بوون، تاقهت بهسهردا شکان شهنگ: ئهم کاره توانینی باشی دهوێ.

**توند (ئاك.)** بهتاو، بههێز، بهگوڕ، خێرا، به تین: بایهکی توند ههڵیکرد.

**تووتن (ن.)** رووهکێکی گهڵا پانه بهداو دهکرێ بۆ جگهره بهکاردێت: تووتن زیانی زۆره.

**تووڕهبوون (چ.)** زیزبوون، سل بوون: کوڕهکه له باوکی تووڕهبووه.

**تووش (ئان.)** ١- ههوای زۆر ساردو باراناوی: ههورێکی تووشی هێناو دواتر دایکرده باران. ٢- پیاوی بێ ئاکارو خولق نهخۆش: پیاوی تووشو تووڕه کهس بهلایدا ناچێ.٣- ئهسپی چهمووش: ئهسپی تووش کهس بهلایدا ناچێ.

**تووشبوون (چ.)** بهرهنگاربوون، بهرکهوتن، پێڤهچوون: بهرڕهڤان تووشبوو.

**تووشهاتن (چ.)** ١- ڕووبهڕوو بوونهوهو بهیهك گهیشتن: لهبازاڕ تووشی هاتی؟

٢- گرفتارو گیرۆده بوون: ئەو خۆی وانییە، تووش هاتووە.

**توون (ن.)** ١- ئاگردانی گەرما: توونی دیوەخانەکە ڕێکخرایەوە. ٢- وەکو جەهەنەم: نەی کەی بە توون.

**توێکڵ (ن.)** تۆکڵ، توفل، تێخۆڵ، بەرگ، قەپێلك: تـوێکڵی زەوی لـە چـەند چینێك پێکهاتووە.

**تێ گەیاندن (چ.)** ١- فێرکردن: مامۆستا وانەکەی تێگەیانـدین. ٢- حـالی کـردن: ئێستا لەژیان تێگەیشتم.

**تێ کۆشین (چ.)** تە تە لادان، ماندوبوون: تێکۆشینی گۆران بۆ ئەدەب زۆرە.

**تێ هەڵدان (چ.)** لێدان، شەق لێدان: زۆربەی کورد حەپس و تێ هەڵدانی دیوە.

**تیایا (ئاك.)** لەناویا، تێدا: ئەم ماستە موویەکی تیایە.

**تێپەڕ (ن.ب.)** ١- بـوردن، رابـردن: وەرە بێـرەدا تێپـەڕە. ٢- جـۆرە فرمانێکـە پێویستی بە بەکارە.

**تێپەڕین (چ.)** رۆیشتن، رەتبوون: سوارەکان بێرەدا تێپەڕین.

**تێخوڕین (چ.)** بەقەد دواندن، قیژاندنە سەر: تێخورین کارێکی ناشیرینە.

**تیژ (ئان.)** ١- خێرا، بەگوڕ، بەخوڕ: بایەکی تیـژی لێ دەهـات. ٢- بـەمانای خواردنی ئەو شتانەی تامیان تیژە وەك بیبەر و بەهارات.

**تیژکردن (چ.)** ١- هاندان: دەسـتی لەتیـژکردنی مەسـەلەکە هـەبوو. ٢- چـەقۆ تیژکردن: زووزوو چەقۆی تیژ دەکرد.

**تێر (ئان.)** ١- ڕەنگی تاریكو تۆخ: حەزم لە ڕەنگی سـووری تێـرە. ٢- پـڕ بـە دڵ، تـەواو: تـا تێـر تەماشـای ئـەو دەشـتو دەرە نەکـەین نـاڕۆین، چـونکە دیمەنـەکان زۆر جـوانن. ٣- زگ پـڕ: دیـارە تێـری بۆیـە نـان نـاخۆی.٤- پـڕ، زۆر، مشـە، مەنـد، زەوییەکـە تێرە.

**تێر (ئان.)** تەسەڵ، تەژی، پڕ: دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە.

**تیر (ن.)** ١- ئەوەی بە کـەوان دەهاوێشـترێ: تـیر چـەکێکی کۆنـە، ئێسـتا بەکار نایە. (ئـان.) ٢- خەسـت، پـەیت، تونـد: ماسـتاوی تـیرو سارد لە هاویندا بەتامە.

**تێر کردن:** مرۆڤی چاوچنۆك تێر کردنی ئاستەمە.

تیر هاوێژ (ن.) ١- ئەو کەسەی تیر بە کەوان دەهاوێـژێ: لـە شـەڕە کۆنەکانـدا هەمیشە تیر هاوێژەکان لـە پشـتەوە دەبـوون. ٢- کاریگـەریو حەسادەتی چاوی خەڵك. وە بەر تـیری مـام خـدری چاوپیس کوتییە.

تێروتەسەڵ: بە تێروتەسەلی ڕووداوەکەی بۆ گێڕامەوە.

تیرۆك (ن.) لەدارە بۆ نان پان کردنەوە: تیرۆکەکەی شکا.

تێربوون: تێر بوونی هەموو کەسێك ئاسان نییە.

تیرەشان (ن.ل.) دروسـت کردنـی شـانە لـە دەمـی دەفـرەوە راسـت بـۆ دواوەی دەفرەکە.

تێرخواردن: تێر خواردن بۆ جەستەی مرۆڤ بە سوودە.

تێرکردن (چ.) زگ پڕ کردن: ژیان هەر تێر کردن نییە.

تیرێژ (ن.) تیڕۆژ، تیڕۆژك، تیشك، هەتاڤ: خۆ نەدە بەر تیرێـژا رەشـەمەه و تیرمەهێ.

تێگەهشتن (چ.) زانین. تێگەهشتن بەری هەر تشتەکی دەبیە.

تێگەیشتن (چ.) حاڵیبوون. فامین: تێگەیشتنی پرسیار نیوەی وەڵامە.

تێڤە (ئام.) تێدا، تێیدا، د ژوورڤە: ئەو کۆلکێ مریشك تێڤە هەڕفت.

تیڤل (ن.) توێکڵ، قەپیلك، پەلك. تیڤلی هەناری مفایە.

تێك چوون (چ.) ١- خراپ بوون، شێوان و بڵاوبوون: پرسیارەکەم لێ تێك چوو. ٢- لەباری ئاسایی لاوان: مێشکی تێك چوو.

تێکۆشان (چ.) خـــەبات، هەوڵـــدانن کۆشـــش: تێکۆشـــان بـــۆ گـــەلو وڵات سەرفرازییە.

تێکۆشان (چ.) هەوڵدان، تەقالاً کردن: بە تێکۆشان دەگەینە ئامانج.

تیکە (ن.) پارچە، لەت، پاروو: تیکە نانێکم بە ماست خوارد.

تێکەڵ (ئان.) تێکەڵـە، تێکـەڵاو، دووتشـتان یـان پـتر بکەنـە دنـاڤ ئێکـدا: ڤوتابخانا تێکەڵ یا کوڕو کچانە.

تێکەڵکردن (چ.) ١- ئاوێتـەکردن: ڕەنگـی خۆڵەمێشـی لەتێکـەڵکردنی ڕەنگـی ڕەشو سـپیـیە.٢- لێکـدان: تێکـەڵکردنی ڤوتابخانـەی کچـانو کوڕان دیاردەیەکی شارستانێیە.

تێکدان (چ.) ١- خاپوور کردن، رووخاندن، بەسەریەکداهێنان: زۆربەی ئەو گوندانەی کە ڕژێمی بەعس تێکی دابوون چاك کراونەتەوە. ٢- ئاڵۆزکردنی کاروبار: بۆ بەرژەوەندی خۆت کار لە خەڵکی دی تێك مەدە. ٣- سەر لێشێواندن، بە لا ڕێدا بردن: ڕووداوەکە تێکیدام ئەگینا من خۆم بۆ سیمینارەکە ئامادە کردبوو. ٤- ڕاوەشاندن، شەقاندن: شەروبەکە باش تێکدە؟ ئینجا بیخۆرەوە.

تێکڕا ( ) بەیەکەوە، گشت: باتێکرا هەوڵی ئاشتی بدەین. ئەم بارە تێکڕا بەچەندییە؟

تێکسمڕاو (ئان.) کەتە، تێك چەقی، تێکچڕژاو، پڕو بەهێز: زانا کوڕێکی تێکسمڕاوە.

تیمار (ن.) ١- دەرمانی برین: برینداەکە تیمار کرا. ٢- ناوی دوو دێیە لە قەرەداخو سووورداش: برادەرەکەم خەڵکی دێی تیمارە. — کردن: تیمار کردنی برین پێویستە.

تیمارکرن (چ.) دەرمانکرن، دەرمانکردن، چارەکردن. ئەڤ برینە پێدڤیە بێتە تیمارکرن.

تین (ن.) ١- هێز، توانا، وزە، تاقەت: تینی تیا نەماوە. ٢- گەرمای تاو یان ئاگر.

تینوو (ئان.) مرۆڤ و گیانلەبەرو ڕووەك کە پێویستیان بە ئاو هەبێ: درەخت کە تینوو بوو وشك هەڵدێ.

تینوو (ئان.) هەر گیانداری بێ ئاو بێ: نەمامەکە تینووە ئاوی بدە.

تینووەتی شکاندن (چ.) ویستی زۆر بۆ شتێك، تینووی زانست، تینووی فێربوون، تامەزرۆو داخوازێکی زۆر بۆ شتێك هەبوون: ئەژدیهاك تینووەتی بە خوێنی مێشکی لاوان دەشکان.

تینووێتی (ن.و.) بێ ئاوی و تینوو: تینووێتی ناخۆشە.

| | |
|---|---|
| تێهن (ن.) | گەرماتیا ئاگری، گەرماتیا رۆژێ، تەوژم: تێهنا هەتاڤا پاییزو بهاران یا خۆشە. _ پێدڤییا لەشی بۆ ئاڤێ: تێهنا من ب ئاڤا گەرم ناشکێت. |
| تێورکان (چ.) | تێمروکان، تێئالأن. تێلەکان تێکورکاون. |
| تیوری (ن.) | بیردۆز: تیۆر زانست نییە. |
| تێوڵین (ن.) | تێگوشین، تریتە، نان لە چێشت گوشین: تێوڵینەکەم خوارد. |
| نەستەق (ئان.) | جوان، رێك، قسەی نەستەق و پەند یەك شت نین: ئازاد قسەی نەستەق دەکات. |

# ج

**جاجم (ن.)** تەنراوێکە لەخوری مەڕ یان بزن دروست دەکرێ بـەخۆدادەرێ: جاجمەکە جوان چنراوە.

**جادوو (ن.)** سیحر: هیچ کارێك بەجادوو سەرناکەوێ.

_ کەر (ن.ب.) سیحرباز: جادووکەر باوەڕیان نی یە

**جار (ن.)** ١- کەرەت، هەل: دووجار هەڵەم کرد. ٢- وەخـت، کـات: جارجـار دەچیتە دەشتەوە. - یێـك (ئـان.) یـەك جـار: بـۆ جارێـك قسـەی بـاش بکـە. زۆر - (ئـان.) گـەلێ جـار، چـەندین جـار: زۆرجـار ئامۆژگاریم کرد.

**جاران (ئاك.)** پێشان، کاتی خۆی، لە پێشاندا، لە رابردوودا: جاران خزمایەتی بەهێز بوو.

**جاڕدان (چ.)** بانگـەواز، بـانگ کـردن، ڕاگەیانـدن، گاشـە، هـەرا و هەنگامـە: دوژمن هێرشی جاڕ دا بۆ سەرمان.

**جاڕچی (ن.ل.)** ڕاگەیەن، ڤاوکەر بۆ دەنگوباسێك: جاڕچی هات.

**جاروبار (ئاك.)** هەندێك جار، کەم کەم: جاروبار سەردانیان دەکەم.

**جاریۆتەر (ئاك.)** جارێکی تر: جاریۆتەر وشەیەکی هەورامی یە.

**جاسوس (ن.ب.)** زواتگیر، خەبەر دز: (هەموو کاتێ جاسووس هەبووە).

**جان (ن.)** گیان: پێشمەرگە جانفیدانـە. (ئـان.) جـوان، رنـد، خـن، گـەنج: سـویلاڤ تشـتەکێ جانـە: بەشەسـتی زولـفـو رووی مـاهی وەکـو ماهی گرفتارم. گەهی دڵ گەستەی مارم، گەهێ جان خەسـتەی نارم.(حاجی قادری کۆیی)

**جانتا (ن.)** جانتا جوانەکەم کڕی.

**جەژن (ن.)** ١- خۆشی لەبۆنەکانی نەتەوە: جەژنی نەورۆز پیرۆزە. ٢- خۆشی لە بۆنەکانی ئاینی: جەژنی قوربان هی اسماعیل پێغەمبەرە.

**جەرگ (ن.)** جگەر، کەزب: منداڵ وەك جەرگ وایە._ بڕان (چ.) بەسەرهاتی پڕ لەخەم، بوونی بەڵای گەورە: بەشەهیدبوونی رۆڵەکەی جەرگی بڕا. جەرگ سووتان: کۆچ کردن منداڵ مردن، لێی مەگرە ئەو جەرگی سووتاوە.

**جەرگە (ن.)** ناوەڕاست، دوڕ: جەرگەی شار شوێنی ئەم دوکانانەی لێ نابێتەوە.

**جەسوور (ئان.)** مەرد، ئازا، زیرەك، لێوەشاوە: کورد گەلێکی جەسوورە.

**جەلەب (ن.)** جەلەبێکی زۆریان بەر تۆپبارانەکە کەوت. ( رانەمەڕ.)، ئەو قەسابەی جەلەبە نەك قەسابی گۆشتفرۆش.

**جەم (ئاك.)** نك، دەڤ، کن، لا. نەچە جەم مە بە.

**جەناب (ئان.)** بەرێز، گەورە، قوربان: جەنابی وەزیر سەردانی کردین.

**جەنجەڕە (ن.)** جەنجەڕ، تەوری چکۆڵە: جەنجەڕەکەی ماڵی ئاسۆ شکاوە.

**جەنگ (ن.)** شەڕ، هەراو لێکدان، ئاژاوەو پشێوی، ئاشوب: جەنگ کاریگەری خراپی لەسەر دەروونی کۆمەڵگاوە دەبێ.

**جەنگاوەر (ن.د.)** شەڕکەر، چەکداری بەشداربوو لە شەڕ، پێشمەرگە: جەنگاوەری کورد ئازان.

**جەنگی گێتی (ن.ل.)** شەڕی جیهان، دوژمنایەتی: جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٤ هەڵگیرسا.

**جەور (ن.)** ستەم، زۆرداری: خەڵك لە زمانی جەورو ستەم بە ئاگا هاتووە، زیاتر خەڵك ناترسێنێ.

**جەوهەر (ن.)** هونەر و لێ هاتن: جەوهەر لەچاوی دا دیارە.

**جڕوجانەوەر (ن.ل.)** دەعبا، گیانلەبەر، مێش و مەگەز، ئەم شوێنە پڕی جڕوجانەوەرە.

| | |
|---|---|
| **جریوه (ئاك.)** | **١- بریسكه، ورشه، تیشكدانه‌وه: ئه‌ستێره جریوه‌یان ده‌هات. ٢- ده‌نگی مه‌ل: جریوه‌ی مه‌ل خۆشه.** |
| **جگه (ئام.)** | **بێجگه، ته‌نیاهی نه‌بێ، جیا، جودا: نامه‌كانم بۆ هات جگه له نامه‌ی تۆ.** |
| **جگه‌ره (ن)** | **جغاره، سیگار: جگه‌ره‌كێشان به زیانه.** |
| **جگه‌ره‌كێشان (چ.)** | **جگه‌ره‌خواردن: جگه‌ره‌كێشان زیانی بۆ باری ته‌ندروستی زۆره.** |
| **جل (ن.)** | **١- به‌رگ‌و لیباس، جلك: پێش ده‌ستپێكردنه‌وه‌ی قوتابخانه جلی بۆ خۆی كڕی. ٢- ئه‌وه‌ی له‌سه‌ر پشتی باره‌به‌ره، كورتان:** |
| **جڵه‌و (ن.)** | **هه‌وسار، قامچی لكاو: جڵه‌وی ئه‌سپه‌كه بگره.** |
| **جڵه‌وشل كردن (چ.)** | **به‌ڕه‌ڵاكردن: جڵه‌وی بۆ خه‌یاڵی شل كردبوو. خۆ دانه‌ده‌ست: زیاتر له‌گه‌ڵی بدوێ شل ده‌كات** |
| **جڵه‌وكێش (ن.ل.)** | **سه‌ركێشی‌كردن، سه‌ركردایه‌تی كردن: ئازاد جڵه‌وكێشی خزمان ده‌كات.** |
| **جلك (ن.)** | **جل، جل‌وبه‌رگ: بنیات داره جل ستاره.(په‌نده)** |
| **جنێو (ئاك.)** | **جوێن، قسه‌ی ناشیرین، جوون، خه‌به‌رێت ناخۆش: جنێو فرۆش مه‌به.** |

جه ( ن.) شوێن، جێ، جێگا: بزن بۆ شەڤەکێ جهێ خۆ خۆشدکەت.(پەندە)

جهان (ن.) جیهان، گێتی، دنیا، دونیا.

جۆ (ن.) جۆك، جۆگە: سەرۆکانی یا شێلی بیت ئاڤا جۆیان زەلال نابیت. (پەندە) خوون ژ دال جۆجۆ رەوان تێ، وەك عەقیقێ ئەرخەوان تێ لێ ژ دەست سەلوا جوان تێ، ئەو شەپالا شەنگوشۆخ (وەلایێ جزیری). (ن.) جەهـ: جۆ دەکرێتە نان.

جۆت: ١- دوو، دوو تاك، جمك، جووت: ژمارەی جۆت ئەو ژمارەیە کە بە سەر (٢) دابەش دەکرێت.

جۆر (ن.) تەرز، شێوە، ڕەنگ، چەش، بابەت، تەحر: کارگەکەیان چەند جۆرە مافوورێك بەرهەم دەهێنێت.

جۆش (ن.) کوڵ، قوڵپی ئاوی گەرم. ئەو زۆر بەجۆش کەوت.

جۆش سەندن (چ.) ١- گەرمبوونی ئاو، گەرمبوون: ٢- گەرم بوونی کۆڕی بەزمو مۆسیقا: تەگبیر کردن بەبێ دەنگ، جۆشێك بدەن وەکو هەنگ ئەسبابی شەڕ پەیا کەن، تۆپو تفەنگو هاوەن (حاجی قادر)

جۆگە (ن.) ئاورێ ی باریك، جۆگەلەی ئاو: لەجۆگەکە دا دەستنوێژم شووشت.

جواڵ (ن.) جهال، جواڵ گوشێکە لە موو دروست دەکرێ.

جوامێری (ن. و.) ئازایەتی و پیاوەتی: جوامێریی کورد لە ڕادەبەدەرە.

جوان (ئان.) ١- قەشەنگ، دەلال، ڕازاو، شەپاڵ، شەنگ، شۆخ، رەند، جان، رەندە، سپەهی، خن: کچێکی جوان بەدەرکەوت. ٢ — لاو، گەنج، تازەپێگەیشتوو: کوڕە جوانەکان دەستەدەستە بەرەو هەندەران دەڕۆن. ٣- پەسند: مامە پیرە ئامۆژگارییەکانی جوانن. ٤- ناوی کچانە: جوان هاتە ئێرە.

جوانەمەرگ (ئان.) کەسێ بەگەنجی بمرێ: کورد شەهیدانی جوانەمەرگی زۆرە.

جودا (ئان.) جیاواز، جیا، جویَ: مـن زووتـر دیَمـەوە چـونکە کـارم جودایـە لەوان.

جودا بوونەوە (چ.) ١- جیا بوونەوە، لەیەك بوونەوە: جودا بوونەوەت لـە بـرادەری خـراپ کـاریَکی باشـە. ٢- تـەلاَق: ئـەوان بـە یـەکجاری لەیـەك جوودابوونەوە.

جوداکردنەوە (چ.) هـاویَرکردن، جیاوازکردنـەوە، لەناویـەك دەرهیَنـان: کتیَبـەکانم لە یەکتر جودا کردنەوە.

جونبوش (ن.) کەیف و زەوق و جوولان: مندالَەکانی هیَنایە جنبووش.

جونەیهی ئیستەرلینی (ن.ل.) ناوی پارەیە بەریتانیـە: سـەد جونـەیهی ئیسـتەرلینیم خـەرج کرد.

جووت (ئاك.) ١- زەوی کـیَلاَن بـە گـا جـۆت: ئـازاد جـووت دەکـا. ٢- بـۆ شـتیَك دەوتریَت دوو دانە بیَت (ئان.) جووتیَك گۆرەویم کڕی.
٣- زەوی کیَلاَن: جووتیَکی باشی کردووە.

جووتیار (ن.) جۆتیار، جووتکار، کەسـیَ کـە خـەریکی کیَلاَنـی زەویو وەبـەر هیَنانییەتی: جووتیارەکە زەوی دەکیَلَیَ.

جووقە (ن.) هەست و خوست، دەنگ ونڕاو تقە: جووقەی لیَ بڕاوە.

جوولاَن (چ.) بزووتن، تەکان، لڤین، بزاوت: تا تـەواو بـوونی کۆڕەکـە نەمـدی بجوولَیَ.

جوولاَندن (چ.) بزوانــدن، تەکانــدان: شـیعرەکەی دلَو دەروونــی هــەمووانی جولاَند.

جوولَە (ن.) بزووتن، تەکانەخواردن: بەرانبەرم دیَت بیَ جوولَە بن.

جیَ (ن.) ١- شـویَن، جیَگـا: کـەرکووك جیَـی لـە دایـك بوونمـە. ٢- بـەش: گۆشتەکە جیَ جیَ هەلگرە.

جیَ (ن.) شویَن، جیَگا: لە جیَی شیَران ریَوی دەکەن گیَران.

جیَ شانە (ن.ل.) ناوی گوندە: جیَشانە گوندیَکە لە کوردستان.

**جێ نزرگە (ن.)** شوێن، هەوار، گۆڕی پیاوچاکان، جێ ی نزا و پاڕانەوە: کوردستان زۆر جێ نزرگەی پیاوچاکانی تیایە. سەرچاك، چاك.

**جیاکردنەوە (چ.)** ١- جیاکردنەوەی دووشت، دوورخستنەوە: خۆی لەنیشتمان جیاکردەوە. ٢- جیاوازی لە نێوان دووان: جیاواز: جیاکردنەوەی ئەو دووە زۆر یارمەتیدەرە.

**جیاوازی (ن.د.)** جودایی، جیاکردنەوە: جیاوازی چیە؟ لەنێوان ناوی واتایی و بەرجەستە.

**جیڕە (ن.و.)** دەنگێکە لەهەندێ شت دێت: بەردەوام جیڕەی قەلەمی دەهات.جیڕەی دەرگا کۆنەکە بێزاری کردووین.

**جێگا** بریتی، پایە: شوان لە جێگای باوکی دایە.

**جێگە:** شوێن ئەوان بێ جێگەن.

**جێنشین (ن.)** ١- نیشتەجێ بوون: عەرەب بە زۆر جێنشینی کەرکووك کران. ٢- خەلیفە: چوار جێنشینەکە لای هەموو کەسێك ناسراون.

**جیهان (ن.)** ١- دونیا: جیهان پان و بەرینە.٢- ناوی ژنانە: جیهان ژنێکی کابانە.

**جیهان (ن.)** دونیا: لە دوو جەنگی جیهانیی بەشداریکردووە.

**جیهانگیر (ن.ل.)** ١- گێتی گر، بۆ شاهەنشایان و هەوریش بەکار دەبرێ. جەنگیزخان ناسراوە بەجیهانگیر. ( عەولەمە). ٢- ناوی کوڕانە: جیهانگیر کەسێکی ڕووناکبیرە.

# چ

چ (ئام پ.) چی.١- چ بکەیە کارێ ئەو دێ هێتـە خـارێ (پەنـدە).٢- تـە چ گۆت؟

چ (ج.ب.) ١- لە جێگای ( یان ) دێت: چ بخوازی چ نەخوازی. ٢- چەند: چ خۆشـە ئـازادبوون. ٣- بـۆ پرسـیارکردن: چـت گـووت؟ ٤- هـیچ: چ جـاران نەچـوومە. ٥- لـە دوای وشـەوە بـۆ بادانـەوە: ئەم هیچ ئەو هیچ.٦- وشەی حاشا، بە واتای نەو: تۆ دەچیت بۆ شا، چ.

چا (ن.) ١- باش : چا بوو هات. ٢- چای: چـای سـیلان باشـترین چـایە. ٣- باش بوونەوە: نەخۆشەکە چاك بۆوە.

چاپەمەنی (ن.د.) بلاّڤـۆك، ئـەو شـتانەی لـە چـاپخانە بـلاّو دەکرێتـەوە: چاپەمەنی کوردی زیادی کردووە.

چاپووك (ئان.) زیرەك، ئازا، وریا، چەڵەنگ، زرنگ، لێهاتوو، گورچو گۆڵ: منداڵی چاپووك خۆشەویستە.

چادر (ن.) خێوەت، خێمە: لە سەیران چادرەکەمان هەڵدا.

چار (ئان.) ژ چوار، پشتی سـێ و بـەری پێنجـێ دهێـت.١- ئیمپریـالیزمێ کوردستان کریە چار پارچە. ٢- ساڵ چار وەرزە.

چار ناچار ( ) بێچـارە، تـەنگاو: ئـەو ناچـار بـوو بـڕوات. چـار: چارەسـەر، تەبیعەت چاری نییە.

چارە (ن.) ١- دەرەتان، هەل، بوار، فرسـەت: ئەگـەر چـارەم هـەبێ ناچـم. ٢- بەخت، تالاٌ، نێو چاوان: دیـارە لـە چـارەمدا نـەبووە، بۆیـە وەرنەگیرام. ٣- عیلاج، چارەسەر: دەبێت بەزوویی چـارەیەك بۆ کێشەکەمان بدۆزینەوە.

چارەنووس (ن.) ١- بـەختو هـات: چارەنووسـی وابـوو. ٢- ئاینـدە، دوا ڕۆژ: دەبێ گەل خۆی چارەنووسی خۆی دیاری بکات.

چارپایە (ن.ل.) تەختی لەسەر نووستن: منداڵەکە لەسەر چارپایە نووستووە.

چاڤ (ن.) چاو، چەعف، چەهڤ. دیتنا چاڤان سۆتنا هناڤان (پەندە).

چاك (ئان.) باش: کاری چاك دڵخۆشکەرە.

چاك بەلاداکردن (چ.) قولێ شاقەلێ هەڵماڵین، بەگورجی دەست بـەکار بـوون. کوڕانی کورد چاکیان کرد بە لادا.

چاك بوون (چ.) چابوونەوە، لە نەخۆشی هەستانەوە.

چاك: سەر قەد نزارگە. دەچنە سەر چاکی.

چاکبین (چ.) دڵ روون، گەشبین، هزر باش: چاکبینی سەرمان دەخات.

چاکە: چاکە لە خراپە باشترە.

چاکەکردن: چاکە کردن ئەنجامی باش دەبێت.

چاکردنەوە (چ.) چاکردنەوەی شتی خرابوو: تەلەفزیۆنەکانم چاکردنەوە.

لێ چاکردن (چ.) تێکەڵاوکردنی نێرو مێی ئاژەڵان بـۆ زاوزێ: ماینەکەیان لە ئەسپەکە چاکرد.

چاکی ( ن.و.) + ی: باشی، چاکە: چاکیێ بکەو ب ئاڤێدا بەردە.(پەندە)

چاڵ (ن.) قۆڵت، بیر، قۆپاو، رۆچوو: ئاگادار بە نەکەویتە چاڵەوە.

چالاکی (ن.د.) چوستی، لەش سووکی: ئەو زۆر چاڵاکە.

چاندن (چ.) ١- تۆو بەزەوی کردن، ڕوانـدن: چ بچینی ئـەوی دەدووری. ٢- چەقاندنی شەتڵ و نەمام: نەمامەکە جوان بچێنە.

چاو (ن.) ١- دیدە، چاڤ، ئەندامی دیتن: هەر چـەندە بـە تەمەنـە بـەلاّم چاوەکانی باشن. ٢- پارەی مەغۆڵەکان. (ك.) ٣- بە دووبـارە کردنـەوەی (چـاو چـاو)، تەماشـاکە: چـاو چـاو چ نمرەیـەکی بەرزی وەرگرتووە. چاو باز: ئاشقە چاوبازەکە هات.

| | |
|---|---|
| چاو تێ بڕین (چ.) | مێزکردن، سەیرکردن، تەماشاکردن، تەماح تێ کردن: چاوی دە دیمەنەکە بڕیوە. |
| چاو شۆڕ (ئان.) | خەجاڵەت، چاو بەرەژێر، تەریق بوونەوە، کەسێك کە کارێکی خراپی کردبێ: هەوڵ بدە چاوشۆڕی کەس مەبە. |
| چاو لێ کردن (چ.) | لاسایی کردنەوە: چاوی لە ڕەوشتی باش کردەوە. |
| چاو نەترس (ئان.) | ئازا، بە جەرگ، بوێر، دەست دانەهێن. بەڕاستی پێشمەرگە چاونەترس بوون. |
| چاوئێشە (ن.د.) | ژانی چاو، نەخۆشی چاو: چاو ئێشەی منداڵەکەم چارەسەر کرد. |
| چاوتەنگ: | برسی، ڕژد، هین چاو تەنگە. |
| چاوترسێن: | ترسێنراو، منداڵەکە چاو ترسێن کراوە. |
| چاوەڕوان (ئان.) | بریتییە لە زۆر چاوەڕانیکردنی کەسێك بۆ شتێك: هەر چاوەڕوان بووم، بەڵام بێهودە بوو. |
| چاوەڕوان کردن (چ.) | چاوەڕێ کردن، چاولەڕێ بۆ هاتن: چاوەڕوانکردن بارێکی دەروونی پڕ نیگەرانییە. |
| چاوتروکاندن: | ماوەیەکی زۆر کورت، گەلی کورد لە چاو تروکانێکدا رژێمی بەعسی راماڵی. |
| چاوترووکان (چ.) | ماوەیەکی زۆر کورت، چرکەیەك: بە چاوترووکانێك کارەکەی جێبەجێ کرد. |
| چاوەش (ن.) | ١- گۆرانیبێژ، شایەری هەڵپەرکێ، زورنا ژەن: چاوەشێکی باشیان بۆ شاییەکە هێنابوو.<br>٢- باش چاوەش و سەر دەستەی چەند کەسێك، پلەیەکی ئەفسەری کۆنە. |
| چاوەش: | ئاهەنگ گێر، هاجەش شایەر، چاوەشەکان ئاهەنگیان گێڕا. |
| چاوەچاو: | چاو گێڕان، پیاوەکە چاوە چاویەتی. |
| چاوەوەڕوان: | چاوەڕێکەر، جۆرە یارییەکی منداڵانە، چاوەڕوانی ناخۆشە. |
| چاوتێبڕین: | سەیرکردن، تەماشا کردنی حەرام، چاو تێبڕین لە ماڵی خەڵکی باش نییە. |

| | |
|---|---|
| چاوتیژ: | باش دەبینێ، ئازاد چاوی تیژە. |
| چاوتێر: | مەرد، سەخی،سیروان مرۆڤێکی چاو تێرە. |
| چاوپۆشی (ن.ب.) | بریتییە لە بووردنی تاوانی یەکێك: مرۆڤی ڕۆشنبیر چاوپۆشی لە هەڵەکانی خەڵکی دەکا. |
| چاوپۆشین: | بهرون، چاو پۆشین لە کاری خراپ باش نییە. |
| چاوپیس: | چاو پیسی ڕەوشتێکی باش نییە. |
| چاوپێکەوتن: | دیدار، ڕۆژنامەنووسەکە چاوپێکەوتنەکەی ئەنجامدا. |
| چاوجوان: | کەسی چاوجوان، منداڵەکە چاوی جوانە. |
| چاودێر: | ئاگا لێبوو، چاودێریکردنی منداڵ گرنگە. |
| چاودێری (ن.و.) | چاو لەشت بۆ ئاگاداری: چاودێری قوتابی یەکان بکەن. |
| چاوڕەش: | براکەم چاوی ڕەشە. |
| چاوشارکێ: | منداڵان چاوشارکێ دەکەن. |
| چاوچنۆك (ئان.) | ڕژد، ڕەزیل، چاوبرسی، بە تەماح، بەئیرەیی: مرۆڤی چاوچنۆك کەس خۆشی ناوێ. |
| چاوچنۆك: | ڕژد، مرۆڤی چاوچنۆك پەسند نییە. |
| چاوقایم: | بێ شەرم، منداڵەکە چاو قایمە. |
| چاوکاڵ: | نازدار کچێکی چاو کاڵە. |
| چاوکوێر (ئان.) | نەدیتوو، نابینا: دەستی چاو کوێران بگرن. |
| چاونەترس: | ئازا، بوێر، مرۆڤی چاو نەترس خۆشەویستە. |
| چاویلکە: | عەینەك، باپیرەم چاوی کز بووە چاویلکە لە چاو دەکات. |
| چەتاڵ (ن.) | چەنگاڵ: چەتاڵ بۆ خواردن بەکار بێنە. |
| چەتەوڵی (ن.و.) | ڕێگر: خۆزگە چەتەوڵی نەدەما. |
| چەتوون (ئان.) | ١- خوێڕی، ناکەس، بەد: تووشی پیاوێکی چەتوون هاتم. ٢- شیم: ئەو منداڵێکی چەتوون بوو. |
| چەپ (ئان.) | دژی ڕاستە: دل دکەڤیتە لایێ چەپێ ژ سینگێ مرۆڤی. (ن.) پێچ. |
| چەپۆك (ن.) | پانایی دەست: کە وای گوت چەپۆکێکی لێ دا. |

چەپەڵ (ئان.) گـەمار، پـیس، چـڵکن، گنجـاوگنج، قرێـژ: ڕق هـەلگرتن خەنجەرێکی چەپەڵە هەموو ڕۆژێك لە دڵتی دەدەی.

چەخماخ (ن.) ١- چەرخی ئاگرپێکردن: کورد چەخماخی دروست دەکرد. ٢- متەنەزمەی تفەنگ: چەخماخی تفەنگەکە ژەنگی گرتووە.

چەخماخ سازی (ن.و.) دروسـت کردنـی چـەخماخ و کارگەکـەی: چـەخماخ سـازی لەسلێمانی هەبوو.

چەرخ (ن.) ١- زەمانـە: چـەرخی زوڵـم و سـتەم ئـاوا بـوو. ٢- سـەد سـاڵ: چـەرخی حـوکمرانی مێژوویەکـە. ٣- چـەخماخ: چـەرخە کۆنەکەی فڕێ دا.

چەرموو (ئان.) سپی. دان چەرموو ڕۆمانێکی جاك لەندەنە.

چەرین (چ.) لەوەڕین، گیانلەبەری گیـاخۆر کـە گیـا دەخـوات: شـڤانی پـەز برە چەرینێ. گاڤانی گاڕان برە چەرینێ. (پەند)

چەسپاندن (چ.) جێگیرکردن، سەقامگیربوون، شوێن گرتن: توانـا لـە مەیـدانی خەبات خۆی چەسپاند.

چەشن ( ن.) جـۆر، تـەرز، وێنـە، ئـاوا: بـەفرین چـەند چەشـنە قەڵـەمێکی کڕی.

چەقۆ (ن.) کێرد: قەلەمبڕیش چەقۆیە.

چەك (ن.) ١- ئـامرازی شـەڕو جـەنگ: کاریگـەرترین چـەکی سـەردەم زانستو زانیارییە. ٢- ئەو بەڵگەیەی پارەی پێ وەردەگیرێ: پارەکەم بە چەك بۆ ناردووە.

چەکبازی (ن.) کـاری جـەنگاوەریو چـەك هـەلگری: چـەکبازی کـارێکی ناشارستانییە.

چەکدار (ئان.) چەك لەدەست : چەکدارەکە سەرپێچی یاسای کرد.

چەکمەچ (ن.) چەکمەچـە، خزینـك: مێـزا ب چەکمەچـە باشـترە ژیـا بـێ چەکمەچە.

چەکوش (ن.) چەکووچ: کاوەی ئاسنگەر بە چەکووش ئەژدەهاکی کوشت.

چەڵەمە (ن.) گرفت، کێشە، بـەلاَ، ناخۆشـی، دەرد، هـەرا: بـۆ هـیچ کەسـێك مەبە چەڵەمە.

**چەم (ن.)** چۆم، چۆلاو، گۆم، گۆماو: چەم بێ چەقەڵ نابێ.

**چەمانەوە (ج.)** داهاتنـــەوە، کۆمانـــەوە، کووڕبوونـــەوە، بـــەرەو خـــوار لار بوونەوە، داهێنانەوە: چەمانەوەی پشت نیشانەی پیرییە.

**چەماندن (چ.)** نزمکـرن، نـەویکردن، هێنانـە خـوارەوە، دچـەمێنن ( کـاری ئێستایە): هەمی سەرێ خۆ بۆ یاسایێ دچەمینن.

**چەمچەماڵ (ن.ل.)** شارۆچکەیەکی باشـووری کوردسـتانە: چەمچـەماڵ کەوتۆتـە نێوان شاری کەرکوك و سلێمانی.

**چەند (ئان.پ.)** بۆ پرسیارێ ژ ژمارەی دهێتە کرن و بەرسڤا وێ ب ژمارەیە: قوتابخانا هەوە چەند پۆلە؟

**چەند (ج.پ.):** چقاس، پرسیاری پێ لە دەستنیشانکردنی ڕادە دەکرێ: ئێـوە چەند کەسن لێرە؟

**چەند (ج.ب.)** چەنی، وشەی پرسە: چەند کەس هاتن؟

**چەوت (ئان.)** لار، خوار، دژی ڕاست: ڕوانگەی بۆ ژیان چەوتە.

**چەوت (ئان.)** هەڵە، ناڕاست، ناڕێك، لار، خوار، چەفت: کاری چەوت مەکە.

**چەور (ئان.)** ١- ڕوونـاوی، شـتێك ڕۆنـی پێـوە بـێ: خـواردنی شـێوی زۆر چەور بۆ تەندروستی باش نییـە. ٢- دەوڵەمەنـد، پـارە دار: موشتەرییێکی چەورمان بۆ هات.

**چەور کردن (چ.)** ١- هـــەنین بـــەڕوون، ڕوون تێـــدان: بـــۆ خاوکردنـــەوەی دەمارەکانی، پشتیان چەور کردبـوو. ٢- لێـدان: کـە هەنـدێکم چەور کردی، تـەمێ دەبـی. ٣- پـارەو بەخشـین پێـدان، پـارە پێدان: چەوری کە وازی لێبێنە.

**چەوسانەوە (چ.)** ئـازاردان، زەحمـەت دان: کـورد تائێسـتا دە چەوسـانەوە. چەوسانەوە دیاردەیەکی نامرۆڤانەیە.

**چەوسێنەر (ن.)** ستەمکار، زاڵم، جەور: هێزی چەوسێنەر هەر دەڕووخێ.

**چجار (ئاك.)** چجارا، چجاران، هیچ جارێك: چجار باوەڕ ژ دەورینی نەکە.

**چڕ (ئان.)** ١- جـیڕ: نانەکـە چـڕە نـاجورێ. ٢- لێـرەواری پـڕ دار: دارستانێکی چڕە. ٣- بەدەستەوەنەدان : چڕ دەرپێ یە. ٤- بانگ کردن: بچڕە با بێت. ٥- بەستنی توند، شەتەك: چڕی دە با نەکرێتەوە. ٦- هەورازی رژد، چیای رژد: هەورازەکە چڕە. ٧- دەموچاو: بنوارە لەو چڕو چاوە. ٨- پاشگرە بەواتای بێژ: لاوك چڕە. ٩- گۆرانی، لاوك: چڕێ بچڕە.
١٠ - پووشکە، چیلکە: ژنەکە چڕوچیلکە کۆ دەکاتەوە. ١١- دەنگ، لەگەڵ شیر دەگوترێ: دەڵێی چڕی شیرە.

**چرا (ن.)** ١- ئاگر، رووناکی، لەمپا، لالە، چراو: ئەگەر کارەباش نەبێ لەبەر چرا دەخوێنمەوە. ٢- ناوە بۆ مێینە.

**چرپاندن (چ)** قسەکردن بە نەرمی، بەدەنگی سەبر: لەگەڵ خۆیدا دەیچرپاند.

**چریسکانەوە (چ.)** بریقەدانەوە، درەوشانەوە: ئەستێرەکان دەچریکانەوە.

**چڵك (ن.)** قرێژ، کرێژ، پیسایی سەر جلكو سەر: هەوڵ بدە جلوبەرگت بە چڵك نەکەی.

**چڵکن (ئان.)** پیس و پۆخڵ، قرێژاوی، گەمار، کۆتی، شتێ کە چڵکی پێوەبێ: تەنها شێت چڵکنن.

**چمك (ن.)** دامەن، شاقەڵ: چمکی کراسەکەم دڕاوە.

**چنگ (ن.)** لەپ، چەپۆك، پەنجەکانی دەستی مرۆڤو گیانلەبەر: چنگە مێوژێکی برد.

**چنین (چ.)** جاران خەڵك بە کۆمەڵ دەچوون بۆ مازوو چنین.

**چۆڕین (چ.)** ١- ئاوڵێ تەواو بوون: ئاوی چەمەکە لە چۆڕینە. ٢- ئاولێهاتن: جلەکە ئاوی لێدەچۆڕا.

**چۆك (ن.)** ئەژنۆ: چۆك بۆ دوژمن دانانوێنین.

| | |
|---|---|
| چۆڵ (ئان.) | بەتاڵ: لە شوێنی چۆڵ تەنیا مەبە. — ەوانی: ژیان لە چۆڵەوانی خۆش نییە. — و هۆڵ: ماڵێکی چۆڵو هۆڵمان بینی. — پەرست: مام خدر چۆڵ پەرستە. — کردن: چۆڵکردنی شاخ لە پێشمەرگە خەوانی دوژمن بوو. — گە: لەم چۆلگەیەدا دانیشتین. |
| چۆڵ (ئان.) | بێ دانیشتوان، کەسێ لەوێ نەبێ: دێهاتەکانمان چۆڵن. |
| چۆڵ (ئان.) | شوێنی کەس لێ نەبوو، ئاقار، دەشت و دەر، سارا، بیابان: ماڵەکەمان چۆڵ بوو. |
| چۆلەکە (ن.) | تەیرێکی بچوکە، کێشکە: بەیانیان چریوەی چۆلەکە دێت. |
| چۆم (ن.) | چەم، رووبار: چۆمی خاسەی کەرکوك ئاوەکەی کەمی کردووە. |
| چۆنیەتی (ئاك.) | چلۆنایەتی: دایکم چۆنیەتی چێشت لێنانەکەی بۆ باس کردم. |
| چۆڕین (چ.) | ١- ئاولێ تەواو بوون: ئاوی چەمەکە لە چۆڕینە. ٢- ئاولێهاتن: جلەکە ئاوی لێدەچۆڕا. |
| چوارشانە (ئان.) | شان پان، قەڵەوبڵند: شێخ محمودی نەمر چوارشانە بوو. |
| چوارچێوە (ن.ل.) | چوار داری کەناری دەرگاو وێنە: چوارچێوەی وێنەکە جوانە. |
| چوارین (ن.) | هۆنراوەی چوار خشتەکی: چوارینەکانی خەیام بەناوبانگە. |
| چونکە (ئام.) | ئامرازی مەرجە لە ڕستەی ئاوێتەدا، لەبەر ئەوەی، بۆیە، چونکی، مادام، ژ بەر هندێ، چون، چونکو: چونکە نەتخوێند، دەرناچی. |
| چونکی (ئام.) | چونکە، چونکو، ژبەرکو، چمکو، چنکو: وێ سالێ دەرامەت گەلەکێ کێم بوو چونکی باران کێم بارین. بە ئالتوون کوڵمی ناسکی وەك گوڵ، ئەتوانن بەرن بەلاّم هیوای دڵ، کڕینی نیە وەکو ئەو گوڵە، چونکە نرخی دڵ تەنیا هەر دڵە.(کامەران موکری) |

چوون (چ.) ١- ڕۆیشتن: چوون بۆ قوتابخانە پێویستە. ٢- چوونە ناو: کۆترەکە چووە ناو هێلانەکەی. ٣- چلۆن، چۆنی: چوونی خاسی براکەم. ٤- وەك : گوڵ چوون ڕووی ئازیز نەزاکەت پۆشان .. وەفراوان چوون سەیل دیدەی من جۆشان. ٥- بەڕەواج بوونی پارەوپوول: چوونی دۆلاری ئەمریکی لەبازاڕدا ئاسایی‌یە. ٦- بێ وێنەو نەمر: قەسەم بە خوای بێ چوون. ٧- سڕبوون لە سەرما: دەستەکانم لەسەرما چوون.

چوون (چ.) ڕۆیشتن، شوێن بەجێ هێشتن: ئەوان بۆ شەقلاوە چوون.

چوونیەك (.) وەك یەك: دەبێ گەل چوون یەك بن بەرامبەر یاسا.

چی (ج.پ.) چی دەخوێنیتەوە.

چی (جێناو.) چ، کام، چشتێك، بۆچی، لەبەر چی: چی دەخوینیتەوە؟

چیا (ن.) کێو، شاخ، کەژ، چیا، کێڤ، کۆ: چیاکانی کوردستانی باکوور بەرزن. ناوە بۆ هەردوو ڕەگەز.

چیرۆك (ن.) بەسەرهات، حیکایەت، سەر گوزشتە، سەر بوردە: گۆڤاری گەلاوێژ چیرۆکی کوردی پێش خست. — نووس: محەمەد مەولود (مەم) چیرۆکنووسێکی بە توانا بوو.

چیرۆك (ن.) هەقایەت، حیکایەت، دەنگو باسی رابردوو، سەرگوزشتە، سەربوردە، ژانرێکی ئەدەبییە: چیرۆکی (چای شیرین) هەولێکی سەرکەوتوو بوو لە بواری چیرۆکی کۆمەلآیەتییەوە.

چێشتەنگاو (ن.ل.) کاتی هەتاو گەرم بوون لە پێش نیوەڕۆدا: میوانەکانی سلێمانی لە کاتی چێشتەنگاو گەیشتنە شاری هەولێر.

چێشتخانە (ن.) تێشتخانە، خوارنگەهـ: پێویستە چێشتخانە زۆر پاك و خاوێن بێت.

**چێکرن (چ.)** چاککردن، دروستکرن، دروستکردن، پێکینان. نان چەوا دهێتە چێکرن؟

**چیمەن (ن.)** ١- زەمینێکی سەوزە کە فریز داپۆشیبێ. ٢- ناوی کچانە: چیمەن کچێکی بالاٚ بەرزە.

**چیمەنتۆ (ن.)** کەرەستەکێ ئاڤاکرنێیە، تۆزە دگەل ئاڤێ تێکەل دکەن و روون دبیت و دگەل خیزی و ئاسنی خانویو کۆلانو گڤاندەوپرانو پێ چێدکەن: کارگەهەکا مەزنا چیمەنتۆیێ ل سەرچنار هەیە.

**چین (ج.ن.)** ١- قەد. ٢- جار، کەرەت: چەند چین پێم گوت وامەکە. نۆبە، ٣- ریزی دیوار: دیوارەکە تەنها چوار چینە. ٤- تیپ، دەستە، تاقم، توێژ، ریز، پۆل: ئەوان چەند چینێکن. ٥- چینی جلوبەرگ، لۆچی روو: چینە سوارێك بەرەو دیوەخان چوون.٦- ناوی ولاٚتێکە لە کیشوەری ئاسیا.

# ح

**حازر بەدەست (ئان.)** ئامادە بۆ بەکار هێنان: خواردنەکە حازر بەدەستە

**حاکم (ن.)** دەستەلاّتداری ولاّت، کەسێك کە لە سکالاّی خەڵك بپێچێتەوە: دەبێت حاکم نموونەی دادپەروەری بێت لە کۆمەڵگادا.

**حەتا (ئام.)** هەتا، تا، حەیا: حەتا بەرێ دەستی رەش نەبیت تاما دەڤی خۆش نابیت. (پەندە)

**حەپەسان (چ.)** سەرسورمان، واق ورمان، ئەبڵەق بوون: لەم کارە حەپەساوە.

**حەج (ن.)** کەعبەو ماڵی خوا، ئەوەی موسڵمانان ساڵانە ڕووی تێ دەکەنو پایەکی ئایینی ئیسلامە: لە سەردەمی کۆندا خەڵك بە ڕێبواری دەچوو بۆ حەج.

**حەدیس (ن.)** فەرموودەو گوتراوەکانی پێغەمبەر (د.خ). (هەندێ حەدیس هەڵبەستراون)

**حەڕام (ئان.)** ناڕەوا، بەد، نەگونجاو، رێ پێنەدراو. (مرۆڤ دەبێ حەرام و حەلاڵ لە یەکدی جیابکاتەوە).

**حەز (ئاك.)** ١- ئارەزوو، ئاوات، خۆزگە، هیوا، ویست، خواست: حەز دەکەم پاشەڕۆژێکی باشم هەبی.

**حەز (ن.)** ئارەزوو، ویست، خواست: حەزو ئارەزووەکانمان زۆرن.

**حەسەن ئاوا (ن.)** شوێنە لەسلێمانی: حەسەن ئاوا لەباشوری کوردستانە.

**حەشار (ن.)** شوورە، پەرژین، گەمارۆ، تانۆك: دوژمن ئێمەیان حەشارداوە. شاردنەوە. ئەوان ئێمەیان حەشاردا.

**حەچی ( ئان.ن.)** هەرچی، هەچیێ، هەرچیێ: نە حەچی سمبێل سۆرە هەمزاغایە. (پەندە)

**حەڤایەت (ن.)** چیرۆك، حەکایەت، داستان: حەڤایەتی کوردی خۆشە.

**حەکیم (ن.)** ١- ناوەکانی خوای گەورە: خودا عادل و حەکیمە. ٢- دادوەری

راست: دادوەرەکە حەکیمانە بوو. ۳- پزیشك، ئەو حەکیمە

حەلاڵ (ئان.) حەرار، ڕەوا، دژی حەرام، گونجاو، ڕێپێدراو. ئەوەی خوا ڕێی پێداوە حەلاڵە.

حەلەب (ن.) شارێکە لە کوردستانی سوریا: سابوونی حەلەب ناودارە.

حەلوا(ن.) هەلوا، شیرنیەمەنیەکە لە ئاردو ڕۆنو شەکر دروست دەکرێت: حەلوا تامی شیرینە.

حەمام (ن.) گەرماو، شوێنی سەر شووشتن: ئاوی حەمامەکەیان زۆر گەرم بوو.

حەمایەڵ (ن.) هەرچی ڕاستو چەپ دەمل بکرێ: حەمایەڵی شیرەکەی لەبەردایە.

حەمە (ن.) کورتکراوەو بچووککراوەی ناوی محەممەد: حەمەی برام پۆلی شەشەمی بری.

حەواڵەکردن (چ.) ناردن، هەناردن، بۆ: تاوانبار حەواڵەی بەندیخانەکرد

حەوانەوە (چ.) پشوودان: حەوانەوەی مرۆڤ لە نیشتمانی خۆی دەبێت.

حەواندن (چ.) حەوانەوە، دحەواند ( کارێ رابردوویێ بەردەوامە): خەڵکێ گونەدێن کوردستانێ ب ڕۆژان و ب هەیڤ و سالان پێشمەرگە دحەواندن.

حەوت (ئان.) حەفت، ژمارەی دوای شەش: هەفتە حەوت ڕۆژە.

حەوز (ن.) برك، جێ ئاو: لەسەر حەوزی ئاوە دانیشتین.

حەیف (ن.) مخابن، بەداخەوە. حەیف ئەو ئەوها دەرچوو.

حزب (ن.) پارت، ڕێکخراو، گروپ: حزبایەتی تەسك میللەتی هەراسان کردووە.

حقوق (ن.) ماف، بەش، حەق، پشك: ئاراس کۆلیژی حقوقی تەواو کردووە.

حکومەت (ن.) کارگێڕی، فەرمانڕەوایی، دەسەلاتداریتی: حکومەت ولات بەڕێوە دەبات.

حورمەت (ئان.) ڕێز: حورمەتی مێوانەکانی گرت. — گرتن: حورمەت گرتنی خەڵك ڕەوشتێکی باشە

حوکم دان (چ.) دادگایی کردن: ئێستا سەدام حوکم دەدەن.

حیکایەت (ن.) چیرۆکی فۆلکلۆری، میللی: داپیرەکان حیکایەت دەگێڕنەوە.

# خ

**خاپوور (ئان.)** ١- وێران، رووخا: ڕژێمی سەددام ولاّتی خاپوورکرد. ٢- چۆمێکە لەکوردستان: خاپوور دەکەوێتە کوردستان.

**خازتن (چ.)** خواستن، خوازتن، خاستن، داواکردن. دخازیت ( کاری رانەبردوویە.): یێ دخازیت روییەکێ رەشە، یێ نەدەت هەردووك.( پەندە)

**خاس (ئان.)** ١- چاك، باش، تایبەت، رند، تازە: تۆ کوڕێکی خاسی. ٢- کاهوو. ٣- گزی.

**خاشخاش (ن.ل.)** ١- پاوانەی بە زەنگۆڵ: خاشخاشی بووکەکە جوان بوو. ٢- ورد ورد: شووتیەکەی خاشخاش کرد.

**خاڵی (ئان.)** بەتاڵ، بۆش، ڤالا: خانووەکەیان خاڵی کرد.

**خامۆش (ئان.)** بێدەنگ، کز: ئاگرەکە خامۆش بوو.

**خامە (ن.)** ١- قەڵەم، پێنووس، پێنڤیس: بۆ دوژمن نوکی خامە لە شیر تیژترە. ٢- سەرشیر، سەرتوو: ماست هەر خامەکەی بەتامە.

**خان (ن.)** ١- خانوو، حاڵ، ئەو شوێنەی ماڵی تێدا دادەنرێ: بەم دواییە خانەکەیان نۆژەن کردۆتەوە. (ئان.) ٢- نازناوی دەسەلاّتداران: ئەحمەد خان، سەرداری قەلاّی دمدم بوو. ٣- بۆ ژن بەکار دێ بەمانای بەڕێزیو حورمەتیو ڕێكو پێکیو گەورەیی. (مەریەم خان، هەوەخان).

**خانەخۆ:** خاوەن ماڵ: خانە خوێیەکە لە ماڵە.

**خانەدان:** بنەماڵەی بەناوبانگو گەورە: ماڵی ئازاد خانەدانن.

**خانەڤا (ن.)** خانووێکی تایبەتە یادی خوای تێدا دەکرێ شوێن گوزەرانی

شــێخو جێنشــینەکانی یــادی خــودا دەکــەن: (موریــدان لــە خانەقاکان یادی خودا دەکەن).

خانەقا (ن.) سـۆفیگە، دەروێـش دان: خانــەقای مــەولانا خالیـد لـە شـاری سلێمانییە.

خانەقا: ١- بارەگاو شوێنی خوا پەرستی: ماڵمـان لـە نزیـك خانەقایـە. ٢- ناوی گەڕەکێکی کۆنی شاری هەولێرە.

خانەنشین (ن.ل.) تەقاویت، کەسێکە هەمیشە لە ماڵەوەبێو دەرنەچێ لـەکار دوور خراوەتەوە ( باوکم خانەنشین کراوە.)

خانەوادە: بنەماڵە، خێزان: خانەوادەی شەهیدان جێگای ڕێز لێنانن.

خانزاد (ن.) ١- خانــەدان، گـەورەماڵ، بنــەماڵ. ٢- نـاوی ئافرەتانــە: خـانزادی میری سۆران ئافرەتێکی ناودار بوو.

خانوو (ن.) خان، خانی. ئەوان خانووی خۆیان هەیە.

خانو (ن.) خانوو، ئاڤاهی. ئەوان چ خانوو نینە.

خانی — خانوو. باوکم دوو خانی هەیە.

خانی (ن.) نازناوی ئەحمـەدی خـانی یـە: ئەحمـەدی خـانی خـەڵکی گونـدی خانە.

خاو (ئان.) ١- تازی، کاڵ، ناکام، پێنەگەیشتوو: میوەی خاو مەخۆ. ٢- خـەو، نوستن. ٣- سست و بێهێز، شل بوونەوەی لـەش. ٤- نەڕێسـراو. ٥- جێگای مالأت لە زستان. ٦- چەرمی خۆش نەکراو.

خاوەن (ن.) خێو، ماڵخۆ، خودان: ولأتەکەمان خاوەن سامانێکی گرنگە.

خایاندن (چ.) پێ چوونی کات: ئاهەنگەکە سێ سەعاتی خایاند.

خایاندن (چ.) کات پێ چوون: ئەم نووسینە زۆری خایەند.

خەبات (ن.) ١- کۆشـش، هـەوڵ، تەقـەلاّ: ئـازادی بـێ خـەبات نـابێ.٢- نـاوە بـۆ هەردوو توخم.

خەبات کار ( ) کارکەر، بەکۆشش: ئەو خەباتکارێکی ناسراوە.

خەبات کردن، کۆشـش کـردن، هەوڵدان: خـەبات کـردن پیـاوی ئـازاو چـەڵەنگی دەوێت.

خەباتگێڕ تێکۆشەر: شێخ مەحمود خەباتگێڕێکی کورد بوو.

خەباتکەر (ن.ل.) کارکەر، بەکۆشش، تێکۆشەر: زانا خەباتکەرە.

خەبەر (ن.) ئاگا: خەبەر داری کارەکەیە. بە_ (ئان.) نەنوستوو: پاسەوانەکە بەخەبەرە.

خەتدان (چ.) ١- خەت لێدانی زەوی، باوە باو کردن: زەوییەکە خەتدەن تا شەتڵەکان داچێنین. ٢- موو لە ڕوو هاتن: ڕوومەتی تازە خەتی داوە.

خەتیرە (ن.) مەشخەڵ، چرا، بزۆت. هەڵکەن خەتیرە.

خەراپ بوون (ن.ل.) تێکچوون: ئەو نەمامانەی تۆ چاندبووت نەمامی خەراپ بوون.

خەراپ کردن (چ) رووخانــدن، تێکـدان: خانووەکـەیان خــەراپ کــرد. کردنــە ژن: کچەکەی خەارپکرد.

خەراپەکردن (چ) خەراپەکردن پەشیمانی لە دوایە.

خەرار (.) نجـەوال لـەموو، گـونیی: خـەڵکی لـەلا خـەرارە، بۆخۆشـی وەك دەوارە- ی سـفت (ن.) بــۆ دەغــڵ و دان- شــاش بــۆ تــووتن بەکاردێت.

خەرەفاو (ئان.) کەسێ: کە بیرو هۆشی وەك خۆی نەما بێت (خەرفایی): مرۆڤی خـەرەفاو قسـەو گوفتـاری وەك خـۆی نامێنێـت. بـاوکی هێنـدە پڕبووە خەرەفاوە.

خەریببوون (ن.) بیرهاتنەوە، بیرکردنەوە. خەریب دبیت ( کارێ رانەبردوویـە.): مـرۆڤ ژوان کەسان خـەریب دبیـت ئـەوێن خـۆش دڤـێن و ژێ د دویرن.

خەریك (ئان.) بــەکارەو مەشــول، ســەرگەر کارێــك یاشــتێك: ئێمــە خــەریکی فەرهــەنگ دانــانین.- ە (ك.) وەختــە، کــاتی هــاتووە: کارەکــە خەریکە تەواو ببێ.

خەریك بوون(چ.) سەرقاڵبوون : خەریك بوون بە کاری فەرهەنگسازی ئاڵۆزە.

خەریکە (ئاك.) نزیکـە، سـەرقاڵە: خەریکـە سـەر دەکـەوم. مـژیل: ئـەو خـەریکی کاری خۆیەتی.

خەفەت (ن.) خەم، غەم کەسەر: خەفەت بۆ ڕابردوو مەخۆ.

خەلافەت (ن.) جێنشین لـە حـوکم کـردن: حـوکمی خەلافـەت لـە پـاش کۆچـی

پێغەمبەر (د.خ.) دەستی پێکرد.

**خەڵەت (ن.)** هەڵە: دەبێت سوود لە خەڵەتەکانی خۆمان وەربگرین. — کردن: هەڵە کردن: نابێت خەڵەت کردن دووبارە بکرێتەوە.

**خەڵەتاندن (چ.)** فریودان، دەست خەڵەت دان:

**خەڵك (ن).** خەلق، مەردوم، کۆمەڵ: خەڵك ئەمڕۆ دڵشادن.

**خەم (ن.)** غەم، کول‌وکۆڤان، ئێش‌و ژان، دلتوندی، دلمان: نەخۆشی خەما خۆ بخۆ پاشی یا خەلکی.

**خەمڵ (ئاك.)** جوان، ڕازاوە: بەهار خەمڵیوە. چیری خۆنە خەملینە.

**خەملان (چ.)** ١- رازانەوە. ٢- قرساندن، مەزەندە کردن.

**خەملاندن (چ.)** مەزەندەکردن، قەیلاندن، پێوانەکردن: خەملاندنمان بۆ کارەکە تەواوە.

**خەملێن (چ.)** ١- خەملان، ڕازاندنەوە: دەریایەکە بەڕوناکی خەملیوە. ٢- قەرسان، بەراورد: بابەتەکەت چۆن خەملاند.

**خەنجەر (ن.)** تیخ: خەنجەر هاوڕێی کوردبوو.

**خەندقاند** ( کارێ رابردوویە.): دوژمنان گەلەك ژ کوردان و سەرۆکێن وان بێ گوناه خەندقاندینە.

**خەندقاندن (چ.)** خنکاندن، لەسێدارەدان، کوشتنا ب ئاڤێ، یان ب دەست و وەریسان ژ لایێ ستۆیڤە.

**خەو (ن.)** ١- نوستن، دژی بێداری: مندالان با زوو بخەون. ٢- لەکاتی نوستن دەبینرێ: خەوێکی خۆشی دیوە. _ هێنان (چ.) هۆیەك بۆ نواندن: ماستاو خەو دەهێنێ. _ الو: چاو بەخەو: کە قسەی دەکرد خەوالو بوو.

**خەو (ن.)** نڤستن، نووستن: خەوا دوی وەستیانێ زۆرا خۆشە: لەخەو هەستن درەنگە میللەتی کورد، خەو زەرەرتانە.. هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزل و هونەرتانە. (ئەحمەد موختار)

**خەوبینین (چ.)** ١- ئەوەی لەکاتی نوستن دەبینرێ: شەوانە خەو دەبینم. ٢- بۆ دواڕۆژو داهاتوو: خەو بە دوا ڕۆژی خۆی دەبینێ.

**خەوتن (چ.)** نوستن و چوونە خەو، دژ بێداری: خەوتن بۆ لەش پێویستە.

خەون (ن.) خــەو، ئــەو وێنــەو دیمــەنن ئــەوێن ل دەمــێ نڤســتنێ مــرۆڤ دبینیت.١- مرۆڤێ برسی نانی د خەونا خـۆدا دبینیـت.(پەنـدە). ٢- هەی یاران راستە یـا خـەو ئـەبینم؟ لەبـەد بـەختی خۆمـە وا ئــەمینم .. ئــەو کۆڵمــە ناســکەی لــە تــۆیێ سەرپۆشــا.. بــەبای پارێزی خەیاڵ ئەرووشا.( مەولەوی)

خەیاڵ (ن.) ١- فکـر، بـیر، هـزر: بەخەیاڵمـدا نایـەت ئەزیـەتی چۆڵەکەکیشـم دابێ. ٢- شتی نەشیاو و دوور لە ڕاستی. ٣- ناوە بۆ مێینە.

خەیمە (ن.) چادر، خێوەت: خەیمەیەکمان لەگەڵ خۆ بـردبوو.

خەییام (ن.) زانــاو شــاعیرو ریازیاتنــاس بــەناوبانگ: چـوارینەکانی خـەییام بەناوبانگن.

خدر (ن.) لەخفەوە، ناوە بۆ خێر: هەموو خدری زیندە دەناسین.

خدرەلیاس (ن.) شازدەی مانگی ڕەشەمە: خدرەلیاس سەرما خلاس.

خرۆش (ئان.) هەست، سۆز، جوولاّن: شار خرۆشاوە.

خرۆش (ن.) جۆش: ئەوەندەم بیست خرۆشی روحی بێگانە.

خرۆش (ن.) هاوار، هەرا و هۆریا: بەجۆش و خرۆشی سەربەخۆیین.

خراپ (ئان.) ١- دژی باش، نارێك، چاك نـەبێ: دەرمـانی خـراپ، خۆشەویست نی یە.٢- بەدخو، بەدڕەوشت، بەدکار: خۆزگە پیاو خـراپ وەکـو هەنگ دەبوو.. لەگەڵ پێوەدان گیانی دەردەچوو.

خراپە (ئان.) کاری ناشیرین، کردەی خراپ: دوو ڕوویی ڕەوشتێکی خراپە.

خران (چ.) ١- اەخســتن، نادیــارە: ئاهەنگەکــە دواخــرا. ٢- دانــان: هــەموو وشەکان خرانە ڕستەوە.

خزم (ن.) کەس و کار، خوین: دەبێ سەردانی خزمان بکەین.

خزمەت (ن.) کار کردن: پێویستە خزمەتی گەلو نیشتمان بکەین.

خزمەت کردن (چ.) ڕاژە، کار بۆ کەسێك کردن: خزمەتکردنی دایكو باوك ئەرکێکی پیرۆزە.

خزمەتکار (ن.د.) نۆکــەر، خــولاّم، بەنــدە، خزمەتچــی، راژەکــار: ئێمــە تــا کــەی خزمەتکاری دوژمن بین.

خستن (چ.) ١- کەوانـدن: خسـتنی منداڵەکـە ئـازاری پێگەیانـد. ٢- بـەزەوی

دادان: پاڵەوانەکە بە پاڵێك دیوارێکی خست.

خستن (چ.) ١- کەواندن، بە زەوی دادان، بەردانەوە: بۆ خستنی سپیندارەکان کرێکاریان هێنابوو. ٢- تێکردن، هاویشتنە ناو: تەواوی پێویستییەکانم خستە جانتاکەمەوە.

خشۆك (ن.) جۆرە گیاندارێکی بێ پێ: خشۆکی وەك مار ناتوانێ بفڕێ.

خشاندن (چ.) بەیەك کەوتن، پێك دادان: مارەکە خۆی لە زەوی خشاند.

خشە (ن.و) دەنگی ڕۆیشتن جار یا خشۆك: خشەی پێ دێت.

خلیسکان (چ.) خزین: خلیسکان لەسەر بەفر وەرزشە.

خنکان (چ.) مردنی مرۆڤو گیانلەبەر بە هۆی نەهاتنی هەناسەو ژێر ئاو کەوتنی: پیاوەکە بەهۆی نەزانینی مەلەوە خنکا. — دن: خنکاندنی مرۆڤی بێ تاوان کارەساتە.

خنکاندن (چ.) لەسێدارەدان، پشوو لێبڕین، هەناسە بڕین: خنکاندنی مرۆڤی بێ تاوان.

خۆ ( ج.خ.) خو: هیچ کەسەك نەشێت هەمی تشتەکی بدلێ خو بکەت.+ پەرست: خۆپەرست نابیتە هەڤاڵەکێ دلسۆژ.+فرۆش: خۆفرۆش چجاران نابیتە نیشتمانپەروەر: کە دیتم شەمعی روخسارت بە پەروانە دڵی خۆم وت: لە ناوچەوانی خۆم نووسیوە هەر بەو شەمعە سووتاوم. (حەریق)

خۆ (ج.خ.) خود، خوە: خۆی کەم تەرخەمە.

خۆ (ن.) نەفس، زات: خۆ دوور گرتنی ئەو بە پەسەند نەدەزانرا (ج.خ): خۆم، خۆت، خۆی، خۆیان، خۆتان، خۆیان: ئەگەر تۆ نەهاتبایتەوە خۆم دەهاتم. (ئام.) ٣- بۆ جەختکردنەوە بەکار دێ: ئەگەر تەواو بتخوێندبا خۆ تەواو سەردەکەوتی.

خۆ پێ ژیاندن (چ.) خۆ پێ بەخێوکردن: مووچەی فەرمانبەران مووچەی خۆ پێ ژیاندن نییە.

خۆبەخت کردن (چ.) مردن لەڕێگای مەبەستێکدا: خۆ بەخت کردن لەپێناو نیشتمان ئەرکێکی شۆڕشگێڕانەیە.

خۆت (ج.خ.) تۆی تۆ، بۆخۆت، کەسی‌تر نا: خۆت وەرە بۆ ئێرە.

| | |
|---|---|
| **خۆر (ن.)** | **١- رۆژ، هۆر: خۆرهەڵات رۆیشت. ٢- خاك، خـۆڵ، گـڵ: خۆرەكـەم بردە سەربانەكە. (هەولێر)** |
| **خۆر (ن.)** | **ڕۆژ، هــەتاو: تیشــكی خــۆر بەســوودە. _ هــەڵاتن (چ.) ڕۆژ دەركـەوتن: لـە خـۆر هەڵاتـەوە كـار دەكـات. نیشـین (چ.) ڕۆژ ئاوابوون،ئێوارە: تا خۆر نشینیش دەخوێنمەوە.** |
| **خۆراك (ن.)** | **خواردن، شتێ كەبخورێ: كۆترەكە بووە خۆراكی پشیلەكە.** |
| **خۆراك (ن.ب.)** | **خواردن: بەشە خۆراكی ئەم مانگە نەهاتووە.** |
| **خۆڕ( ن.ئاب.)** | **ست سروشت: خۆڕستا كوردستانێ یا بپیتە.** |
| **خۆریك (ن.)** | **ئاوەڵە، خوریك: لاوینـی بـەری خوریكـان، تەمـەن درێـژی پشـتی سۆركان.(پەندە)** |
| **خۆزگە ()** | **بـۆ ئـارەزوو و مەبەسـت دەگـوترێ، یـاخوا: خۆزگـە خـۆ ویسـتی نەدەما.** |
| **خۆش (ئان.)** | **١- چێژ، تامی پەسند: چێشتەكەی تامی خۆش بوو. ٢- دەمی بێ بـاران: ئاسمـان خۆشـی كـرد. ٣- بـۆنی پەسـند: بـۆنێكی خۆشـی هەیە. ٤- ساغ و سەلامەت: یاخوا هەر خۆش بی. ٥- بەگڕ بوونی ئاگر: ئاگرەكەیان خۆش كرد. ٦- ژیانی كامەران: خۆشی وڵاتمـان دەوێت. ٧- ڕۆیشتنی بەپەلە: خۆش بڕۆ. ٨- ئامادەكردنی چـەرم بۆ بەكارهێنان: چەرمی بەرخەكـەیان خـۆش كـرد. ٩- بـۆ خـەو: خەوی خۆشە.** |
| **خۆش (ئان.)** | **١- گەش: هەر چەندە نەخۆش بوو، بەڵام ڕەنگی خۆش بـوو. ٢- سەیرو سـەمەرە، خـۆش رەفتـار: پیـاوێكی خـۆش مەشـرەبە. ٣- خێرا، بەلەز: ئۆتۆمبیلەی خۆش لێـدەخوڕی. ٤- بـەهێز، تونـد: ئــاگرێكی خۆشــیان كردبــووەوە. ٥- بــەتام: دایكـم شـیوەكانی خۆشن.** |
| **خۆش (ئان.)** | **ساخلەم، شیرین، باش، ئاسـان، سـانا، جـوان.١- گۆتنـا خـۆش و یـا نــەخۆش ژ دەڤــەكی دەردكــەڤن. ( پەنــدە). ٢- هــۆنراوەی ورد كامی خۆش‌و بەتامە.. كە دڵ بەسۆز نایـە سـەر نـووكی خامـە.( كامەران موكری)** |

خۆشا: خۆزگە: خۆشا بە حاڵی کەس.

خۆشاو: ئـەو شـتەی کـە لـە مێـوژ دروسـت دەکرێـت: خۆشـناو بـە دروستکردنی خۆشاو بەناوبانگن.

خۆشبەخت: بەختیار، نگین: ئەو هەر خۆش بەختە.

خۆشتڤی (چ.) خۆشەویست، دلبەر، خۆشتڤیی من زوو بزڤرە

خۆشەویست (ن.) ١- لەبـەر دلان: قوتـابی زیـرەك هەمیشـە خۆشەویسـتە لـەناو خـەلکی. ٢- یـار، هاوسـەر: زیـن خۆشەویسـتی مـەم بـوو. ٣- پێغەمبەر. ئەی خوشەویست خۆشمان دەوێی.

خۆشحاڵ: دڵشاد، دڵخۆش، شادمان: خۆشحاڵ بووین بە هاتنی مێوانەکان.

خۆشگوزەران: بەسەر بردنـی ژیـانی خـۆش: هـەموومان بـۆ خۆشـگوزەرانی کـار دەکەین.

خۆشکردن (چ.) ١- بەهێزکردن، خێراکردن: زیادبوونی ئاوەکە ئاشەکەشی خـۆش کـردووە. ٢- ئامـادەکردن، چـاککردن: چـەرم دوای خۆشـکردنی دەچێتە پیشەسازی جۆراو جۆرەوە. ٣- بەتامکردن: بەهاراتەکـە شـیوەکەی خـۆش کـردووە. ٤- هێمنکردنـەوە، راوەسـتان: بـا بارانەکە هەندێك خۆش بکات ئەوکات دەڕۆین.

خۆشویستن (چ.) وەبەر دڵ کەوتن، هاتنە بەر دڵ.

خۆشی ( ن.و.) کامـەرانی، دڵخۆشـی، ئاهـەنگ، شـایی، زەماوەنـد، شـەهیانە، خوەشی: خۆشی ئەوە یا مرۆڤ لسەر نەڤەکێت.

خۆشی (ن.و.) ١- چێژی پەسند: ئاهەنگەکە پڕ لە بـەزمو خۆشـی یـە. ٢- نـاوی کچانە: خۆشی لە خولەکە سەرکەوت.

خۆگرتن (چ.) ١- سـەبر گـرتن، سـەبر نوانـدن: خـۆت بگـرە تـا کێشـەکە تـەواو دەبێ. ٢- وەستانو قسە لەگەڵ نەکردن: خۆت لـە برادەرەکانـت مەگرە. ٣- تەمەڵی لە کار.

خۆفرۆش (ن.ب.) کەسـێك خـۆی بەرامبـەر بـە دەسـتکەوت لەگـەڵ دوژمنـان بگونجێنێ: خۆ فرۆشەکە بە سزا گەیشت.

خۆڵەمێش (ن.ل.) ١- خۆڵەکەوە، پاشماوەی ئـاگر: خۆڵەمێشی ئاگرەکـە فـڕێ دە.٢- ڕەنگی خۆڵەمێشی: قوماشەکە ڕەنگی خۆڵەمێشییە.

خۆماڵی (ن.و.) ١- تایبەتی‌بەماڵی خۆ: مافورە چنینی خۆماڵی‌یە.٢- ماڵی، ئاژەڵی لەماڵ بەخێوکراو: کەوەکە خۆماڵی‌یە نەك کێوی.

خۆماڵی کردنی نەوت(چ.) نەوت بەرهەم هێنان لە دەست دەزگای بێگانە وەرگیرا: خۆماڵی کردنی نەوت لە ساڵی ١٩٧٢ بوو.

خۆمان (ج.خ.) ئێمە، خەڵك نا: ماڵی خۆمان یەکخستەوە.

خۆیا (ئان.) ئاشکرا، دیار، روون. هەمی شت بوو.

خوا (ن.) ١- خودا، خالق، خودێ: ٢- داواکار، خوازیار: خوا خوایەتی لە تاقیکردنەوەکانی سەرکەوێ.

خوا (ن.) خودا، خودێ: خوای گەورە شایانی پەرستنە.

خوا پەرستن (چ.) جێبەجێکردنی فەرمایشتەکانی خوا. (خوارپەرستن لەسەر هەموو مرۆڤێك پێویستە).

خوار (ئان.) ١- چەوت، پێچەوانەی ڕاست لار: هێڵەکە خوار نەکێشی. (ئاك.) ٢- لای ژێرەوە، بن، بەر، ژێر:

خواردن (چ.) ١- بە ددان جوین و قووت دان: خواردنی ماسی سوود بەخشە. ٢- داگیرکردنو بەتاڵان بردنی ماڵی خەڵك: خواردنی ماڵی خەڵك کارێکی نارەوایە.

خواردن (چ.) ١- جوینو قووتدان بە ددان: زۆر خواردن باش نییە. ٢- سەرفکردن، خەرجکردن، بەفیڕۆدان: ئەو پارەیەی لە دەستیدا بوو هەمووی نەخواردووە.

خواردن (چ.) بەدان جوین و قووت دان: نانەکەی خوارد. پەپکە_ (چ.) خۆ خڕکردن، خۆ لوول دان: مارەکە پەپکەی خوارد.

خواردن (چ.) خارن، خوارن، چێشت، (ن.) خۆراك: خواردنی زۆر گەدەو زگ دێشێنێت.

خواردنگە (ن.) تێشتگەه، خوارنگەه، خارنگەه، چێشتگە: خواردنگەکانی کوردستان پاك و خاوێنن.

خوارزمی (ن.) زانایەکی بەناوبانگی جیهانی ئیسلامییە.

خواروو (ئاك.) لای ژێرەوە: خوارووی کوردستان ئازاد کراوە.

خوارێ (ئاك.) ژێرەوە، بنەوە: کەوتە خوارێ سەرەو نوگون.

خوازبێنی کرن (چ.) چوونە داواکردنی کچ بۆ مێردکردن: لە خوازبێنی کردنەکە وەلاّمیان نەدایەوە.

خواست (ن.) داوا، ویست، نیاز، خواز: خواستی من سەرکەوتنی گەلە.

خواستو ویست (ن.ل.) بەهەوەس، داخوازی، ئارەزوو: ئەمە دەبێت بەخواست و ویستی خۆت بێت.

خوان (ن.) ١- سفرە، نانی ئامادەکراو: نان ئەو نانە، ئەمڕۆ لە خوانە. (ئاك.) ٢- جێ قوونی سوار لەسەر زین. (پاش.): ٣- حیکایەتخوان، ئاواز خوان: حیکایەتخوان ڕۆڵی لە شانۆییەکەدا هەبوو.

خوان (ن.) ١- سفرەی خواردن: لەسەر یەك خوان دەخۆین. ٢- پاشگری بەواتا بێژەر: ئاواز خوانە. خۆش _ (ئان.) دەنگ خۆش، خۆش ئاواز: بولبولی خۆش خوانە.

خواناس (ئان) باوەڕدار، خواپەرست، موسڵمان: گەلی کورد خواناسە.

خواهی (چ.) ویستن: ئەمە لەگەڵ خواهی ئێمە ناگونجێ.

خودان (ن.) خاوەن: خودان بەرهەمێ زۆرن.

خودان (ن.) خاوەن: کورد خودانێ ئاخا کوردستانێیە.

خوڕت ( ئان.ن.) گەنج، لاو، تۆلاز، جحێل، بهێز، بزاخ، بگوڕ: مرۆڤێ راست یێ خوڕتە.

خورپە (ن.) ڕاچڵەکانی دڵ، لەرزە: خورپە لە دڵییەوە دەهات.

خورشیدی (ن.) ساڵنامەی ئێرانی، ساڵ ژمێری ئێرانی: خەیام ساڵ ژمێری خورشیدی ڕێك خستووە.

خوری (ن.) مووی حەیوان: خەرار لە خوری دروست دەکرێ.

خول (ن.) ١- گەڕان: لاوەکان لە بێ کاری خول دەخۆنەوە. ٢- وەك شێت: بەدەم نەخۆشی خول دەخواتەوە. ٣- سووڕ: منداڵەکە وەکو شێت دەخولێتەوە. ٤- کۆڕس: دەبێ لەم خوولە دەربچی.

خولْقان (چ.) دروست بوون: هەلّۆ بۆ فرین خولْقاوە.

خولك (ن.) رەنـگـو سـیمایێ سەروچـاڤان، خـورك، چـەهرە: خـودانێ ملکـی نائیێخیت خولکی.(پەندە)

خولیا (ن.) کەلکەلە، خەیالّو ئارەزوو، هەوەس: هەر لە منداڵیەوە خولیای کوردایەتیم هەیە.

خونچە (ن.) بشکوژ، گوڵی نەپشکوتوو: گوڵ و خونچەی بـەهارانیش لـە تـۆ جوانتر نابیّ.

خوە (ن.) ئارەقـە، ئـەو ئـاڤوگلیزانکێن ئاڤێنـە ئـەوێن ژ گەرمانـدا یـان ژ شـەرماندا یـان ژ وەسـتیانێ ژ لەشـێ مرۆڤـی دەردکـەڤن.خوەهـا رێنجبەران یا شیرینە!

خوو رەوشت (ن.ل.) هەڵسوکەوت، کار: خوو رەوشتی جوان مرۆڤ جوانتر دەکات.

خوێ (ن.) ١- خێ ماددەیەکی سوێرە لـە زۆر بـواردا بـەکاردەهێنرێ: باشـتر وایە کەمتر خوێ بکەیتە چێشتەوە. ٢- خاوەن، خانە خوێ.

خویشك (ن.) خووشك، خوە. وی دوو خوشك هەنە

خوێن (ن.) خوین، خین، خون، هوون: خوێن بەخشین کارێکی پیرۆزە.

خوێن هەڵهێنان (چ.) خوێن رشانەوە: خوێن هەڵهێنانی نەخۆش مەترسیدارە.

خوێناوی (ئان.) بـەخوێن، خــوێن لەبــەر رۆینــی زۆر: دوو جــەنگی جیهــانی خوێناویترین جەنگ بوو.

خوێنەر (ئان.) مرۆڤی خوێنەر حەز لە خوێندنەوە دەکات.

خوێند (ك.) شەماڵ وانەکەی خوێند. — کار: قوتابی، خوێندەڤان، فێرخـواز: دەبێت خوێندکار باوەری بەخۆی هەبێت.

خوێندەوار (ئان.): ئازاد خوێندەوارە.

خوێندن (چ.) خوندن، فێربوون: شیللی لە ئۆکسفۆرد خوێندویەتی.

خوێندن (ك.) خوێندن رووناکی ژیانە

خوێندنەوە (چ.) شت خوێندنەوە: خوێندنەوە مێشکی مرۆڤ دەکاتەوە.

خوێندنەوە (ك.) خوێندنەوە بیری مرۆڤ فراوانتر دەکات.

خوێندنخانه (ن.) خوێندنگا، خوێندنگاه، قوتابخانه: خوێندنخانه شوێنێکی پیرۆزه.

خوێنرێژ (ن.ب.) پیاوکوژ: خوێنرێژەکەی ئەم ولأته له زینداندایه.

خێر (ن.) ١- قازانج، پاداشت: کاری ئەم هاوینەمان خێرێکی باشی هەبوو.
٢- شت بەخشین، چاکه: مام برایم زۆر بەخێرو خێراته.

خێرخواهی (چ.) چاکه ویستن، خێرکەر: خێر خواهی زۆر بکەن.

خێرخواهی (چ.) چاکه ویستن: خێرخواهی قووڵ بکەن.

خێزان (ن.) ١- ماڵو منداڵ: ژمارەمان چوار سەر خێزانه. ٢- ژن بۆ مێرد: خێزانەکەم پسپۆری کیمیایه.

خیزه (ئان.) خره خڕی سینگ، خیزەخیزی سینگی دێت.

خێسەکردن (چ.) موربوونەوه، به تووڕەیی تەماشاکردن: خێسه له منالّەکه مەکه.

خیڤەت (ن.) چادر، کین، ڕەشمال: خیڤەت ل سەیرانان بۆ باران و هەتاڤێ تشتەکێ فەره.

خێڵ (ن.) ١- کۆچەری هەوارچی، رەوەند: نێوان مانگی بەهاران خێڵ بەرەو ژوور هەڵدەکشێن. ٢- هۆز، تیره، کۆمەڵێکی دیاریکراو.

خێو (ن.) ١- خاوەن، ساحێب. ٢- جنۆکه: ژیانی تەنهایی هەر بۆ خێوه.
٣- (تارمایی ئەو وەك خێو هاته بەرچاو)

# ر

**دابو نەریت (ئان.)** تیتال: دەبێت دابو نەریتمان کوردانە بێت.

**دابەستن (چ.)** ١- دەستپێکردن: تا مـن گەیشتمە ژووریٚ ئـەوان نوێژەکـەیان دابەست. ٢- ڕاگرتنی حەیوان بۆ قەڵەو بوون: کاوڕەکەی بۆ دابەستن کڕیوە. ٣- وەسـەر ملـی گـا خستنی نـیرو ئـاموور: جووتەکەی دابەست.

**داتاشین (چ.)** ١- داتراشین، رووت کردن، دار سپی کردن: دارتاشەکە دارەکانی بـەئامێرەکانی کارەبایی داتاشی. ٢- بۆ زاراوە دروست کـردن: داتاشینی وشەی نویٚ زمان دەوڵەمەند دەکات.

**داپۆشین (چ.)** ١- پڕ کردنەوەی چاڵ: دوای ئەوەی تەواو بوون چاڵەکەی باش داپۆشـتەوە. ٢- داخسـتنی سـەری جـامو شووشـەو....: مەنجەڵەکـە داپۆشـەوە تـۆزو بایـە. ٣- تێکردنـی بـەفر، بـەفر کەوتنـە سـەر شـاخ: لـە زسـتاندا بـەفر لووتکـە چـیاکانی کوردسـتان دادەپۆشـیٚ. ٤- شـاردنەوە، قسـە لێنـەکردن، بـزر کردن: چاو لە خراپە مەپۆشە.

**داپیرە (ن.)** نەنـە، نـەنك، پـیر، دایـە گـەورە: داپـیرەم چـیرۆکمان بـۆ دەگێڕێتەوە.

**داخ (ن.)** ١- خـەم، کەسـەر، خەفـەت: داخـی ئـەم کوشـتوومی. ٢- تاسـە، عەزرەت، حەسرەت: بـەداخی ئـەوە سـەری نایـەوە. ٣- لەگـەڵ وشەی شاخ بەمانای کێو، چیا: کوردستان، ولاٚتـی شـاخو داخـە. (ئـان.) ٤- زۆر گـەرم، داغ، گـەرمکراو: ڕۆنەکـە داخـە ئاگـات لێبیٚ. (ئام.) ٥- ئامرازی سەرسورمان، حەیف، مخابن

**داخراو (ئان.)** پێوەدراو، کلۆمدراو، قەپاتکراو: بازنەیەکی داخـراو بـە دەوری ئەو پیتەدا بکێشە، کە بابەتی ئەمڕۆمانە.

**داخستن (چ.)** ١- پێوەدان، قفڵدان: بۆ ئەوەی ئاگات لێبێ کتێبەکانت داخە. ٢- نەویکردن، شۆڕ کردنەوە: لە شەرمان سەری داخست. ٣- هەڵگرتن بۆ کاتێکی دی، داگرتن: ئەوەی جێگای نەگبەتی بوو ئەوە بوو، کە خەڵك پارەی نەبوو تا ئازووقەیەکی باش دابخات. ٤- پێکردنو گەرمکردنی سۆبەی دار: سۆبەکەمان داخستبوو، زوو گەرم بووینەوە.

**داخوازی (ك.)** داواکاری، دڵخوازی، خوازیار: داخوازی مانگرتووەکان جێ بە جێ کرا.

**داخوازی کردن (چ.)** داواکاری: داخوازی کچەکەیان کردووە.

**داخورپان (چ.)** ڕاچڵەکین: لە ترسان داخورپان.

**داد (ن.)** ١- هاوار، ڕۆ ڕۆ: هێشتا زۆر کۆمەڵگا دادیانە لە دەست زۆرداری. ٢- یەکسانی، وەك یەك: دەبێت کاروباری داد سەربەخۆ بێ لە ڕەفتارکردندا.

**دادپەروەری (ن.م.)** یەکسانی، هاوبەشی ،چون یەکی: دادپەروەری مرۆڤ بەختەوەر دەکات.

**دادگا (ن.د.)** جێگای شکات کردن، خانەی داد، ئەو شوێنەی کە مرۆڤ بۆ وەرگرتنەوەی مافەکانی رووی تێدەکا: دادگاییکردنی سەدام درێژە دەکێشێ.

**دار (ن.)** ١- درەخت: سروشتی کوردستان بەدارەوە جوانە، بۆیە پێویستە نەهێڵین وشك بێتو ببڕدرێت. ٢- سامانو ماڵو دارایی: پیاوێکی نەدارە پێویستە دەستی بگرین. ٣- خاوەن، کە دەچێتە سەر هەندێ وشە، خێزاندار، دوکاندار

**دار گوێز (ن.)** درەختی گوێز، ئەو درەختەی گوێزی پێوە دێ: دار گوێزی وا هەیە تەمەنی لە ٥٠ ساڵ زیاترە.

**دار مازوو (ن.ل.)** دارێکە بەرهەمی مازوو دەداتو لە چیاکانی کوردستان زۆرە، خۆڕسکە: دار مازوو دارێکی بەسوودە.

**دارا (ن.)** ١- دەوڵەمەند: مرۆڤی دارا گوێ بە پارە نادات. ٢- جۆرە دەرمانێکی تیژە لەگەڵ دەرمانی چاو بەکاردەهێنرێت. ٣- ناوە

بۆ نێرینه. - یی: وەزارەتی دارایی گرنگی زۆرە.

داربەڕوو (ن.ل.) ناوی دارێکی خۆڕسکە: دار بەڕوو لە کوردستان زۆرە.

داربەست (ن.) سندریك، تابیت، ئەو سندۆقا داریيە ئەوا (مری) تێدا هەڵدگرن: دارەباز هەر مزگەڤتەکێ داربەستەکا تێدا هەی بۆ هەلگرتنا مریان بکار دئینن.

دارتاش (ن.) کەسێك کە کاری شتومەك دروستکردن بێت لە دار: ئەم قەنەفەیە دارتاشەکەی جیرانمان دروستی کردووە. دارتاش، نەجار.

دارستان (ن.د.) جەنگەڵ، لێرەوار: دارستانەکانی کوردستان ژیانەوە.

داڕشتن (چ.) ١- دەقاڵبکردن، لە قاڵبدان: ئەو خشتانەی دیوارەکەتان پێ کردن باش داڕێژرابوون. ٢- نووسینو وتار، بابەت: داڕشتنێك لەبارەی هونەری شانۆگەری لە شارەکەمان بنووسە.

دارو دەوەن (ن.) لێرەواری بە پنچك، دارستان. تەرمەکەیان لەناو دارو دەوەنەکە شاردبۆوە.

داستان (ن.) ڕووداو، بەسەرهات، سەرگوزشتە: داستانی قەڵای دمدم داستانێکی ڤارەمانێتیە.

داچوون (ن.) ١- گەڕانەوەی شەپۆڵی ئاو: ئاوی دەریا لە هەڵچوون و داچوون دایە.٢- نەوی ی بوون و قۆپان: سەربانەکە داچووە.

داگیر کردن (چ.) دەست بەسەرداگرتن: کوردستان بەزۆرلەلایەن هێزی بێگانەوە داگیر کراوە.

داگیرسان (چ.) پێکردن، گڕ تێبەردان، تێهاوێشتن: سەماوەرەکەم داگیرسان.

داعیران (ن.) قۆتدان، ئەودیوکردنی خواردن لە دەمەوە بۆ گەدە بەڕێگای گەرووییەوە. داعیر ( کاری داخوازییە): پاریێ خۆ باش بجوی پاشی داعیرە.

داقوتان (چ.) داتەکاندن، ڕاهژاندن. ئەوان بەبێ پرس لەوێیان داقوتا. بەڕەکە باش داقوتە.

داکردن (چ.) ١- وە ژوور کردن: هۆر شوێنی داکرنی ولاخە. ٢- هاتنە خوارەوەی باران، بارین: ئاهەنگەکەمان تەواو نەبوو، کە

دایکـردە بـارانێکی بـە لێزمـە. ٣- خـەل کردنـە نـاو چاڵ، کـا کردنە ناو کادین: بۆ ئالیکی زستان کا دەکرێتە ناو کادێن.

دام (ن.) داو، دەزوو، پـەتك: دامـی کراسـەکە بـاش بـوو. — و دەسـتگا: دامەزراوە: حکومەتی هەرێم دامو دەستگای زۆری هەیە.

دامەزران (چ.) دامەزراندن: دەرچووانی ئەمساڵ دامەزران.

دامەزراندن (چ.) ١- جێگیرکـردن: دەزگـای پێشـمەرگە دامـەزرا.٢- دەسـت بەکارکردن: لە کۆڕی زانیاری دامەزرا.

دامرکان (چ.) داسـنەکان، ئـارام گـرتن: منداڵـەکان.٢- نـەمانی گـڕی ئـاگر: ئاگرەکە دامرکا.

دامێن (ئاك.) ١- دامەن: دامەنی کراسەکە پیس بوو.٢- دامێنی کێو، بنـار: لـە دامێنـی کـەژ وێنـەمان گـرت. ٣- دەهمـەن، پـەراوێز: ئەمـە لـە دامێنەکە بنووسە.

دان (چ.) ١- بەخشـین: دانـی خـوێن ئـەرکێکی مرۆڤایەتیـە. (ن.) ٢- خـۆراکی مریشـكو پەلـەوەرو باڵنـدە: چـۆڵەکەم زۆر خـۆش دەوێن بۆیە زۆر جار دانیان دەدەمێ. ٣- دنك، بەر، بەروبووم: گەنمەکـە سـاوایە، هێشـتا دانـی نـەگرتووە. ٤- شـوێن، جـێ، لەگـەڵ هەنـدێ وشـە، خوێـدان، چـادان، ئـاگردان. (ئـاك.) ٥- دەمو کـات، نیـوەڕۆژ تـاڤ: دوێنـێ دانـی بـەیانی بەڕێکـەوتن.٦- ددان: دانم ژانی دەکرد بۆیە هیچم پێ نەخورا.

دانان (چ.) ١- نانە سەر زەوی: منداڵ لەسەر زەوی دانان ئازاری پێدەگات. ٢- دۆڕاندن لە قومار: پارەدانان لە قومار کارێکی ناڕەوایـە. ٣- نووسینی کتێب: دانانی کتێبی فەرهەنگی کارێکی ئاڵۆزە.

دانەر (ن.ب.) ١- بناغە داڕێژەرو دروسـتکەر: ئیـبراهیم پاشا بناغـە دانـەری شاری سلێمانی یە. ٢- نووسەری کتێـبو شـیعر و ... : دانـەری ڕۆمانی ژانی گەل کۆچی دوایی کرد.

دانپێدانان (چ.) ١- راستی گوتن، ئاشـکرا کـردن: تـا تاوانبـار دان بـە تاوانەکـەی نـەنێ سـزا نـادرێ. ٢- بەهێنـد وەرگـرتن، نـرخ بـۆ دانـان: بـۆ سەربەخۆیی وڵات پێویستە وڵاتان دانی پێدا بنێن.

دانوستان (ك.) پێدانووسان، گەزتن، خۆگرتن بە نهێنی بۆ بیستنی ڕازی ئەم‌و ئەو.

دانیشتن (چ.) ١- ڕوونیشتن، نیشتن: بۆ پشووودان تاوێك لەژێر سێبەری دارەکە دانیشتم. ٢- وازهێنان، دەست لەکار هەڵگرتن: ئازاد لەکارەکەی نەماوە دانیشتووە.

دانیشگا (ن.د.) دانیشگە، زانکۆ: دانیشگا شوێنێکی پیرۆزە.

داهات (ن.) واردات، بەروبوومی ساڵ و مانگ و ڕۆژ، دەرامەت، حاسڵات، دەستهات: بەرو بوومی زەوی: داهاتی تاکی کورد باش نییە.

داوا (ن.) ویستن، خواستن، ڤیان: کورد داوای مافی خۆی دەکات. — کار: داواکارەکان داوای خۆیان پێشکەش کرد. — کەر: داواکەر لە داوای خۆی پاشگەز نابێتەوە. — کردن: داواکردنی زانست پێویستە. — خواز: داوا خواز داوای زۆرە. — چی: داواچی داوای خۆی تۆمار کرد.

داوا کردن (چ.) خواستن، تەلەبکردن، ویستن: داوامان کردووە گۆڕەپانێکی یاریمان بۆ دروست بکەن.

داوەت (ن.) شەهیانە، شاهیانە، گۆڤەند، شاهی: داوەتا بێ شەلانە.(پەندە)

داوەشاندن (چ.) ١- هەڵکوتان، ڕاتەکاندن، ڕاوەشاندن: چاکەتەکەت داوەشێنە تۆزی پێوەیە. ٢- بەردانەوە، لێکردنەوە: تووی زۆری پێوەیە، بڕۆ دایوەشێنە. ٣- لەبەر یەکچوون‌و تێك ئالأن: هەموو لەشی داوەشاوە خۆی پێ لەسەر پێ ڕاناگیرێ.

داوێن پیس (ن.ل.) مرۆڤی زینا کەر: مرۆڤی داوێن پیس شەرمەزارە.

دایەن (ن.) دایك: دایە گیان لای‌لایە دەکات- خانە: شوێنی بەڕێوەبردنی منداڵی ساوا: لەمەودوا دایەخانە خزمەتی باشی دەبێ.

دایك (ن.) داك، ئۆدا،هۆدا، دایکە، دالك، دایە: دایك خۆشەویسترین کەسە.

دایکانە: وەك دایك، دایك ئاسا، بەسۆز، شیرین دایکانە رەفتار لەگەڵ منداڵان دەکات.

دایکەمار: لە شێوەی مارمیلکە دایە بەڵام گەورە ترە: دایکە مارەکەیان کوشت.

دەباخانە (ن.) شوێنی پێستە خۆش کردن: دەباخانەکە کەوتۆتە سەر ڕێگای گشتی شار.

دەباخی (ن.) دەباغ، پێستە خۆشکردن: باوکی ئارام کاری دەباخی دەکات.

دەبوور (ن.) بای خۆرئاوا: دەبوور هەڵی کرد.

دەحل (ن.) دەحلو دڕی، بیش.

دەخڵ (ن.) چاندنی گەنمو جۆو بەروبوومی کشتوکاڵی: باران بۆ دەخڵ بە سوودە.

دەر (ن.) دەرگـەهـ، دەرۆك، دەرگـا: دەڤێ بێ دەر سەرێ خودانێ دئێشینیت.

دەراڤ (ن.) دەرفەت، ماوە، مەیان. چە دەراڤ نەماینە.

دەراڤك (ن.) تەنکاو، ئەو شوێنەی ئاوەکەی زۆر قووڵ نەبێت. نەترسە دەراڤگە نەکیرە.

دەرامەت (ن.) داهات، دەستکەوتێك گوزەرانی پێ بکرێ: دەرامەتی فەرمانبەران دیاری کراوە.

دەربارە (ن.) ١- لە بارەی، سەبارەت: زۆر پەرتووك دەر بارەی کورد نووسراون. ٢-پیاوی دەسەڵات شاعیری دەربار، مانان ۆرە.

دەرباز (ك.) ١- رزگار بوون، دەرچوون: دوژمن لە لوولەی تفەنگی پێشمەرگە دەرباز نابێت. — کردن: خۆ دەرباز کردن لە گرفت زیرەکییە.

دەربەدەر (ئان.) ئاوارە، دەرکراو: دژی دەربەدری دەوەستین.

دەربەدەرکرن (چ.) دەربەدەرکردن، دەرئێخستن، دەربەردەرکر (کاری رابردوویە): رژێما بەعس ب کۆمەل کورد دەربەردەرکرن.

دەربەند (ن.) دیوارەکێ پانو بلندە دگەلیدا چێدکەن دا ئاڤا دەڤەرێ بپەنکینیت بۆ مەبەستا پەیداکرنا کارەبایێو.. تد: کارەبا سلێمانیێ ژ دەربەندیخان دهێت.

دەربڕین (چ.) قسە ئاشکراکردن: دەربڕینی بیرو ڕا بەسەربەستی نیشانەی دیموکراتییە.

دەربوون (چ.) دەمکردنەوەی کوان: کوانی ڕانم دەربوو.

دەرەبەگ (ن.) خاوەن زەوی و دەسەلأت: دەرەبەگی باوی نەماوە. - ی (ن.و.) ١- ولأتی بیٚ دەولّەت، حوکمی ئاغا و زۆرداران: ئۆخەی رژیٚمی دەرەبەگی نەما.٢- بریتییە لە زۆرداری بیٚ بەزەیی: بە دەرەبەگی دەژی.

دەرخوارد (ن.د.) پیٚ خواردن: دەرمانەکەم دەرخوارد دا.

دەرد (ن.) نەخۆشی، پەتا، درم: دەردە مریشکەی جاران هەر ئەو نەخۆشییە بووە ئیٚستا بەزۆری باسی دەکەن.

دەردەسەری (ن.) کارەسات، کویٚرەوەری، دەردەسەری لە ئیٚمە نابڕیٚ.

دەرزی (ن.) ١- دەرژەن، دریٚشە: بەدەرزی دووریمان. ٢- شریقە: نەخۆش بەدەرزی و دەرمان چاك دەبیٚت.

دەرزی (ن.) دەرزیك، بۆدوورمان بەکاردیٚت: دەرزیکیٚ دچاڤیٚ هەڤالیٚ خۆڕا دبینیت سویژنیٚ دچاڤیٚ خوڕا نابینیت.( پەندە)

دەرسۆك (ن.) سەرپۆش، جەمەدانی، چارۆگە: هندەك ژنك دەرسۆکی جوان گریٚددەن ژیٚدهیٚت، هندەك نە.

دەرچوون (چ.) ١- بۆ دەرەوە ڕۆیشتن: تازە لە مالٚ دەرچوو. ٢- لە ئەزموون سەرکەوتن: کاوە لە تاقیکردنەوەکە دەرچوو. ٣- هەلأت، ڕای کرد: ئازاد پەنجەرەکەی شکاندو بۆی دەرچوو. ٤- خەلأت بۆ دەرچوون: شیٚرکۆ خەلأتی بۆن بۆنی بۆ دەرچوو.

دەرگەه (ن.) دەر، دەرۆك، دەرگا، دەریٚ، قاپی: کەلا ئامیٚدییٚ دوو دەرگەه بتنیٚ هەبوون.

دەرفەت (ئاك.) هەل، بوار، بۆ ڕیٚککەوتن، کیس: دەرفەتە کورد خۆی رزگار بکات.

دەرکەڤتن (چ.) دەرکەوتن، چوونە دەرەوە، دەرچوون، دەردکەڤن (کاریٚ رانەبردوویە).١- هەما دنیا گەرم بوو میٚروی ژ کونیٚن خۆ دەر دکەڤن.٢- من رەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەویٚ .. مژدەی شەفەقی لیٚ دەر ئەکەویٚ. (پیرەمیٚرد)

دەرکەوتن (ك.) بە دیارکەوتن، دەرخستن، دیارکەڤتن، بزرنەبوون، پەیدابوون، هاتنە ئارا: ڕاستی قسەکانمان بۆ بەدیار کەوتن.

دەرمان (ن.) بۆ چارەی نەخۆشی دەخورێ: هەندێ نەخۆشی دەرمانی نییە.

دەرمان (ن.) داروو، دەوا: بۆ چارەسەری نەخۆشی بەکاردێت: زۆرەبەی دەرمان لە رووەك دروست دەکرێت. — ساز: دەرمان سازەکە دەرمانێکی نوێی دروست کرد. — خانە: دەرمان لە دەرمانخانە بکڕدرێت باشترە. — فرۆش: دەرمانفرۆشەکە دەرمانی تازەی لا بوو. — خوارد، ژەهر خوارد کردن: شۆرشگێڕەکەیان دەرمان خوارد کرد. — کردن: برینپێچەکە برینـدارەکانی دەرمان کردن.

دەروازە (ن.) دەرگای گەورە، سەرەتاو دەستپێکی شارو قەلاو خانووی گەورە: هێمای خۆبەختکاری ئەو شارە هەر لە دەروازەی شارەکە دیارە.

دەروون (ن.) ١- ژوورەوە، ناوەوە: دڵ و دەروونی پاکە.٢- ناوەبۆ کچ. دەروون ئاواتی زۆرە.

دەریا (ن.) زەریا، بەحر: شەپۆڵی دەریا بەترسە.

دەزگەه (ن.) ١- ئامیرەکێ مەزنو پڕ پارچەیە وەکی تێلەڤزیۆنو سەتەلایت.هەمی دەزگەهێن ناڤخۆ ئەڤ نوچە بلافکر. ٢- جهەکێ مەزنە گەلەك کەس کار تێدا دکەن وەکی دەزگەها شەهیدان. دەزگەها شەهیدان دەزگەهەکا پێدڤیە.

دەست (ن.) ١- دەس، لەپ. ٢- پەل، لە شانەوە تا جومگەکان.٣- لە جومگەی ئانیشکەوە بەرەو خوار: من بە دەستی ڕاستەم دەنووسم. ٤- نۆرە، سرە لە یاریو گەمەدا: با دەستێکی دی بکەینەوە، بزانم دەبەیەوە.

دەست بازی: دەست گەمە: زۆرجار دەست بازی ناخۆشی بەدوادا دێت.

دەست بەتاڵ: بێ ئاکام، کرێکارەکە بە دەستبەتاڵی گەڕایەوە.

دەست بەردار: وازهێنان، داواکارەکە دەستبەرداری داواکەی بوو. او: ١- گیراوەیەکی شلە بۆ بەرخی ساوا. ٢- شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن (ئەدەبخانە، ئاو دەست).

دەست بەسەرداگرتن (چ.) زەوت کردن، لێستاندن، بەرزەفت کردن، قۆرخ کردن: دەست

بەسەرداگرتنی ماڵی میللەت تاوانە.

دەست بلاّو: بەخەرجی، ئاریان کەسێکی دەست بلاّوە.

دەست تەڕ: دەست سوك، کەسێك کە کارەکانی بە جوانیو خێراییی ئەنجام بدات: سیروان لە کار کردن دەست تەڕە.

دەست پیس: ناپاك، نابێت مرۆڤ دەست پیس بێت.

دەست درێژ: دەستدرێژی کردنە سەر ماڵی خەڵك کارێکی شیاو نییە.

دەست رەش، تاوانبار، بەد: زۆر لە سەرکردەکان بە دەستی دەست رەشان شەهید کراون.

دەست ڕەنگین(ن.ل.) لێزان، لێهاتوو، خاتوون، شارەزا: ئافرەتی دەستڕەنگین سامانێکی لە بن نەهاتووە.

دەست رەنگین: بەهەرەمەند، کار ناس، نازدار کچێکی دەست رەنگینە.

دەست رێژ سەلیە: ئازاد بەر دەست رێژی گوللە کەوت.

دەست گیرۆیی: یارمەتیدان، باربۆ کردن، هاوکاری، دەست گرتن: هەمووومان بە دەستگیرۆیی سەردەکەوین.

دەست کەوتن (چ.) چنگ کەوتن: هەلێکی زۆرمان دەست کەوت.

دەست کورت (ئان.) ١- بێ پارەو نەدار: خەڵکی هەژارو دەست کورت زۆرە. ٢- قۆڵی کورت: نەوزاد لە زگماکەوە دەستی کورتە.

دەست نیشان: دیارکردن، لە خولەکەدا باشترین یاریزان دەستنیشان کرا.

دەست هەڵبرین (چ.) ١- دەست بڵندکردن، بەرز کردن: گەر بەنیازی قسە کردنی دەست هەڵبرە. ٢- چاو بڕ کردن، دیتن: تا دەست هەڵبڕی ئەم دەشتە هەمووی کراوەتە دەغڵ.

دەست هەڵگرتن (چ.) وازلێ هێنان: لە دادگا کاری دەست لێ هەڵگرتنەکە یەك لا کرایەوە.

دەستوبرد: ١- چالاك، لە کارەکانت دەستو برد بکە. ٢- یەکسەر: بەدەست و برد.

دەستاڕ: جاران دەستار بۆ هاڕینی ساوار بەکار دەهات.

دەستاو دەست: دەساو دەست، دەسەو دەس: گۆڤارەکە دەستاو دەس کرا.

دەستبەجێ: یەکسەر، هۆنراوەکەم دەست بەجێ لەبەر کرد.

دەستبڕ: قۆڵبڕ، فێڵباز، پیاوە دەستبڕەکە گیرا.

دەستبیلینگ (ن.) دوو شلیتێن پانن ژ هریێ چێدکەن، زارۆکی پێ دلاندکێدا گرێددەن. رەنگە ژ هندێ هاتبیت کو دەستانو لینگان گرێددەن: نابێت دەستبلینگان زۆر توند بکەن.

دەستە دەستە (تاك.) پۆل پۆل، تاخم تاخم، گرووپ گرووپ، کۆمەڵ کۆمەڵ: دەستە دەستە دەرۆیشتین نەبادا بمانبینن.

دەستەخوشك: برادەر، شادان دەستە خوشکی شیلانە.

دەستەڕاست: پیاوی یەکەم، سەرکردەکان دەستە ڕاستی زۆریان هەیە.

دەستەسڕ: دەسرۆك: دەستە سڕێکی جوانم بۆ هات.

دەستەك: ١- دەستەوانە، پەنجەوانە، دەست کێش: ٢- کۆمەڵێك لە مرۆڤ یان شت: دەستەك لە قوتابیان چوون بۆ سەیران.

دەستەلات: فەرمانڕەوایی: ئەمڕۆ کورد دەستەلاتی زۆرە.

دەستەمۆ (ئان.) خاپاندراو، کەمۆ، خستنە ژێر دەسەلات، لە خشتە براو: دوژمنان باپیرانی ئێمەیان دەستەمۆ کردبوو.

دەستپاك: ئەمین، جیێ متمانە مرۆڤی دەست پاك جێی باوەڕە.

دەستپێك (ن.) بەراهی، پێشەکی، لپێشیێ. بلا لسەر دەستپێکی ڕێك بکەڤین.

دەستخۆش: ئافەرین: دەست خۆشی کردن لە ئەنجامدانی کاری چاك پێویستە.

دەستخەت: دەست نووس: دەست خەتی جوان رەنگدانەوەی دەروونی مرۆڤە.

دەستڕۆیو: دەوڵەمەند، بەدەسەلات، کەسێك کە کارەکانی بە ئەنجام بگات: شەماڵ کەسێکی دەست ڕۆیوە.

دەستشۆر: شۆرێکە، بەیانیان لەسەر دەست شۆر دەستو چاوم دەشۆم.

دەستگر: دەست کێش، بۆ گرتنی شتی گەرم بەکار دێت: مەنجەڵەکە بە دەستگر بهێننە خوارەوە.

دەستگیران: دەزگیران: خۆیو دەستگیرانەکەی هاتن.

دەستکار: دەستکرد، دروست کراو: ئەو شتانە دەستکاری منداڵی کوردە.

دەستکاری (ن.و.) دەستتێڤەدان، دەستتێوەردان، گۆڕین: دەستکاری شتێك مەکە

گەر نەزانی چییە. دەستکاری: دەست لێدان، دەستکاری گوڵە جوانەکان مەکەن.

دەستك. بۆ باقەکا تشتان بکاردهێت کو پێکڤەبن، وەکی دەستکێ پیڤازان، دەستکێ گیای.

دەستکەوت (ن.ب.) شتێك بە بەلاش دەستت بکەوێ یاخود بە جۆرە ئمتیازێك دەگوترێ: پێشمەرگەکان لەشەڕەکە دەستکەوتی باشیان هەبوو.

دەستکەوت: بەدەستهاتوو، ئێمە پارێزگاری دەست کەوتەکانمان دەکەین.

دەستکرد (ن.) چێکری، کارێ دەستی. شتی دەستکرد تامی کەمە.

دەستکردن (چ.) دەستپێکردن: هەر لەگەڵ بوونەوەی قوتابخانە دەستمان بەخوێندن کرد.

دەسەڵاتدار (ئان.) توانایی، دەستڕۆین: دەسەلاّت دەتوانێت یاسا پێش بخات.

دەستمایە (ن.ل.) سەرمایە، پارەی کار پێ کردن، دەزمایە: دەستمایەم لەدەست دا.

دەستنیشانکردن(چ.) دیاریکردن، هەڵبژاردن، دانان: بنەمال دیموکراسییەت لەوەدایە گەل خۆی مافی دەستنیشانکردنی نوێنەرانی هەبێ.

دەستوور (ن.د.) یاسای بنەڕەتی ولاّت، دایکی یاساکان: مافەکانی کورد لە دەستوور سەلمێندراون.

دەستوور: ١- شتێ‌ی سابووناوییە لە کۆمی نەخۆشەوە دەنرێت بۆ رەوان بوون. ٢- یاسای بنەڕەتی دەوڵەت: دەستووری هەمیشەیی دەوڵەت پەسەند کرا.

دەستویری (ن.و.) یارمەتی وەرگرتن، داواکردنی یارمەتی، داواکردنی رێدان. مە دەستوردا.

دەسگا (ن.د.) ١- کارگێڕی، بەڕێوەبەرایەتی، فەرمانبەرێتی: کورد دام و دەسگای خۆی دروست کردووە. ٢- ئەو ئامێرانەی ئاسنگەر کاریان پێ دەکات.

دەسکاری (ن.و.) دەست لێدان و گۆڕین: دەسکاری بیرۆکەکانم مەکەن.

دەشت (ن.) زەوی نێوان شاخەکان، پانایی، زەوییەکی بەرفراوان: لە

هەرێمی کوردستاندا چەندان دەشتی بەناو بانگ هەن وەك دەشتی سندیو هەریر...هتد.

دەشن: دەرەوە، بابچینە دەشتەوە.

دەگمەن (ئان.) کەم وێنە، نایاب: شەرەفنامە کتێبێکی دەگمەنی مێژووی کوردە.

دەڤ (ن.) دەو، دەم، یەکەم بەشی دەزگای کۆ ئەندامی هەرسە.١- مرۆڤێ دوو دەڤ ودوو زمان یێ ترۆکریە. ٢ - هەرچەند گوناهی دەمەکەت بارە لەسەرلێو.. حەددی چیە ( نالی) کە بڵێ ماچە کەفارەت.(نالی)

دەڤەر (ن.) ناوچە، هەرێم: دەڤەرە بەهدینان خوشە.

دەغڵو دان (ن.) بەروبوومی دانەوێڵە، گەنمو جۆ: دەغڵ و دانی ئەم ساڵ زۆرباشە.

دەفر (ن.) جام، قاپ، بادی: ئاو خورادنەوە بە دەفر بە سوودە.

دەلاقە (ن.) تاق: چراکە لە دەلاقەکەدایە.

دەڵب (ئان.) دڕاو، کون: پێلاوەکەم دەڵب بووە.

دەم (ن.) ١- دەو، زار، دەڤ: پێویستە ڕۆژانە دەمو ددانمان بشۆین. ٢- کات، وەخت: دەمی ڕابردوو، دەمی بەیانی. ٣- نووك، سەر: ئاگات لە دەستت بێ دەمی چەقۆکە زۆر تیژە. ٤- پێگەیشتنی شیووچای: برنجەکەت لەدەم ناوە. (ئاك.) ٥- کەنار ڕۆخ، لێوار: دەم ئاوەکە زۆر فێنك بوو. ٤- خوێندن و خوێندنەوە ئەو خەریکی دەورکردنەوەیە

دەمو چاو (ن.ل.) ڕوو، روخسار: یارەکەم دەمو چاوی سپیو سۆڵە.

دەمار (ن.) رە، رە و ریشال: دەماری مرۆڤ خوێنبەر و خوێنهێنن.

دەمژمێر (ن.) کاتژمێر: دەمژێر سێ دچینە ماڵ.

دەملدەست (ئاك.) کتوپڕ، یەکسەر، دگاڤێدا. دەملدەست تەمە ناکرێ، دەملدەست ئەڤە ناهیتە کرن.

دەنگ (ن.) ١- هەرچی گوێ دەیبیستێ: دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە. ٢- هەواڵ، باس: دەنگ و باسی شار چییە؟

دەنگ دانەوە (چ.) سەدا، زایەڵە، رووخانی سەدام دەنگی دایەوە.

دەنگ نەکردن: قسەنەکردن، دەنگ لێوەنەهاتن.

دەنگ‌وباس (ن.) باس‌و خواس، هەواڵ، دەنگۆ، خەبەر: شەوانە گوێ لە دەنگ‌وباسەکان دەگرم.

دەنگی داوە: بلاّوبۆوە، بەناوبانگ بوو: ئەم قسەو باسە لەناو خەڵكدا دەنگی داوە.

دەنك (ن.) ١- دانە، قل، یەكێك، حەپ: لە دەنكێك دە دانە هاتە بەرهەم. ٢- خۆشەویست، دڵدار. دەنكی خۆمە.

دەوار (ن.) رەشماڵ: دەواریان بۆئاهەنگ هەڵدا.

دەوەن (ن.) داری بچووك، پنجکی دار: هەر دەوەنە دەبێ بەدار.

دەور (ن.) ١- زەمانە، رۆژگار: ئەو دەورە نەماوە کە کچ نەنێردرێتە قوتابخانە. (ئاك.) ٢- دەوروبەر، دەورو پشت، چوار دەورە: تەماشای دەوری خۆت بکە بزانە برادەرەکانت بە وازهێنان لە قوتابخانە گەیشتوونەتە کوێ.٣- رۆڵ، چالاّکی، کاریگەری: دەوری مامۆستا لە ووشیارکردنەوەی کۆمەڵگا دیارە.

دەورکردنەوە (چ.) دەرس خوێندن: وانەکەم دەور کردەوە.

دەوروپشت (ن.ل.) دەوروبەر، چواردەور، ژینگە: کورد دەوروپشتی بە دوژمن تەنراوە.

دەوڵەت (ن.) سامان، ماڵ‌و داهات ، فەرمانداری: هەموو دەوڵەتێك قەوارەو سنووری تایبەتی خۆی هەیە.

دەوڵەمەند (ن.) خاوەن پارەو موڵك‌و ماڵی زۆر، زەنگین: پیاوە دەوڵەمەندەکە یارمەتی چەند هەژارێکی دا.

دەوڵەمەندبوون (چ.) زەنگین بوون، خوا پێدان: دەوڵەمەندبوون بەرێگای نایاسایی زۆر بووە.

دخۆڕادیتن (چ.) لەخۆڕادیتن، باوەڕبەخۆکردن، بڕوابەخۆهێنان، شیان،کارین، پێ چێبوون. دخوڕادیتن بچینە داخوازیا وێ؟

ددان (ن.) ئێسکی ناودەم بۆ شت خواردن: گوێز بە ددان مەشکێنە.- زەرد (ئان.) بێ بایەخ و دان نەشۆر: ددان زەرد بێ باکییە.

| | |
|---|---|
| دژ ( ن.) | ١- دش، خوشکی مێرد، باجی: شەرمین زۆر باسی دژەکەی دەکات.٢- پێچەوانە: بیرو ڕای مارکسیو ئیسلامی دژ بە یەکن. |
| دژ (ئان.) | پێچەوانە، بەروڤاژی: بەفرو ئاگر دژی ئێکن. |
| دژ (ن.) | پێچەوانە، بەرامبەر: دژی شەڕ ئاشتییە. |
| دژوار (ئان.) | ١- تیژ: فلفلا سۆر یا دژوارە. ٢- زەحمەت. ئەم پرسیارە زۆر دژوارە. |
| دڕ (ئان.) | ١- هارو نەترس، پەلاماردەر: سەگێکی دڕ پاسەوانی مەڕەکانی دەکردن. ٢- زبر، گڕ، ڕووێك کە دەست بگرێو تیژ بێ: لەبەر ئەوەی دڕ بوو نەمتوانی هەڵیگرم. |
| دراڤ (ن.) | پارە، پوول. چە تشت بێ دراڤ چێ نابت. |
| دراما (ن.) | کارو جووڵە، نواندن: زنجیرەی درامای تەلەفزیۆنی زیادی کردووە. |
| درەخت (ن.) | داری بەرز: بەهاران دارو درەخت سەوز دەبن. |
| درەخشان (چ.) | ١- بریقەدان، تریسکەدان، گەشانەوە: ئەستێرەکان لە شەودا جوان دەدرەخشێنەوە. ٢- ناوە بۆ مێینە. |
| درەوشانەوە (چ.) | درەخشانەوە، گەشانەوە، بریقانەوە، بریسکانەوە. |
| دڕان (چ.) | کردنەوە، وەلا نان، نەهێشتن: ڕاپەڕین دڕی بە شەوەزەنگی تاریکیدا. |
| درز (ن.) | شەق، تەقین: مارەکە لە درزی دیوارەکەیە. |
| دڕك (ن.) | خار، ستری، دڕی: دەغڵەکە پڕیەتی لە دڕك و داڵ. |
| دڕك (ن.) | چقڵ، دڕی: دەبێ ببینە دڕك لە ڕێی دوژمنان. |
| درکاندن (چ.) | بە زمان هاتن، قسە لە دەم دەرچوون، ئاشکراکردن: نهێنییەکانی خۆت مەدرکێنە. |
| دڕندە (چ.) | ١- هار: ٢- جانەوەری گۆشتخۆری کێویو پەلاماردەر: پڵنگ جانەوەرێکی دڕندەیە. |
| دڕواسێ (ن.) | هاوسێ، جیران: دراوسێی باش لە خزم چاکترە. |
| دروشم (ن.) | نیشانەیەکی تایبەت بە وڵاتێك یان لایەنێك، هێما: شێر دروشمی ئازایانە. |

| | |
|---|---|
| **دڕیان (چ.)** | **دران، پارچـەبوون، ددڕیێـت ( کـاریٚ رانەبردوویـە): بـەڕك ژ لایێ تەنکڤە ددڕیێت. (پەندە)** |
| **درێژ (ئان.)** | **پێچەوانەی کورت: من درێژترم لە براکانم.** |
| **درێژە پێدان (چ.)** | **١- زیـاد گـوتن، زیـاد لەسـەر ڕۆیشـتن. ٢- دەسـت هەڵنـەگرتن، بەردەوام بوون: هەر چـەند زۆر مانـدووم، بـەلاّم هـەر درێـژەم پێدا تا تەواوم کرد.** |
| **درێژدادڕ (ئان.)** | **زۆربلێ، زۆرگۆتن، چەنە لێدان: درێژدادڕی باش نییە.** |
| **درێژکردن (چ.)** | **١- ڕەدووودان، زیادە پێدان: ئەوەندەی درێژە پێـدا خـەریك بـوو خۆمان لەبیر بچێ. ٢- خسـتنە سـەر جێگـا: نەیـدەتوانی بـڕوا بۆیە بە دەست لەسەر تەختەکە درێژمان کرد.** |
| **درێژی (ن.)** | **ماوەی نێـوان دوو خاڵـە، درێـژترە لـە پـانی: رووبـەری لاکێشـە یەکسانە درێژی X پانی.** |
| **دز (ئان.)** | **ئـەو کەسـەی مـاڵی خـەڵك بـە نهێنـی دەبـات: دوا رۆژی دز گیرانە. — ی: دزی سیفەتێکی پەسەند نییـە. — راو: کەلوپەلـە دزراوەکان دۆزرانەوە.** |
| **دگەل (ئام.)** | **لەگـەڵ، پێکـەوە، دگـەل کـێ رابـیو روینـی دێ رەوشـتا وی وەرگری.** |
| **دڤێ ( کاری مەرجە.)** | **پێدڤییە، پێویستە، دڤێت. دڤێ ئەو هەر بیت.** |
| **دڵ (ن.)** | **ئەنـدامێکی لەشـی مـرۆڤو ئاژەلاّنـە: دڵـی مرۆڤـی ئاسـایی لـە دەقیقەیەکدا ٧٢ جار لێدەدات.** |
| **دڵ تێچوون (چ.)** | **دڵ بۆچوون، دڵ پێوە بوون، بە بەردڵ کەوتن، حـەز تێچـوون: دڵی دە جوانییەکەی چووە، ناتوانێ دەستبەرداری بێ.** |
| **دڵۆپە (ن.)** | **١- دڵۆپە ئاوەکە لـە بانـەوە دەتکێ: دەنگـی دڵۆپـە ئـاو دێـت.٢- قسە لەناو قسەدا: قسەم کرد دڵۆپەی تێدا مەکەن.** |
| **دلۆڤان ( ن.ئان.)** | **میهرەبـان، بەسـۆز، دڵنـەرم: دایـكو بـاب پێدڤییـە بەرامبـەر زارۆکێن خۆ د دلۆڤان بن.** |
| **دڵبەر (ن.ب.)** | **ئەو کەسەیە کە خۆشت دەوێت، خۆشەویست.** |
| **دڵتەنگ (ئان.)** | **زویر، خەمبار، بە قسەی نەزان دڵتەنگ مەبە.** |

دڵەگورپە (ئان.) دڵەخورپە، تەپەتەپی دڵ: لەخۆشییا دڵە گورپەی گرت.

دڵپاك، ڕاست مرۆڤی دڵپاك سەردەكەوێت. - دڵپاك و بێ فێل: گەنجێكی دڵسافە. تەخت و ڕاستایی: زەویەكەی ساف كرد.

دڵپیس گومانكردن لە: دڵپیسی نەخۆشییەكی دەروونییە.

دڵخۆش (ئان.) دڵشاد، بەكەیف، بە هاتنت دڵخۆش بووم.

دڵخۆش: كەیف خۆش، بەختەوەر، هونەر بە بینینەوەی براكەی دڵخۆش بوو.

دڵخواز: دڵی دڵخوازان مەشكێنن.

دڵدار: ئەویندار، مرۆڤی دڵدار سڵ لە هیچ ناكاتەوە.

دڵڕاكێشەر (ن.ب.) دڵبەر، دڵڕفێن: ئەو كچە شۆخێكی دڵ ڕاكێشەرە.دڵڕفێن (ئان.) دڵبەر: چرپە كچێكی دڵڕفێنە.

دڵڕەق: بێ بەزەیی، ژیان لەگەڵ مرۆڤی دڵڕەق زۆر ئەستەمە.

دڵسۆز (ئان.) پەرۆش، جەرگ سۆز، لە خەمێ بوون: من دڵسۆزی تۆم.

دلسۆز (ن.) دڵسۆز، نیشتمان پەروەر، خاوەن گفتوبەلێن. (ئان.) بەوەفا، وەفادار، دلسۆژ، باوەڕ پێ كراو: مرۆڤێ دلسۆز یێ ڕێزدارو خۆشتڤییە.

دڵشاد، كامەران: دڵشاد چوو بۆ دهۆك.

دلگیر (ئان.) ١- خۆش، دلگیر: دیمەنەكە دلگیرە.٢- ناخۆش و دڵپەست: قسە ناخۆشەكان دلگیری كردم.

دلێر (ئان.) ١- پاڵەوان، ئازا، نەترس، بەهێز: لە هەرەوەزییەكەدا دلێر هەر خۆم بووم. ٢- ناوە بۆ نێرینە.

دن (ئام.) دی، تر، دیتر، بۆ دووبارەكردنێ بكاردهێت: چەند بخوینی، جارەكا دن ژی بخوینی هەرباشە.

دناڤبەرا (ئاك.) دناڤبەینا، لەنێوان، لەمیان. چ ئارێشە دناڤبەرا مەداییننە.

دنیا (ن.) ١- دنێ، دونیا، جیهان، عالەم: دنیا هەتا سەر بۆ كەس نییە. ٢- ناوە بۆ مێینە.

دنیا (ن.) دونیا، جیهان، گێتی: مرۆڤێ بێ وژدانیێ بكەت دینو دنیا ژ دەستی دچن.

دۆخین (ن.) شلیتەکا یەك مەترییە ژ بەندکان چێدکەن دکەنە دشەلوالیڕا بۆ گرێدانێ، نهۆ ژ لاستیکیژی چێدکەن. دوخیناوی چێکە.

دۆز (ن.) کێشە، ئاریشە: تا کورد رانەپەڕین دۆزا وان ل جیهانێ بەلاڤ نەبوو.

دۆز (ن.) کێشە، گرفت، ئاریشە، ئاستەنگ: دۆزی کورد بەرەو پێش چووە.

دۆزراوەتەوە (ك.) دیترایتەوە، بینرایەوە، هەر شتێك یان کەسێك کە ون بێت بە بەدوا گەڕان بدۆزرێتەوە.

دۆزینەوە (چ.) پەیداکردنی شتی بزر بوو: دۆزینەوەی شوێنەوارە کۆنەکان مێژوو دەوڵەمەند دەکات.

دۆزینەوە (چ.) دیتنەوە: دۆزینەوەی شتی نوێ ماندووبوونی دەوێ.

دۆست (ن.) هاوەڵ، هەڤاڵ، برادەر، هاوڕێ، یار: ئەو کەسەی دۆستو دوژمنی خۆ لێك نەکاتەوە، نەزانە.

دۆڵ (ن.) ١- گەلی، شیو، قووڵاییو نزمایی نێوان چیاکان، نهال، نواڵ، شیڤ، جۆم، جومك، دەرە، چەند گوندێکی بەسەر یەکەوە: دۆڵی بالیسانیش کیمیایی بەرکەوتووە. ٢- دەهۆڵ: بە دەنگی دۆڵو زوڕنا باش هەڵدەپەڕین.٣- کیسەی چەرم بۆ ئاوودۆ: بە دۆڵ ئاو لە کانی دێنن.

دهۆك (ن.) شارێکی باشووری کوردستانە: دهۆك شارێکی دلگیری کوردستانە.

دواڕۆژ (ئاك.) ئایندە، رۆژانی داهاتوو، پاشەرۆژ: دواڕۆژی کورد ڕووناکە.

دوامین (ئان.) کۆتایی، پاشین: لەم کۆلانە دوامین خانوو ماڵی ئێمەیە.

دوایی هاتن (چ.) کۆتایی هاتن، پایان: ئاهەنگەکە دوایی پێهات.

دوژمن (ن.) نەیار، دژی دۆستە، نەحەز، دژی هەڤالە: هزار دۆست تە هەبن کێمە، دوژمنەك تە هەبیت زۆرە.(پەندە)

دوژمن (ن.) نەیار، نەدۆست، ناحەز: دوژمن بە قسەی خۆش بکوژە.

دوڕ (ن.) ١- جۆرە بەردێکی جوانی گرانبەهایە لە دەریاکان دەردەهێنرێت: چاوی من دەم دەم دەڕێژێ ئاوی سافو خوێنی

گەش تا بلێین دەریای عوممانە دوڕو مەرجانی هەیە (نالی).

دوكان (ن.) دووكـان، فرۆشـگەهـ، شـوێنی فرۆشـتن: كرێـی دوكـان زۆر بەرزبووە.

دوو (ئان.) ١- ژمـارەی دوای یـەك. (ن.) ٢- دوونـگ، دوونگـی مـەڕ: بـۆ نەرمكردنەوەی خورماو دووی لەسەر باسكی دانابوو.

دووان (ن.) ١- قسەكردن، گفتوگۆ، پەیڤین، ئاخافتن: بـە هێمنـی لەگـەڵ یارەكەم دەدوام. ٢- ژمارەی دوو: دووان لە منداڵەكانم لـەزانكۆ دەخوێنن. ٣- وتاردان: بەڕێوەبـەری قوتابخانەكـە بـۆ قوتابیـان دوا.

دوور (ئاك.) دویر، پێچەوانەی نزیك: دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە.

دووربین (ن.) دویـربین، وردبـین، هـویربین، ئامێرێكـە شـتی دوور نزیـك دەكاتەوە.

دوورەپەرێز (ئان.) خۆدوورخسـتن: دوورە پـەرێز مەوەسـتە.- وڵات: دووركەوتنەوەلـە نیشـتمان، غـەریبی: لـەدوور وڵاتـە و دەنگـی هەیە.

دوورخرانەوە (چ.) لەكارلادان، ناردنە تاراوگە: لەسەر كوردایەتی دوورخرانەوە.

دوورخستنەوە (چ.) دووركـەوتن، لـەخۆ دووركردنـەوە: دوورخسـتنەوەی شـێخ مەحمود لە كوردستان زیانی بە كورد گەیاند.

دوورگە (ن.) زەوی چـوار دەوری ئـاوبێ: دیمـەنی دوورگـە جوانـە.- نیمچـە دوورگـە (ن.) دوو یـا سـێ لای ئـاوبێ و لایـەكی ووشـكانیە: نیمچە دوورگەی عەرەب لە ئاسیایە.

دووركەوتنەوە (چ.) دووركەوتن: دووركەوتنەوە لە مرۆڤی شەڕانگێز باشە.

دووماهی (ن.) كۆتایی، دوایی. گرنگە ئەوە دووماهیك خێر بێت.

دوومەڵ (ن.) قونێر، كوان: دوومەڵەكەی بن پێم چاك بوو.

دێ (ن.) ئـاوایی، گونـد، دێهـات، لادێ: ئاوەدانكردنـەوەی كوردسـتان بـە گەڕانەوە بۆ دێیەكان دەبێت.

دیار (ئات.) ئاشكرا، روون، بەرچاو: رۆڵی ئێمە دیارە لە چاكە.

دیار (ئان.) ١- بەرچـاو، ئاشـكرا، ڕوون: لەسـەر بەرزاییيەكـەوە گوندەكـە

دیـاره. ٢- كـن، لا، نزیـك، جـەم: دوێنـێ بـۆ هـەواڵ پرسـین چوومە دیار نەخۆشەكە. ٣- ناوە بۆ نێرینە.

دیار (ئان.) ئاشكرا، روون: ئەو منداڵە بە ڕەنگی دیارە كەوا دیارە.

دیارنەمان (چ.) بزربوون، ون بوون، لەبەرچاو نەمان: دۆستەكانمان لەبەرچاو نەمان.

دیاری (ن.) خەڵات: دیاری قەسپەكە شوێن دیاری هەسپەكە.( پەندە)

دیاریكردن (چ.) ١- نیشـانەكردن: دیـاریكردنی دەردەكـانی كۆمـەڵ ئـەركی هەمووانـە. ٢- دەرخسـتن: خـۆ دیـاریكردن لـە هـەموو شـوێن كـارێكی خراپـە.٣- نیشـانكردن (خـوازبێنی). لـە منداڵیـەوە نازداریان بۆ هێمن دیاریكردووە.

دیتن (چ.) بەرچـاو كـەوتن، وەبـەر چـاو كـەوتن، بیـنین: پێشـتر ڕۆژانـە یەكدیمان دەدیت.

دیدەنی (ن.د.) ١- دیـدار، چـوونە چـاوپێكەوتن: چـوون بـۆ دیـدەنی خزمـان پێویستە. ٢- ژووان : دیدەنی لەگەڵ یار خۆشە.

دێر (ن.) ١- جێگـەی ڕەبـەنی ئـایینی عیسـایی. (ئـاك.) ٢- لـە مێژینـە، كۆن: لە دێر زەمانـەوە كوردسـتان ئـاوەدانی تێـدابووە.٣- ڕیـزە نووسینێك لە شیعردا: دوو دێری شیعرەكەم لەبەر كردوون.

دیرۆك (ن.) مێژوو. دیرۆكا كوردان كژی دژواریە.

دێراو (ن.) خەتی شینایی بۆ تۆ چاندن: دێراوی تووتن پڕ ئاوە.

دێرین (ئان.) ١- رابـــردووی زۆر دوور، لەمێژینـــە، كـــۆن، كـــەڤن: مێـــژووی دروستبوونی هەولێر دێرینە. ٢- ناوی كچانە: دێرین جوانێكی بێ وێنەیە.

دیسا (ئاك.) دیسـان، دووبـارە، سـەرلەنوێ، جـارێكیتر.١- دیسـان قوتابییـە تەمبەلەكـە دەرنەچـوو. ٢- ئـیرۆ ژ حوسـنا دێـم دوڕێ، دیسا هیلاك و سەرخۆشین.. ڕەمزێ دڤـێ شـیرین سـوڕێ سـوهتم ب پیتا ئاتەشین.( مەلایێ جزیری)

دیسان (ئاك.) جارێكیتر، دووبارە: دیسان دوانەكەوی.

دیل (ن.) بەند، كۆت كراو، ئەسیر، لە شـەڕ گـیراو، بـن دەسـت: ئـازاردانی

دیل تاوانە. کوردە بەسیە بەردەرگای میری   سەدەی بیستەمە تاکەی دیل و ئەسیری. (هیوا).

دیمەن (ن.) ١- ڕوو، شێوە: دیمەنی بەفربارین جوانە.٢- ناوە بۆکچ: دیمەن هۆنراوەی خوێندەوە نەك چیرۆك.

دیموکرات (ن.) ١- حوکمی گەل: دیموکراتیەت رژێمێکی پێشکەوتووی ئەوروپایە. ٢- ناوی کوڕانە: دیموکرات تەها گۆانی بێژێکی کوردە.

دینار (ن.) دراڤێکە لە زۆربەی ولاٌتان بەکاردێت: مووچەکەمان بە دینارە.

دێهات (ن.) لادێ، دێ، گوند، کۆمەڵە گوندێك: ڕژێمی بەعس نزیکەی ٤٠٠٠ گوندو دێهاتی کوردستانی خاپوور کرد.

دێو (ن.) ئاژەلێکی خەیاڵی و ترسێنەرە: دێودرنج لەچیرۆکی کۆن هەیە.- انە (ن.) جۆرە دەروێشی شێخانە: دێوانە ریش درێژە. دێوانە: ئاشق: دێوانەی تۆم.

دیوار (ن.) بەرد یا بلۆك لەسەریەك دانان بۆ خانوو و بینا دروست کردن شورا: دیواری حەوشەی ماڵمان بڵندە.

دیوان (ن.) ١- دیوەخان، ماڵی گەوران، قۆناغ: نالی شاعیری ناو دیوانی بەگو پاشاکان نەبووە. ٢- سەرجەمی بەرهەمی شاعیرێك، کتێبی شیعر: شەوانە چەند بەیتە شیعرێك لە دیوانەکەی نالی دەخوێنمەوە.

دیوەخان (ن.) ژووری میوان، ژووری ئاغاو خانو بەگ: باپیرم بە دیوەخانەکەیەوە ناسراوە.

# ر

**ڕا (ن.)** ١- تەگبیر، بیروڕا، بۆچوون، ڕەئی: ڕای خۆم لەسەر بابەتەکە دەربڕی. ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**ڕائەچەنێ (ك.)** ڕادەچڵەکێت، واتە لەناو خەودا دەجوولێتو ڕادەچڵەکێ، داچڵەکان، هەستان: مرۆڤی تووشبوو بە نەخۆشی لەرزو تا لە خەودا زۆر ڕائەچەنێ.

**ڕابەر (ن.)** ١- پێشڕەو، پێشەنگ، شارەزا: بە ڕێیەکەمان نەدەزانی بۆیە پێویستمان بە ڕابەرێك هەبوو. ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**ڕابەری کردن (ن)** ڕێ نیشاندان: ئازاد ڕابەری پۆلی چوارە.

**ڕابواردن (چ.)** بەسەرچوون، کات بەڕێ کردن: تەمەنی گەنجی ڕابوورد. ژیانی بەکیف و سەیف، هەموو ژیانی بە رابواردن بەسەر برد.

**ڕابوردوو (ن.)** رابردە، بەسەرچوو: گێڕانەوەی ڕابوردوو زۆر یادگارمان بیر دەخاتەوە.

**ڕابوورین (چ.)** تێپەڕبوون. ئەو نوکە نك مە رابو.

**ڕابوون (چ.)** هەڵستان، هەستان، هەڵسان، رابوو ( کارێ رابردوویە) قوتابی ژ پێش مامۆستایڤە رابوو ژ پێڤە

**ڕاپەڕین (چ.)** ١- لەپڕبڵندبوون و هەستان: بۆ کارەکانی خۆی ڕاپەڕی.٢- لەناکاو لەخەو هەستان: لەخەو ڕاپەڕی.٣- هەستا و ڕاست بوونەوەی گەل دژی رژێم: ئەوان لەدژی بەعسیەکان راپەڕین.٤- گورج کار ئەنجام دان: بەخۆڕایی ئەرکەکانی راپەڕاند.

ڕاپێرس (ن.ب.) کەسێ کەسێ کەفسەیاکاری پێ ڕائەسپێرێ، کەسێ بێتە ڕاسپێرمان.

ڕاپێچان (چ.) لولدان، دەقی کرد، قەدکردن، قۆڵ بەست کردن: نوێنەکانی ڕاپێچان.

ڕاپێچی کردن (چ.) بردن لە گەڵ خۆیا. لوول دان: لافاوەکە دەغڵەکەی ڕاپێچ کرد.

ڕاخستن (چ.) پانکردنەوە لە عەرد: مافوورە نوێیەکەمان لە ژوورەکەدا ڕاخستووە. داپۆشینی زەوی.

ڕادان (چ.) ١- لا بردن، ماڵین، خاوێنکردنەوە: ئەوەندە بەفر باری سێ جار بانمان ڕادا. ٢- میز بە مندالکردن: پێش نووستن منداڵەکەی ڕادا.

ڕاددە (ن.) ئەندازە، بڕ. ئەو بێ ڕادە جوان بوو.

ڕاز (ن.) نهێن، سڕ، پەنهان، شاراوە: ڕازی دڵت بۆ ئەو کەسە هەڵڕێژە کە گوێت لێ دەگرێ. ڕازاندنەوە (چ.) جوانکردن: هەڵپەڕکێکەی ئێوە ئاهەنگەکەی ڕازاندبووەوە.

ڕازاندنەوە (چ.) جوان کردن، ڕێك و پێك نیشاندان لەپێشوو: ڕازاندنەوەی هۆڵەکە ئاهەنگەکە خۆشتر دەکات.

ڕازاوە (ئان.) ١- جوانکراو: بووکەکە بە جوانی ڕازاوەتەوە. ٢- ناوی کچانە: ڕازاوە کچە گەورەی خاتوو شیرینە.

ڕازی بوون(چ.) قایل بوون:بەبڕیارەکە ڕازی بوو.

ڕازی نابێت (ك.) قایل نابێ، ناهێتە خازتن، پێی خۆش نییە: باوکم ڕازی نابێت براکەم نەخوێنێت.

ڕاسا (ن.) شوێنی تەخت: زەوی یەکەی ڕاسا کرد. — بوون (چ.) ڕاست بوونەوە. هەستان لە پڕ. لەپڕ لێمان ڕاسن بوونەوە.

ڕاست (ئان.) ١- ڕێك‌و تووڵ‌و باریك، پێچەوانەی خوار: دیوارەکانی ئەو وەستایە زۆر ڕاستن. ٢- تەواو، حەقیقەت، ڕەوا، بێ درۆ: ڕاست گێڕانەوەی قسە، ئەرکە. ٣- تەخت، کۆڕ، بێ پێچ‌و پەنا: زەوییە ڕاستەکەیان کردۆتە خانوو. (ئاك.) ٤- شوێن، ناوچەیەکی دیاریکراو: لەو ڕاستە کەوتمە خوارەوە.
٥- یەکسەر، دەمودەست، یەکحاڵ: کە چاوم پێکەوت ڕاست ڕاوەستام.

ڕاستەڕێ: مرۆڤی خەراپ بە ئاسانی راستەڕێ نابێ.

ڕاستەقینە (ئان.) راستی تەواو، بێ لاری و خواری: خۆشەویستی ڕاستەقینە گیانفیدای دەوێ.

ڕاستەقینە: ڕووداوی ڕاستەقینە باوەڕ پێکراو ترن.

ڕاستەوخۆ: یەکسەر، ڕاستەخۆ دەچم بۆ قوتابخانە.

ڕاستگۆ (ن.ب.) درۆ نەکردن، ڕاستبێژ: مرۆڤی ڕاستگۆ خۆشەویستە.

ڕاستگۆ: پێویستە هەموو کات راستگۆ بین.

ڕاسپکان (چ.) لە پڕ و بە هێز جیا بوونەوە: خۆی لە ستەمی بێ ئەندازە راسپکان.

ڕاگەهاندن (چ.) بەلاڤکرن، ئاشکراکرن، هایدان، دیارکرن، خۆیاکرن: دەزگەهێن راگەهاندنێ ژنوی ئازادی بخۆڤە دیت.

ڕاگرتن (چ.) راوەستان، وەستاندن، لەکار خستن: ماوەیەکە ئۆتۆمبێلەکەمان ڕاگرتووە. هێتنەوە: کچ ڕاگرتن پەسەند نییە.

ڕاکردن (چ.) ١- هەڵاتن، غاردان، شکان: سوپای دوژمن خۆی نەگرت زوو ڕایکرد. ٢- راخستن، پانکردنەوە: دوای کوڵاندن گەنمەکەمان لەسەر بانەکە ڕاکرد. خۆ دزیڤەوە: راکردن لەڕاستی.

ڕاکشان (چ.) ١- پاڵدانەوەو درێژبوون: نەخۆشەکە ڕاکشا.٢- درێژبوون، کشان: تەلەکە بەگەرما راکشا.

ڕالێبوون (چ.) ڕەزامەندی: یاریرەکەتان زۆر جوان بوو، ڕام لێ بوو.

ڕامالین (چ.) رامــاڵین، گێســك لێــدان، خاوێنکردنــەوە: بارانەکــە جــادەو کۆڵانەکانی پاك رامالی.

ڕامشگەر (ئاب.) جۆرە گۆرانی بێژە وەك موتریب: رامشـگەر گـۆرانی تایبـەتی دەڵێ.

ڕامووسان (ن.چ.) ماچ، ماچکرن، ماچکردن. ڕاموسنێ وێ نە وەك هـەر کچـەکی یە.

ڕامیاری (ن.د.) سیاسەت، ڕامیاری لەلای ئێمە شێوازی بازرگانی گرتووە.

ڕانك (ن.) شەرواڵی پیاوانـە کـە هاوینـان لەبـەردەکرێ لەگـەڵ چۆغەڵ: رانك و چۆغەلی لەکرە.

ڕانیه (ن.) باژێرەکـە دکەڤیتـە بـاکوورێ پارێزگـەها سـلێمانیێ، دەروازێ راپــەرینا بناڤودەنگـا کـوردان بـوو کـو رۆژا (٥)ی ئـادارا ١٩٩١ ژوێرێ دەستپێکر.

ڕاهاتن (چ.) فێــر بــوون، خــوو پێــوە گــرتن: وا ڕاهـاتووم بــەیانیان زوو هەڵسم.

ڕاو (ن.) کاری ڕاوچی، کاری گرتنی باڵندە لە دەشـتو دەر بـە شـێوەی جیـا جیـای وەك تـۆر، دار، تەپکـە: چـووین بـۆ ڕاووشـکار.- کردن (چ.) چـوونە دەر بـۆ نێچـیرگرتن: راوکەرەکـە پـۆرێکی پۆرێکی راوکـرد. - ە ماسـی: ماسـی گـرتن: راوەماسـی خۆشـە لەناوکوردەوارریدا

ڕاوەستان(چ.) بەپاوەوێســـتان: لـــە لەبەیانیـــەوە ڕاوەســـتاوم: نـــەجولان، نەبزوێن.

ڕاوکەر (ن.ل.) ڕاوچی، نێچیرڤان: مام بایز ڕاوکەرێکی باش بوو.

ڕەبەق (چ.) پڕ، تەواو، خشت: دوو ساڵی ڕەبەق چاوەڕێم کردی.

ڕەبەن (ن.) دبێژنە وان کچان ئەوێن فەلە ل کەنیسێ کـار دکـەن. (ئـان.) هەژار، بێ دەسـتهەلات، کچـا نـە شـویکری. برینـدارێ رەبـەن کەسەکی ژ ترساندا خۆ لێ نـەکرە خـودان! پیـاوی ژن مـردوو یان ژن زویر بوو. ئێستا ڕەبەنم.

ڕەخساندن (چ.) بەهەڵکەوت بەدیهێنان: خوا ڕەخساندی کارەکەم ئەنجام دا.

ڕەزاشا (ن.ل.) شای ئێران بوو: ڕەزاشا خوێنمژێکی گەورەی ئێران بوو.

ڕەزامەندی (ن و.) قبول کردن، یاخی نه بوون: پێش به شـودان رەزامەنـدی یـم وەرگرن.

ڕەزڤان (ن.) باخچەڤان، وەڕاز، کەڕاخ، باخەوان، باغەوان. ئـەو رەزڤانـەکی بەرکەوتیە.

ڕەسەن (ن.) ١- بنەچەکە، نـەژاد: رەسـەنی ئێمـە ئارییـە. ٢- نـەجیب زادە: ئەسپی رەسەن بکڕە.

ڕەش داگیرسان (چ.) ڕەش بوون: لە بەر هەتاو رەش داگیرسابوو.

ڕەشەبا (ن.ل.) زریان، باڕەش، بای توند: ڕەشەبای سلێمانی بەهێزە.

ڕەشەوڵاخ (ن.) مـاڵاتی بـەرزە، گـامێش‌و گـاو گـوڵ: گۆشـتێکی چـاکی ڕەشـە وڵاخی لەگەڵ خۆی هێنابوو.

ڕەشماڵ (ن.) چادری لە مـوو دروسـتکراو، چـادری ڕەش، کـە کۆچـەران لـە کوێســتان‌و هەوارگــەکان زۆر بــەکاری دەهێــنن. بــووکی ژێردەواری ڕەش فیلمێکی کوردی بوو.

ڕەچەڵەك (ن.) ڕەگەز، ئەسڵ: کورد بە ڕەچەڵەك ئارین.

ڕەگ (ن.) ١- ڕەگی گیاو گوڵ‌و دارو درەخـت: باغەوانەکـە دارەکـەی لـە ڕەگەوە هەڵکێشا.

٢- بنچەك: دوژمنـان زۆریـان هەوڵـدا کـورد لـە ڕەگ‌و ڕیشـە لەناو ببەن.

ڕەگەز (ن.) بنەچە، ریشە، رەچەڵەك: کورد لە رەگەزی ئارییـە. — نامـە: دەبێت هـەموو کـەس خـاوەن رەگـەز نامـە بێـت. — پەرسـت: سـەردەمی رەگـەز پەرسـتی بەسـەر چـووە. — نـاس: رەگـەز ناسی زانستە.

ڕەفتار (ن.) کــاروکردەوە، هــەڵس وکــەوت، ئاکــار، شــێوە، هەســتان و دانیشتن: رەفتاری جوان مرۆڤ جوان دەکات.

ڕەق (ئان.) وشك، هشك. ڕەق و تەق مەبە.

ڕەمز (ن.) نیشانە: هێما، نووسەران ڕەمزیان لە چیرۆك بەکاردەهینا.

ڕەنج (ن.و.) مانــدوو بــوون، زەحمەتکێشــان، هــیلاك بــوون، تێکۆشــان، هەوڵدان: دەخوێنین تا ڕەنجمان بـە فـیڕۆ نـەڕوات. — دەر: ١- مرۆڤـی ڕەنجـدەر سـەر فـرازە. ٢- نـاوە بـۆ نێرینـە. — بـەر: پیاوی ڕەنجبەر ڕەنجی دەستی خۆی دەخوات. — انجاو: تۆراو، دڵشکاو: هاوڕێیە ڕەنجاوەکان ئاشتبوونەوە.

ڕەنجان (چ.) تۆران، تووڕەبوون، سڵ بوون، زیزبوون: ڕەنجانی بێ هۆ بـاش نییە.

ڕەنجان (چ.) دڵشـکان، نارەحـەت بـوون، تـووڕە بـوون، تـۆران، دڵ ئێشـاو: ئەمە ڕەنجانی ناوێ.

ڕەنجبەر (ن.ب.) ١- ئەرکدەر، زەحمەتکێش: ڕەنجبەرانی شارو دێ ڕاپـەڕین. ٢- وەرزێــری بــە کــرێ بــۆ خــەڵك: ڕەنجبــەران ڕەنجیــان بــۆ زۆردارانە.

ڕەنجدان (چ.) هەوڵدان، تێکۆشـان، خۆمانـدووکردن، زەحمەتکێشـان، ئـەرکی گران: مرۆڤ بە ڕەنجدان دەگاتە ئامانج.

ڕەنجدەر (ئان.) ڕەنجبــەر، ئــەرگ گــران، وەرزێــری بــەکرێ گــیراو، ئەرکـدەر: مرۆڤی کورد ڕەنجدەرە.

ڕەنگ (ن.) ١- چـۆنایەتی دیمــەنێك کـە دەکەوێتــە بەرچـاو وەك سـپی، ڕەش، شـین، زەرد، سـەوز....: ڕەنگـی سـپی ڕەنگـی ئاشـتیو هێمنییە لە جیهاندا. ٢- جۆر، شێوە، تەرزە.

ڕەنگاو (ن.ل.) شتێك ڕەنگ بداتەوە: کراسەکە ڕەنگاوی داوەتەوە.

ڕەنگاو ڕەنگ (ئان.) ڕەنگـین، هەمــە ڕەنــگ، هەمــە بـوار: بەرهەمــەکانی ڕەنگـاو ڕەنگن.

ڕەنگە (ئاك.) لەوانەیــە، بــۆی هەیــە، دەشــێ، وێ دەچــێ، ئەشــێ، شایەت: ڕەنگە لە ئاهەنگەکە بەشداری بکەم.

ڕەنگڕشتن (چ.) پلاندانان، بناخە دانان، نەخشە دانان.

ڕەنگین (ئان.) ١- ڕەنگاو ڕەنگ: کوێستانەکان لە هاوینـدا ڕەنگیـنن. (ن.) ٢- ناوە بۆ مێینە.

ڕەهێڵە (ن.) بارانی بە لێزمەو بە خوڕ: ڕەهێڵە باران زۆر زیانبەخشە.

ڕەو (ن.) کۆچی ناچاری، زۆرە ملێ.

ڕەوا (ئان.) هەقانیەت، یاسایی، شەرعیی: مافی ڕەوای خۆمانە خێر لە سامانی ولاتمان ببینین،

ڕەوا بوون (چ.) دروست بوون، لێوەشاوە، ڕێك كەوتن، بە جێهاتن، جێبەجێبوون: دروست بوونی دەوڵەتی کوردی مافێکی ڕەوای کوردانە.

ڕەوان (ن.) ١- هەرچیەك لە ڕۆیشتندا کۆسپی نەبێ: ئەسپی ڕەوان خۆش دەبەزێ. ٢- خوێندنەوەی بێ گرێ: کاوە بە ڕەوانی دەخوێنێتەوە. ٣-کەسێك زگی بچێ: منداڵەکە زگی ڕەوانە.

ڕەوانەکردن (چ.) ١- ناردن: ڕەوانەکردنی یارمەتی بۆ پێشمەرگەکان ئەرکێکی پیرۆز بوو. ٢- بەڕێکردن: ڕەوانەکردنی منداڵانمان بۆ قوتابخانە پێویستە.

ڕەواندز (ن.) شارۆچکەیەکی کوردستانە لە پارێزگای هەولێر، مەڵبەندی پاشای گەورە.

ڕەوڕەوە (ن.) ١- سەمت، لێشاو، ئاڕاستەی بەردەوام، ڕەوت: ڕەوڕەوەی مێژوو بەکەس ڕاناگیرێ. ٢- ئامێرێکی سادەی پێچکدارە، منداڵی پێ ڕادەهێنرێ بۆ ڕۆیشتن.

ڕەوشت (ن.) ١- ئاکار، رەفتار، داب، هەڵسوکەوت: مرۆڤی رەوشت بەرزم خۆش دەوێت.٢- ناوە بۆ نێرینە.

ڕەوین (چ) حەپەی سەگ.

ڕژدی (ن و.) رەزیلی، بەخیلی، پیسکەیی: ڕژدی نامرۆڤانەیە.

ڕژێم (ن.) جۆری حوکمڕان: ڕژێمی سۆشیالستی سەرنەکەوت.

ڕزگاربوون (چ.) ئازادبوون: ڕزگاربوونی کوردستان خەونێکی دێرینمان بوو.

ڕزگارکردن (چ.) ئازادبوون، ڕزگاربوون: ڕزگارکردنی کەرکووك سەرکەوتنێکی گەورە بوو.

ڕزگاری (ن.و.) ١- ئازادی: شەهیدبوون لە پێناو ڕزگاری سەربەرزیە. ٢- ناوی گەڕەك و قوتابخانەیە: ئامادەیی ڕزگاری لە هەولێرە.

| | |
|---|---|
| ڕزق (ن.) | خۆراك و خواردن: ڕۆژی، رزقی کەس بە دەست کەس نییە. |
| ڕزین (چ.) | پۆرتکان، تێکچوونی شت: رزینی شت هۆکاری خۆی هەیە. |
| ڕزیو (ن.ب.) | داڕزاو، ڕزاو: میوەی ڕزیو نەخۆشی لێ پەیدا دەبێ. |
| ڕچە (چ.) | ڕێگای زۆر باریك، کورەڕێ، بزنەڕێ، کویرکە ڕێ: شەهیدان رچەشکێن بوون بۆ ئازادی. |
| ڕق (ن.) | تووڕەیی، رك: دادگای سەدام رقت هەڵدەستێنێ.٢- حەزنەکردن: ڕقم لە هەندێ خواردن دەبێتەوە.- بەرقێ کردن (چ.) هەڵسوکەوت دژی یەکتری: رق بە رقی باش نیە. |
| ڕك (ن.) | کینە، کەرب: هەرچ کارەکێ مرۆڤ ژ ڕکاندا بکەت یێ پێشەمانە.(ئان.) ئەڤرازەکێ راوەستایێ بلندو ئاسێ: ب سەرکەڤتنا چیایێن رك یاگرانەو یا بوەستیانە. |
| ڕکێب (ن.) | ئاسنەکە ب هەردوو لایێن زینێ هەسپی یان ماهینێڤە دکەن، سیار پێن خۆ دکەتە تێدا دانەکەڤیت. |
| ڕم (ن.) | دارەکێ درێژەو پارچە ئاسنەکێ تیژیێ ب سەریڤە مرۆڤ بۆ شەڕیو نێچیرێ بکار دئینن. |
| ڕمان (چ.) | ڕووخان، تێکچوون، داتەپین، هەرەسهێنان، کەوتن: خانووێك بناغەکەی باش نەبێت زوو دەڕمێ. |
| ڕه (ن.) | رەگ، ریشاڵ، رهوریشال، بنج، بنەوان، بنجو بنەوان. |
| ڕۆح (ن.) | گیان: سکالایەك لەگەڵ رۆحی دەکات. |
| ڕۆژ (ن.) | ١- خۆر: گەرمای ڕۆژ پێویستییەکی سەرەکی ڕووەکانە. ٢- پێچەوانەی شەو، ئەو کاتانەی ڕۆژ بە دەرەوەیە: ڕۆژ کاتی کارکردنە. |
| ڕۆژ لەڕۆژ (ئاك.) | ڕۆژ بەڕۆژ، هەموو ڕۆژ، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ: بەرخەکە ڕۆژ لە ڕۆژ قەڵەوتر دەبێت. |
| ڕۆژئاوا (ن.) | ئەو شوێنەی ڕۆژی تێدا ئاوا دەبێ: پاپۆڕەکە بە ئاڕاستەی ڕۆژئاوا دەڕۆیشت. |
| ڕۆژگار (ئاك.) | رۆژیار، ماوەیەك لە ژیان: لەگەڵ ستەمی رۆژگار دەژیاین. |

ڕۆژکردنەوە (ن.ل.) نەنووستنە تا بەیانی، شەونخوونی: دایکەکە بەدیار منداڵەکەیەوە ڕۆژی کردەوە.

ڕۆژنامە (ن.) نوسراوێ کە دەنگ و باسی ڕۆژانە بلاو دەکاتەوە: ڕۆژنامەی هاولاتی دەخوێنمەوە. — چیێتی ڕۆژنامەگەێتی (ن و.) ڕۆژنامە نووسی خەریکی ڕۆژنامەچییێتی یە.

ڕۆژهەلات: خۆرهەلات (شوێن)، خەلکی ڕۆژهەلات زۆر بەدین و کەلتورەوە پەیوەستن.

ڕۆژی قیامەت (ئاك.) ڕۆژی هەڵسانەوە، ڕۆژی زیندووبوونەوە، ڕۆژی دوایی، ئاخیرەت: لەدوات دێم تاکو ڕۆژی قیامەت.

ڕۆشن (ئان.) ڕۆناك، دژی تاریك: چرایەك تاریکی ڕۆشن دەکاتەوە. - بیر (ئان.) کەسی تێگەیشتوو، بیر روناك: بەرۆشەنبیران ولات ئاوەدانە.

ڕۆشن (ئان.) ڕوونـاك، روون، ئاگرکردنەوە: چاوم بەدیدارت ڕۆشن بوونەوە.

ڕۆشن کردن کردنەوە (چ.) ١- دیارکردنی نەزانراو: مامۆستا ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای ژیانمانە.٢- شیکردنەوە: مامۆستا لایەنی شاراوەی هۆنراوەکەی ڕۆشن کردەوە.٣- هەلکردنەوەی ئاگر، گەشانەوە: دایکم چراکەی ڕۆشن کردەوە.

ڕۆشنا (ن.) ناسیاو، دۆست: ئاشنا و ڕۆشنامان هەیە.

ڕۆشنایی (ئان.) رووناکی: ڕۆشنایی ڕۆژ بەهێزە.

ڕۆشنبیر (ن.ب.) ڕۆناکبیر، بیرڕۆشن، زانا: مرۆڤی ڕۆشنبیر دیدو بۆچوونی جوانی هەیە.

ڕۆڵ (ن.) ١- دەور، خۆ نواندن: کورد خاوەنی ڕۆلی مێژوویی خۆیەتی. ٢- حوڵ، گێژو پەتیارە. ٣- جۆرە گیایەکە بەدار هەڵدەگەڕێ.

ڕۆلاّند هێلّ (ن.) یەکەم کەس بوو کە پوولی پۆستەی داهێنا.

ڕۆڵە (ن.) منداڵ، ساوا، نەوە، فرزەند: با ڕۆڵەکانمان بە باشی پەروەردە بکەین.

ڕۆما (ن.) پایتەختی ئیتالیا: ڕۆما شارێکی گەورەیە.

ڕۆندك (ن.) فرمێسك، ئەسرین: ڕۆندکا نەبارینە.

ڕۆیشتن (چ.) چوون، لەجێ نەمان: ڕۆیشتن بۆ قوتابخانە بەسوودە.

ڕۆیشتن (چ.) چوون، لەجێ نەمان: ڕۆیشتن بەپێ وەرزشە.

ڕواڵەت (ن.) ١- دیمەن، ئەوەی لەبەرچاوە، رووخسار: لەڕواڵەتی دیار نەبوو کە سپڵەیە.٢- دێم، دەم و چاو: ڕواڵەتێکی جورن هەیە.- رواڵەت (ئان.) بێ ڕوو، چاوقایم: بخۆرەکان هەرە بێ ڕواڵەتن.

ڕواندن (چ.) چاندن: بۆ جوانی چەند گوڵێکمان ڕواندن.

ڕوانین (چ.) سەیرکردن، تەماشاکردن: بەوردی بڕوانە بابەتەکەوە.

ڕوخسار(ن): ١- شێوەی دەرەوە، دەموچاو، ڕەنگ ورووو: هۆنراوە ناوەڕۆکو روخساری هەیە ٢- ناوەبۆمێ: روخسارمامۆستایە.

ڕوکن (ن.) پێگە، بنەما، بناغە، پێچکە: نالی روکنێکی کاریگەری شیعری بابان بوو.

ڕوو (ن.) ١- دەموچاو: ئەوەندە شەرمن بوو لەکاتی قسەکردندا ڕووی سوور هەڵگەڕا. ٢- بەری پێشەوە، لای سەرەوە، بەرگ: ڕووی خانووەکەیان لە ڕۆژهەلاتە. ٣- حەیا، شەرم: (ئان.) ٤- پایە بەرز، بەڕێز، بە حورمەت: خانەوادەیەکی زۆر بە ڕوون. ٥- قسە ڕەق: قسە هەڵناگرێتەوە زۆر لە ڕووە.

ڕوو پاك (ئان) پێویستە مرۆڤ رووپاك بێت.

ڕوو وەرگێڕان (چ.) ١- بادانەوە، خۆ سووڕاندن: ٢- پشت تێکردن، قسە لەگەڵ نەکردن: هەرگیز ڕوو لە دۆستانت وەرمەگێڕە.

ڕووان (چ.) گەشە کردن، گەورە بوون، هەڵسان، شین بوون: هەندێك داروبار خۆڕسکن و لە خۆیانەوە دەڕوێن.

ڕووبار (ن.) ١- چۆمی گەورە: ڕووباری سیروان لە کوردستانە. ٢- ناوی ژنانە: ڕووبار چیرۆك نووسێکی بە توانایە.

ڕووبەڕوو: بەرامبەر یەکتری: ئەوان رووبەڕووی یەکتری کرانەوە.

ڕووتاندن (چ.) ١- دانەسین: مریشکەکەیان رووتاندەوە. ٢- بەزۆر لێ سەندن: خەڵك رووتاندنەوە زۆر بووە.

ڕووتاو (ئان.) ١- شتێکی بێ موو: سەری ڕوتاوەتەوە. ٢- بێ تاقەت و لاواز لە برسا رووتاوەتەوە.

ڕووتەخت: کار کردن لەسەر زەوی روو تەخت ئاسانە.

ڕووتەن (ئان.) زەوی گیاو گوڵی لێ نەڕواوە، رووتاو: زەوی ڕووتەن لە کوردستان کەمە.

ڕووەك (ن.) گیا، شینکاتی. ڕووەك لەگۆشت باشترە.

ڕووجوان ڕووخسار جوان: نازدار روو جوانی خۆی دەرخست.

ڕووخۆش (ئان.) ١- خۆش ڕوو، دەم بە پێکەنین: کچێکی ڕووخۆش هات. ٢- ناوی کچانە: رووخۆش جلی کوردی لەبەرە.

ڕووخۆش: مرۆڤی روو خۆش دڵخۆشکەرە.

ڕووخان (چ.) ١- ڕمان، تێکچوون، تەپین، کەوتن: بەهۆی لافاوەکەوە حەوشەی چەند خانوویێك ڕووخان. ٢- ورە دابەزین، لە پەلوپۆ کەوتن: تیرۆر ورەی بەرزی هاولاٌتییان نارووخێنێ.

ڕوودان (چ.) رویدان، رووبدات ( کارێ رانەبردوویە.): ئەمرۆ هەرچی شتێك لە جیهاندا رووبدات دەزگاکانی راگەیاندن دەمودەست بلاٌوی دەکەنەوە.

ڕوودان (چ.) قەومان، بەسەرهات: ئەمە ڕوودانێکی مێژوویی بوو.

ڕووداو (ن.) سەرگوزشتە، بەسەرهات: هەموو کەسێك ڕووداوی خۆش و ناخۆش لە ژیانیدا دەبینێ.

ڕووڕەش: شەرمەزار، روو رەشی شەرمەزارییە.

ڕووزەرد نەخۆشی، نەساغ: نەخۆشەکە رووی زەرد بووە.

ڕووسوور: پاك، بە روو سووری لە کێشەکە دەربازی بوو.

ڕووگە (ن.) ئەو شوێنەیە کە لە نوێژدا دەبێ رووی تێکەیت: رووگەی موسڵمانان مەککەی پیرۆزە.

ڕووگەش: دەبێت بە روو گەشی کار بکەین.

ڕووگرژ: روو گرژی مرۆڤ ناشیرین دەکات.

ڕووکردن (چ.) ١- سەر بەرەو خوار ڕشتنی شت: ئەم چایە ڕووکە پیس بووە. ٢- تێکردن، کردنە ناو: پاشماوەی شتو مەك ڕووکە ناو زبڵدانەکە.

ڕوومەت (ن.) روی، دێم، دەموچاو، روو. ڕوومەتی خاڵ خاڵ بوو.

ڕوون (ئان.) ١- ساف، خاوێن، پێچەوانەی لێڵ: کانییەکە ئاوێکی ڕوونی هەبوو. ٢- ئاشکرا، بێ پەردە: مەبەستەکەت ڕوونە پێویست بە درێژدادڕی ناکا. ٣- ڕۆشن، ڕووناك: هێشتا دونیا ڕوونە، با بڕۆین. ٤- شل، تراو: نیسکێنەکە زۆر ڕوون بوو. (ن.) ٥- ڕۆن، چەوری: ئەمڕۆ چوومە بازاڕ بۆ کڕینی تەنەکە ڕوونێك.

ڕووناك (ئان.) ١- ڕۆشن، گەش، دیار، پێچەوانەی تاریك: ئەمشەو مانگە شەو بە دەرەوە بوو، بۆیە ڕووناك بوو. (ن.) ناوە بۆ مێینە.

ڕووناك کردنەوە (چ.) ١- ڕۆشنکردنەوە: ئەم گلۆپە بەر دەرگاکەی ڕۆناك کردۆتەوە. ٢- گەشانەوە، دڵخۆش بوون: بەخێر بێیت، چاوت ڕوونکردینەوە.

ڕووناك: ١- رۆشن: لە شەواندا رووناکی گلۆپەکان شار دەرازێننەوە. ٢- ناوە بۆ مێینە.

ڕووناکی (ن.م.) ڕووناهی، تیشکدانەوە: تیشکی رووناکی لە پەنجەرەکەی دا.

ڕووناکی (ن.و.) رۆشنایی - دژی تاریکی: زانین رووناکی یە.

ڕووناهی (ن.) رووناکی. رووناهی ما لا من.

ڕوی (ن.) روو، روومەت، دێم، دەموچاو: یێ دخوازیت روییەکێ رەشە، یێ نەدەت هەردوو روی.(پەندە)

ڕویت (ئان.) رووت، ریس، سادە. ئەو ڕویتە.

ڕوینشتن (چ.) دانیشتن، روینیت ( کارێ رانەبردوویێ مەرجیێیە): مرۆڤ دگەل کێ رابییت و روینیت دێ وەکی وی فێر بیت.

ڕێ (ن.) ١- شـێوەی خوێندنـەوەی پیتێکـی ئـەلف بێـی کوردییـە. ٢- ڕێگا، ڕێگە، ڕێك، ڕا، شوێنی هاتنو چوون لەسەر زەوی: ئـەم شـاخە ڕێـی سـەرکەوتنی ئاسـانە. ٣- دەمـار، مولوولـەکانی خـوێن لـە مرۆڤـدا: ئەوەنـدە لاوازە هـەموو ڕێیـەکانی لەشـی دیارن.

ریازیاتناس (ن.ب.) زانای بیرکاری: خەییام ریازیاتناس بوو.

ڕێباز (ن.ل.) ١- ڕێگـەی هاتوچـۆی زۆر: بـەو ڕێبـازەدا بـڕۆ دەگەیتـە نـاو گوندەکە. ٢- ڕێگای شۆڕشگێڕان: ڕێبازی شۆڕشـگێڕان پـڕ لـە هەورازو نشێوە.

ڕێحانە کیویلە (ن.ل.) جۆرە ڕەیحانەیەکی دەشتی بۆنخۆشـە: ڕێحانـە کێویلـە بـۆنی خۆشە.

ڕێڕەو (ن.ل.) ئاراستە، ڕێگای پێ ڕۆیشتن: ڕێڕەوی کارەکە مەگۆڕە.

ڕێز (ن.) ١- قەدرو حورمەت: ئەگەر ڕێزی خۆت بگری خـەڵکیش ئـەو پـەڕی ڕێـزت دەگـرێ. ٢- سـەف، بـە تەنیشـت یەکـەوە ڕاوەستان: کەس ناتوانێ درز بخاتـە ڕێزمانـەوە. ٣- خـەتێکی نووسین لەسەر کاغەز: هەڵەکە لە ڕێزی سێیەمدایە.

ڕێزبەستن سرە: ڕێز بەستن کێشە دروست ناکات.

ڕێزدار: بەڕێز، مرۆڤی ڕێزدار خۆشەویستە.

ڕیزکردن (چ.) هەرشتێك ڕێك بخرێ: پەرتووکەکانی ڕیزکرد.

ڕیسوابوون (چ.) ئابڕووچوون، ناوزڕاو بوون: خائینان ڕیسوابوون.

ڕیش (ن.) ڕدێن، ڕندێن، ئەڕدین: بە ڕیشە درێژەکەیەوە دەناسرێتەوە.

ڕێچکە (ن.د.) ١- ڕێگایەکی باریك: بە کـام ڕێچـکەدا دەڕۆن؟ ٢- ریزبەسـتنی گیاندار: مێرووڵەکەیان ڕێچکەیان بەستووە.

ڕێچکە (ن.ل.) ١- ڕچە: هونەرمەندان ڕێچکەی هونـەری کوردییـان پاراسـت. ٢- هێڵ ڕێچکەی مێرووڵە: لێرەوە تـا نـاو گەنمەکـە ڕێچکەی مێرووڵەیە.

ڕێگا (ن.د.) ١- ڕێ، ڕێگە، ڕا، ڕێك: ڕێگای خەباتو تێکۆشـان سـەختە. ٢- شێوە ڕێگای ئەو خۆش نییە.

| | |
|---|---|
| ڕێگاوبان: | ڕێگاو بانی زۆر بۆ گوندەکانی کوردستان دروستکراون. |
| ڕێگەگرتن | بەربەستی کردن: ڕێگا گرتن لە کاری خراپ دڵسۆزییە. |
| ڕێگر (ئان.) | جەردە: ڕێگرەکان دەستگیر کران. — ی: ڕێگری پیشەیەکی نابەجێیە. |
| ڕێکەڤتن (چ.) | ڕێکەوتن، هەڵکەوتن، دەرفەت، دەراڤ. |
| ڕێکەوتن (چ.) | پێکهاتن: ڕێکەوتنی لایەنە کوردییەکان مژدەیەکی خۆش بوو. |
| ڕێکەوتن (چ.ل.) | پێك هاتن، ڕێکەفتن، سازش: کورد لەسەر مەسەلە چارەنووس سازەکان ڕێکەوتن. |
| ڕێکخستن (چ.) | سازاندن، گونجاندن، تەرتیبکردن، تەکوز کردن: ڕێکخستنی ئەم فەرهەنگە کارێکی پیرۆز بوو. |
| ڕێواس (ن.) | ١- گیایەکی کوێستانیە دەخورێ: ڕێواس لە شاخان زۆرە.<br>٢- ناوی کچانە: ڕێواس کچێکی ژیرە. |
| ڕێوبار (ن.) | ڕێبوار، ڕێڤینگ، ڕێگاوبان. بەڕێوبار یەکتریمان بینیبوو. |
| ڕیوەڵە (ئان.) | لاواز، زەعیف: مەرج نییە فەقیر ڕیوەڵە بێ. |
| ڕاوەستە | لەجێ ی خۆت ڕاوەستە. بێ کاربوون: کارەکەی ڕاوەستا. |
| ڕژێم | نیزامی حوکمی ستەمکار: ڕژێم لە کەسی نەدەبوری. |

# ز

| | |
|---|---|
| زاخۆ (ن.) | شارێکە لە باشووری کوردستان، سەر بە پارێزگای دهۆکە: پردی دەلال لە زاخۆیە. |
| زادە (ئان.) | ١- فرزند، بێچوی یتیادەم: دایك پەرۆشی زادەی خۆیەتی. ٢- بەرهەم و ئەنجامی هەر شتێك: هۆنراوە زادەی سۆزو دڵە. |
| زار (ن.) | دەم، دەو، دەرك: منداڵی زار بچووك جوانە. وزمان: قسەو قسە لۆك، خۆت لە زارو زمانی خەڵکی بپارێزە. |
| زارۆك (ن.) | بچویك، منداڵ، زاروو، مناڵ: زارۆکێن کوردان حەز ژ خویندنێ و فێربوونێ دکەن. |
| زاراوە (ن.) | پێویستە لە کاتی نووسین زاراوەی جوان بەکار بهێنین. |
| زارپیس | دەم پیس: منداڵی زار پیس ناشیرینە. |
| زارخۆش: | ١- قسە خۆش: مام خدر پیرێکی زار خۆشە. ٢- هەڵخەلەتێنەر: ئەو زار خۆشی زگ ڕەشە! |
| زاڵ (ئان.) | ١- سەرکەوتوو. ٢- لەگەڵ زبڵ دێ بە مانای شت فڕێدان: نابێت لە کاتی گەشتو سەیراندا زبڵو زاڵ زۆر پەرتو بڵاو بکەین. |
| زاڵ بوون (چ.) | سەرکەوتن، کۆنترۆڵ کردن، دەست بەسەر ڕۆیشتن: زاڵم ناتوانن بەسەرمانا زاڵ بن. |
| زاڵبوون (چ.) | سەرکەوتن: بۆ زاڵبوون بەسەر ئەنفلۆوەنزای باڵندە دەبێت پاكو خاوێنی بپارێزینو ڕێو شوێنی چاك بگرینە بەر. |

| | |
|---|---|
| زامدار (ن.ل.) | برین، زەخم، کوڵك، بریندار، کۆڤانـدار: پـڕ دەبێتـەوە برینـی خەنجەران، بەڵام سارێژ نابێت برینی کەسەران. |
| زانا (ن.) | ١- دانـا، شـت زان، ئـەوەی ئاگـاداری زانسـتو زانیارییـەکی دیاریکراو بێ: بۆ یەکەم جار ئەدیسۆنی زانـا کارەبـای داهێنـا. ٢- ناوە بۆ نێرینە. |
| زانستگا (ئاك.) | شوێنی زانست وەرگرتن: لە زانستگا پسپۆری وەردەگرین. |
| زانیار (ن.ب.) | ١- کەمێك خاوەن زانینە، دانا: لەگـەڵێ رووەوە زانیـارە. ٢- نـاوە بۆ نێر: زانیار لەزانکۆ دەخوێنێ. زانیـار نـاوە بـۆ خـودێ، هـەر ئەو زانیارە بەو دنیا. |
| زانیاری (ن.ب.) | زانست: خوێندنەوە زانیاری زۆر دەکات. |
| زانین (چ.) | زانسـتو زانیـاری، ئاگـاداری لـە زانسـتو زانیـاری، ماریفـەت، ئاگادار بوون: زانینی کۆمپیوتەر پێویستییەکی سەردەمە. |
| زاوێتە (ن.) | نـاوی سـەیرانگایەکە لـە دهـۆك: زاوێتـە ناوچـەیەکی خـۆشو دلگیرە. |
| زایە بوون (چ.) | بەفیڕۆ چوون: رەنجیان بە زایە بوون بوو. |
| زایەڵە (ن.) | زیکـرو هـاوارو ئـاوازی مۆسـیقای بـەرز، هـاوارو دادو ڕۆڕۆ، گریان: زایەڵەی گریانی زارۆکەکە دڵبزوێنە. دەنکدانەوە. ئەمە زایەڵەی دڵمە نەك دەنگی زارم. |
| زایین (ن.) | ١- سـاڵی لـە دایـك بـوونی مەسـیح: ڕۆژی لـەدایك بـوونی عیسا جەژنە. ٢- ساڵنامەی ئنگلیـزی: سـاڵنامەی کۆچـی دوای زاییـنی دروست بوو. |
| زبارە (ن.) | هەرەوەز – یاریکاری و یارمەتی یەکتریدان بە دەستەو کۆمەڵە لـە کـاری جـووتو دروێنـەو هـەر چـتێکیتر دابـێ: لادێیـەکان هەردەم بە زبارە کار دەکەن. |

زەبر (ن.) ١- توانایی، تاقەت: پیاوێکی بەزەبرە. ٢- زوڵم: نابێ زەبر بەکار بهێنین.

زەبر (ن.) لێدانی توندو بەهێز: پێشمەرگە هەمیشە زەبری باشی لە دوژمن دەوەشاند. بە- (ئان.) بەهێز، بە توانا.

زەحمەت (ئان.) گران، قورس، ئەستەم: کارەکانم زۆر زەحمەت نەبوون.

زەحمەت (ن.) ئاستەم، ڕەنج: کارەکانی بە زەحمەت تەواو کرد. — کێش: دەبێت مافی زەحمەتکێشان پارێزراو بێت.

زەحمەتکێشان (چ.) ماندوبوون، رەنج کێشان: چینی زەحمەتکێشان چەوساوەن.

زەرد (ن.) ڕەنگێکە لە ڕەنگەکان، بەڕەنگی زێر: گەڵای زەرد هەڵوەری.

زەردە خەنە (ن.) پێکەنینی نەرم: زەردە خەنەی لێوی منداڵان جوانە.

زەردەپەڕ (ن.ل.) زەردە، زەردەی ئێواران، کاتی ئاوابوونی خۆر کە زەردە بەسەر کەلەوە بێ: کرێکارەکە لە کاتی زەردەپەڕا گەڕایەوە ماڵەوە.

زەڤی (ن.) زەوی، ئاقار، شۆف، پرێز، کێڵگە. نەچیە وێری ئەڤە تخوبێ زەڤیاوانە.

زەق (ئان.) ١- ڕوون و دیار: کارەکانی لەناویان زەق دیارە. ٢- کراوەتەوە: چاوەکانی زەق کردۆتەوە.

زەلام (ن.) پیاو، گەورە ئەو زەلامە منداڵی نییە، مێرد، مێر: بە حەوت هەشت زەلامان تا نیوەڕۆ خەریك بوون.

زەمان (ن.) دەوران، ڕۆژگار، دەمان: زەمان بڕاوە ناوی چاك ناڕوا.

زەمبیلە (ن.) زەنبیل، دەفرێکی پووشینی دەم پەلە شتی تێدا هەڵدەگیرێ: جووتیارەکان لە شەبەقی بەیاندا خۆیان بە زەمبیلەکانیان بەرەو کێڵگەکان دەچن.

زەندق (ن.) کافر، بێ دین و باوەر: زەندیقانە ڕەفتار دەکات.

زەنگ (ن.) ١- ڕوونی تواوە، ڕۆن: ٢- ئامێری بەئاگا هێنانەوە: تا زەنگەکە لێنەدرێ ناچینە ژوورەوە. (ئان.) ٣- بە زەبر، تیژی حوکم: حاکمێکی بە زەبرو زەنگە.

زەنگەنە (ن.) ناوی عەشیرەتێکە لە کوردستان.

زەوت کردن (چ.) دەست بەسەرداگرتن، لێستاندن، بەزۆربردن: زەوت کردنی مافی مرۆڤ قەدەغەیە.

زەوی (ن.) زەڤی، خاك، ئەرد: شێوەی گۆی زەوی خڕە.

زەوی (ن.) زەمین: زەوی لە سوڕانەوە دایە.

زەوی (ن.) عەرد، کێڵگە، خاك، هەرد، مەزرا، زەمین: زەوی خۆم بە کەس نافرۆشم.

زەوی‌و زار (ن.) با زەوی‌و زارەکانمان ئاوەدان بکەینەوە.

زرنگ (ئان.) ١- زیرەك، چوست، چالاك، چەلەنگ، وریا، وشیار، کارمە، گورج‌وگۆڵ: ٢- ناوە بۆ نێرینە.

زرنگ (ئان.) کارامە، زیرەك، دەست ڕەنگین، وریا، وشیار: چرۆ کچێکی زرنگە.

زرێبار (ن.) ١- گۆڵ، دەریاچە، گۆم: ٢- ناوی دەریاچەیەکە نزیکی شاری مەریوان.

زرینگانەوە (ك.د.) دەنگ لێهاتن لە زەنگوڵە یان گوێچکە: دەنگی زەنگی باوەڕی نەتەوایەتی لە گوێچکەما دەزرنگێتەوە.

زستان (ن.) وەرزێکی ساڵە لە ١٢\٢١ تا ٣\٢١ ، کاتی سەرماو سۆڵەیە.

زگ (ن.) ١- سك: منداڵەکە لە برسان زگی دێشێت. ٢- بەگزداچوون، خەریکبوون: دەست کردن بە ئەنجامدانی کارێك: لە زگ نووسینی پەرتووکێکم.

زگماك (ن.ل.) سکماك: هەرشتێك کە لە جەستەی مرۆڤ هەبێ هەر لە لەدایك بوونییەوە : منداڵەکە هەر لە زگماکەوە ڤاچی تەواو نییە.

| | |
|---|---|
| زڤڕین (چ.) | گەڕانەوە، ڤەگەڕیان، سووڕانەوە. زڤـڕین بـۆ حـەیفا رۆمانـەکا فەلەستینیە. |
| زڤستان (ن.) | زستان، وەرزەکێ سالێیە دکەڤیتە دویڤ پاییزێو بەری بهارێ. بێ ب بەفرو بارانە، سڕو سەرمایە:١- زڤستانێ دڤێت مرۆڤ خۆ باش راپێچیت. ٢- بەزستان دلێ شکستەی بـەردو سـەرمام .. بـە هاوین جەستە خەستەی دەردو گەرمام.( نالی) |
| زل (ئان.) | ١- گەورە، زەبەلاح: منالەکە زل بووە. ٢- قامیش، پووش: زلەکـە ئاگری گرت. |
| زل (ئان.) | گەورەو ئەستوور: ئەمریکا ولاتی زل هێزە. |
| زمان (ن.) | ١- جۆری ئاخاوتنی خەلك، زوبان، زبان: زانینـی زمـانی جۆراو جـۆر ئاواتمـە. ٢- پارچـە گۆشـتی بـزواوی نـاو دەم. بـەزمان دەجوی و قسە دەکات. |
| زمان پاك | دەمپاك زمان پاکی بۆ مرۆڤ پێویستە. |
| زمان پیس | دەم پیس، جویندەر، ئەو کەسێکی زمان پیس بوو. |
| زمان درێژ | ڕوو قایم، مندالی زمان درێژ بێ دەسەلاتە. |
| زمان شڕ | ناتەواو ئەو بە زمانێکی شڕ قسە دەکات. |
| زمان کورت | شەرمەزارە، ئەو کەسێکی زمان کورتە. |
| زمانزان | شارەزا لەزمان: پرشنگ کچێکی زمانزانە. |
| زنجیر (ن.) | ئەلقەی ئاسنی تێکخراو: کاتژمێرێکی زنجیر زێڕی بۆ کڕاوە. |
| زنجیرە(ن.) | بەرێز و یەك لەتەنیشت یەکەوە: زنجیرە چیاکە سەختە. |
| زۆر (ئان.) | فرە، گەلێك، پڕ، تەواو: نمرەیەکی زۆر بەرزی هێنابوو. |
| زۆرانباز: | پێشکەوت بەشداری لە پالەوانییەتی زۆرانبازی دەکات. |
| زۆرانبازی (ن.و.) | شـەری بەدەسـت، مـلێ ملانـێ و هێـز بـەکارهێنان: لـەزۆرانبازی یەکە بردیەوە. |
| زۆربلێ | زۆرگۆ، زۆربێژ، مرۆڤی زۆر بلێ پەسەند نییە. |

زۆرجار (ئاك.) گەلێ جار: زۆرجار ئاگادارم کردووە.

زۆردار (ن.د.) ستەمکار، چەوسێنەر، زاڵم: مرۆڤی زۆردار تەمەنی کورتە.

زۆرداری (ن.) هێزی گەل دەستی زۆرداری دەبڕێت.

زۆرزان: زانا: منداڵی زۆرزان زوو فێر دەبێت.

زۆرلێ کردن (چ.) زۆرە ملێی، قەوەت بەکارهێنان بۆ ڕەزامەندی: زۆری لێ کرد ئینجا ڕازی بوو.

زۆرلێکراو: ستەملێکراو، غەدر لێکراو، بەشخوراو: پێویستە داوای مافی زۆر لێکراوان بکرێت.

زۆنگاو (ن.) زەمینی هەمیشە قوڕو شل، باتلاٚغ: زەمینی زۆنگاو لە باشووری عێراقدا بۆ کشتوکاڵ بەکاردێت.

زوربە (ئان.) زیاترین، زۆرترین: زۆربەی خەلك دادگای سەدامیان دی.

زولاٚڵ (ئان.) خۆش دەنگ، ڕەوانی دەنگو ئاواز: حەسەن زیرەك دەنگێکی زولاٚڵی هەبوو.

زوڵمەت (ئان.) ١- زوڵم، چەوسانەوە، غەدر، جەور، ستەم، بێگار: ئەم هەموو زوڵمەتە چییە.٢- تاریکی. شەوی زوڵمەت لەتاریکی زولفت دایە.

زوو (ئان.) ١- پەلە، لەز، خێرا: بۆ ئەوەی زوو بگەینە ئاوات پێویستە خۆمان ڕێك بخەینەوە. ٢- کات: هێشتا زووە بۆ باسکردنی بابەتەکەمان.٣- دێر زەمان، کۆن: لە زووەوە کورد بۆ ئازادی لەخەبات دایە.

زووخاو (ن.) کێم و خوێنی تێکەلاٚو: شەهیدانی چوارچرا زووخاویان لێدەتکا.

زێ (ن.) ١- چۆمی گەورە، رووبار، شەت، دەریا: زێی گەورە دەڕژێتە رووباری دیجلە.

زیادی (ن.و.) زۆری، زێتر: نرخ گرانی لەزیادی دایە.

زیان (ن.) زەرەر، دژی قازانجە، دۆڕان. زیانێکی زۆریان لێکەوت

زیان (ن.) زەرەرو پێچەوانەی کەڵك و قازانج: زۆرخواردن زیان بەخشە.

زیاندار (ئان.) زیان بەخشیو: هەندێ جانەوەر زیاندارن.

زیت بوونەوە (چ.) ڤیت بوونەوە، ڕاپەڕینی جانەوەر: بەوبارانە جانەوەر زیت بوونەوە.

زێد (ئاك.) نیشتمان، مەڵبەند، وڵات: زێدی بابو باپیرانمان وەك چاومان دەیپارێزین.

زیدەوان (ن.و.) پاسەوانی گۆڕ. ئەم گۆڕستانە پێویستی بە زێدەوانە.

زێڕ (ن.) کانزایەکی بەنرخ و زەردە: زێڕ لەئاگردا نا فەوتێ.

زیڕە (ن.و.) دەنگی زۆر، هاوار: زیڕەی خستە دڵی زۆرداران. گریان: زیڕە زیڕی منداڵ هەراسانی کردووم.

زیرەکی (ئان.) ژیری، هۆش، سەلیقە، وشیاریو زرنگی، هۆشیاری: زیرەکی بەهرەیەکی خوداییە.

زێڕین (ئان.) ١- شتی دروستکراو لە زێڕ: دوای دەرچوونی بەیەکەم، کاتژمێرێکی زێڕینیان پێ بەخشی. ٢- گران بەها، دەگمەن: ئەگەر لە دەستی نەدا، کورد دەرفەتێکی زێڕینی بۆ هەڵکەوتووە. (ن.) ٣- ناوە بۆ مێینە.

زین (ن.) ١- جلی سەر پشتی ئەسپ: بۆ ئەوەی سەلامەت بێت سوار پێویستە زین بخاتە سەر پشتی ئەسپەکەی. ٢- ناوە بۆ مێینە، زین دوڵبەری مەمی ئالان بوو.

| | |
|---|---|
| زیندان (ن.) | بەندیخانــە، گرتیخانــە، دیلخانــە: گەلـەك پـیرو لاو و زارۆکـێن کوردان د زیندانێن بەعسا فاشستدا شەهید بووینە. |
| زیندەوەر (ن.) | گیانلەبەر، گیانەوەر، بەگیان. ئەم ماڵە هەموو بۆتە زیندەوەر. |
| زیو (ن.) | زیڤ، کانزایەکی لە زێر نرخ کەمترەو سپی یە: سینی یەکـە لـە زیو دروست کراوە. - ین (ت.) هەرچی لـە زیـو دروسـت کـراوە، زیو ئاسا: ئەلقەی زیوین جوانە. |

# س

**سات (ئاك.)** کات، دەم، وەخت، گاڤ ، تاو: ساتە خۆشەکانی ژیان لە یاد ناکرێن.

**ساخ (ئان.)** ساغ، نەشکەستی، نەشکاو، دروست، چاك، خۆش: گویزا ساخ یا دیارەو یا پویچو کرمی ژی یا دیارە.+ بوون (چ.). + کرن(چ.).

**سادە (ئان.)** ١- بێ گرێ و ئاڵۆزی و نەخش: کراسەکەی سادەیە. ٢- هاسان: کارێکی سادەیە. ٣- مرۆڤی بێ فێل، بەسە زمان: کابرا زۆر سادەیە.

**سارد (ئان.)** ١- فێنك، پێچەوانەی گەرم: زستانی ڕابردوو سارد بوو. ٢- بێ مەیلو بێ ئارەزوو: لە قسەکردندا لەگەڵ خەڵکی سارد مەبە. (ن.) ٣- جۆرە خواردنەوەیەك، بیبسیو کۆلا: لامان دا یەکەو ساردمان خواردەوە بۆیە دوا کەوتین.

**سارد (ئان.)** خواردنی سارد خۆش نییە: - ی: دەبێت خۆمان لە ساردی زستان بپارێزین. — کردن: هەندێك خۆراك بە سارد کردن دەپارێزرێن. — بوون: سارد بوون لەسەر خوێندن دوات دەخات. — و سڕ، بێ ڕێزی: ئەو بە ساردو سڕی پێشوازی لێکردین.

**سارداو (ن.)** ناوی لادێیەکە لە ناوچەی سۆان: سارداو گوندێکی دلگیرە.

**ساردکردنەوە (چ.)** ١- هێنانەوە دۆخی ئاسایی، ساردکردنەوەی شتی گەرم: شیرەکە زۆر گەرمە بۆیە تا ساردی نەکەنەوە پێم ناخورێ. ٢- نائومێد کردن، دەست پێ بەردان: ئەوەندەی لەگەڵ گوتم تا لە کارەکەی سارد کردمەوە. ٣- کوشتن: بە گوللەیەك ساردی کردەوە.

| | |
|---|---|
| ساڕێژ (ن.) | پڕبونـەوەی بـرین، چـابوونەوە: شـوین برینـی زمـان سـاڕێژ نابێ. |
| ساز (ئاك.) | ئامادە، خۆش، گونجاو: من خۆم سازداوە. |
| ساز (ئان.) | ١- ئامادە، گونجاو: بـۆ ئـەم تاقیکردنەوەیـە خـۆم بـاش سـازو ئامادە دەکەم. ٢- دەوڵەمەند: بـۆ خـۆی سـازە بۆیـە مننـەتی بە بارودۆخەکە نییە. (ن.) ٣- ئامێرێکی مۆسیقایە، تەنبور، تەمبور: ساز، یەکێکە لە ئامێرە ڕۆژهەلاّتییەکان. |
| سازگار (ئان.) | ١- فێنك، خۆش، ناوچەی کوێستان: ئـاو و هـەوای کوردسـتان سازگارە.٢- بێ گەرد، پاکژ: ئـاوی کانییەکـە سـازگارە. ٣- نـاوە بۆ مێینە. |
| سازمان (ن.) | ١- ڕێکخراو: سازمانی خەبات تێکۆشەرانی کوردی ڕۆژهەلاّتن. ٢- دەزگا: کاوە لە سازمانی ڕاگەیاندن کار دەکات. |
| ساسانی (ن.) | سـەردەمێکی کۆنـە، هـەروەها نـاوی بنەماڵەیـە: ساسـانی سەردەمێکی مێژوویی بوو. |
| ساڤا (ن.ئان.) | ساوا، بچویك، منداڵی گچکە. وەختی دایکاوی مـری ئـەو سـاڤا بوو. |
| ساغ (ئان.) | ١- نەشـکاوی بـێ عـەیب: شـتەکانیم بـە سـاغی دایـەوە. ٢- تەندروستی و بێماری: لەشت ساغ بێ. ٣- مرۆی بێ عـەیب و فیل: مامەڵەی بە ساغی دەکات. |
| ساغ کردنەوە (چ.) | ڕۆشن کردنەوەی شتی نەزانراو: مەسەلەکەی ساغ کردەوە. |
| ساف بوون (چ.) | ١- نەمانی پەڵە لە ئاسمان: ئاسمان ساف بوو. ٢- نەمانی خلت و زیـخ لـە ئـاو: ئاوەکـە سـاف بـووە. ٣- بـێ گـنج و لـووس: پرچێکی سافی هەبوو. |
| ساقۆ (ن.) | پاڵتۆ، چاکەت، قاپووت: ساقۆیەکی گەرمم کڕی. |
| ساکار (ئان.) | ١- ئاسان: کارێکی ئاسان و ساکارە. ٢- بێ فێل و سادە: مرۆڤـی ساکار ژیانی ئاسانە. |
| ساڵ (ن.) | بریتی یە لە دوانزە مانگ: ساڵانی عومر بەفیڕۆ مەدە. |

سالْ ژمێر (ن.) سالْنامه، رۆژنامه: سالژمیرەکەم له دیوار دا.

سام (ئان.) ترس‌و بیمه: رووباری گەورە بە سامه. — گرتی: (ترساو) منداڵەکە سام گرتی بووه.

سامالْ (ئان.) ساف، روون، ئاسمان لە کاتی بێهەوریدا: ئاسمان سامالْ بوو.

سامان (ن.) مالْ و پارە، دارایی، دەولْەت، سەرمایە: سامانێکی زۆری هەیە.

سامناك(ن.د.)(ئان.) ترسناك، تاف‌و سام نیشتن، سام کردن، لێترسان: رووداوی دوێنێ کارەساتێکی سامناك بوو.

ساناهی (ن.و.) ئاسان، بێ ماندووبوون، بێ وەستیان. مە زۆر ب ساناهی جوابدا.

ساهی (ئان.) زەلاڵ، سامالْ، بێ هەور. ئاسمان ساهی بوو.

ساوا (ئان.) ١- ساڤا، هەرچی تازە ڕسکاوە بۆ منداڵ: منداڵی ساوا پەپوولەیە. ٢- تازە پێگەیشتوو، بۆ نەمام‌و دارو دوڕ: نەمامی ساوا بڕوێنە.

سایە (ن.) نسار، سێبەر، نزار: لە سایەی خودا باشین.

سایەقە (ئان.) بەستن‌و رەق بوونی بەفرو سەختی ئاو و هەوا، ئاسمانی بێ هەورو تەمومژ پاش بارینی بەفر: بە سەرماو سایەقەی زستان خوێندن بەردەوامە.

سبەی (ئاك.) سبە، بەیانی، ڕۆژی دادێ: ئەمڕۆ نەمتوانی بەلاَم سبەی دێم.

ستایش (ن.) باسکردنی لایەنی باش، پیاهەلْدان: نالی هۆنراوەی ستایشی ئاینی هەیە.

سەبا (ن.) بای خۆر هەلاَت: سەبا هەلْی کرد.

| | |
|---|---|
| سەبارەت (ن.) | ١- لەبەر، بۆ خاتری: سەبارەت بە تۆ نەبا یارێکی دیکەم دەگرت. ٢- دەربارەی: سەبارەت بە چی گفتو گۆتان کرد. |
| سەبەتە (ن.) | تلین، دەفرێکە لە (شوارك) لکەداری تەڕ دروست دەکرێ: سەبەتە بۆ هەلگرتنی شت بەکار دێت. — بەسەر: جۆرە یارییەکی کوردەواری منداڵانەیە: منداڵان سەبەتە بەسەرانێ دەکەن. — فرۆش: سەبەتە فۆرشەکە سەبەتەی جوانی لا هەیە. |
| سەبیل (ن.) | شتێکی خواری کون کونە تووتنی پێ دەکێشرێت: پیرەمێردەکان زیاتر سەبیل دەکێشن. |
| ستەم (ن.) | ١- زولم و ناهەقی: ستەم لەکەس مەکە. ٢- دژوار، حەستەم: ئەم کارەم ستەمە. |
| ستەمو زۆرداری (ئان.) (ن.و.) | ١- زوڵمو زۆرداری، ئازارو سزا بە ناڕەوا، بێدادی بە زۆر. ٢- چەوساندنەوە، زیانو ئازاری ناڕەوا بەم و بەو: ڕژێمی بەعس ستەمو زۆرداریيەکی زۆری لە میللەتی کورد کرد. |
| ستەمدیدە (ئان.) | زوڵم لێکراو: گەلی ستەمدیدە هەردەم بەشخوراوە. |
| سەخت (ئان.) | قایم، پتەو، توند، دژوار، ئاستەم، گران، حاسێ، زەحمەت، سفت: سەرکەوتن بەسەر چیای ئێڤرێست سەختە. |
| سەختی (ن.) | سەخڵەتی، تەنگانە، ناخۆشی: هەوری ژیانی سەختیو هەژاری تێپەڕی. |
| سەدان (ژ.) | چەند سەدێك: سەدان لاو چوونە بەر پەتی سێدارە. |
| سەر (ن.) | ١- نووکی هەموو شتێ: ٢- کەللە، لە ئەستۆ بەرەو ژوور. ٣- چەند سەر خێزانێك رزگاریان بوو. دانە دانەی خێزانو مەڕو ماڵات: مام برایم چەند سەر مەڕو بزنی هەن. ٤- داپۆشی هەر شتێك، قەپاغ: ٥- خاتر، لەبەر: لەسەر تۆ وام بەسەر هات. ٦- ئاکام، دوا ڕۆژ، ئاخر: مرۆڤ هەتا سەر لە تەمەنی خۆی نابێ. (ئاك.) ٧- لا، لەم سەر تا ئەو سەر. ٨- کن، نك، لا: دوێنێ لە ڕێدا ئۆتۆمبێلەکەم تێکچوو دواتر بردمە سەر وەستا. ٨- زیارەت: پێکەوە دەچینە سەر بۆکێ. پێکەوە دەچینە سەرچاکی. |

سەر شۆڕ (ئان.) مل کەچ، شەرمەزارو خەجاڵەت: بەسەر شۆری مەژین.

سەرۆك (ن.د.) سەردار، سەرگەورە، پێشەوا: سەرۆك قازی محەممەد نەترسانە چووە بەر پەتی سێدارە.

سەرا (ن.) کۆشك، تەلار، قشڵەی میری، خانوویەکی گەورەیە کە فەرمانبەرانی دەوڵەت کاروباری میری تێدا هەڵدەسوورێنن: بێکەسی شاعیر بەشداری ڕاپەڕینەکەی ٦ ی ئەیلولی ١٩٣٠ بەردەرکی سەرای کرد.

سەراپا (ئاك.) ١- سەرتاپا، هەموو، گشت، هەموو ئەندام: سەرتاپای گیانم دەناڵێنێ. ٢- بۆ زەوی و خاك: سەرتاپای باشوری کوردستان ئازاد کرا.

سەرانە (ن.د.) پیتاك، وەرگرتنی پیتاك بەپێی ژمارەی شتەکان: دەوڵەت سەرانەی زیاد کردووە.

سەرانسەر (ئاك.) هەموو، لەوسەر تا ئەوسەر: سەرانسەری ئەو سی ساڵە ڕزگار بووین.

سەرانسەر (ئان.) هەمی، هەموو، خڕ: خەڵکی سەرانسەری کوردستان فیدرالیەتی هەڵبژاردووە.

سەرباز (ن.ل.) ١- چەکداری دەوڵەت: سەربازەکان لە جەنگ هەڵاتن. ٢- ناوی کورانە: سەرباز پێشمەرگەیەکی پاڵەوان بوو.

سەربان (ن.) سەرەوەی بان. لەسەربان دادەنیشین.

سەربەخۆ (ئان.) سەربەست، ئازاد بەڕەڵڵا: دەبێت مرۆڤ لە هەڵبژاردندا سەربەخۆ بێ. ئەو بابەیەکی سەربەخۆیە.

سەربەرز (ئان.) سەر بڵند: بەسەر بەرزی بژی. ئەو هەردەم سەربەرزە بە هەڵویستەکانی

سەربەست (ن.ل.) ئازاد، سەربەخۆ، بەڕەڵا: گرنگە سەربەست.٢- ناوە بۆ نێرینە: سەربەست هات. ئەو سەربەستە لەوەی دەیکا.

سەربەستی (ن.و.) ئازادی، خۆسەری، سەربەخۆیی: سەربەستیش سنووری خۆی هەیە.

سەرەو ژوور (ئاك.) ڕووەو ژووورەوە، سەرەو ژوور: پیاوەکە سەرەو ژوور هەڵات.

سەرتۆپ (ن.ل.) زۆرباش، زۆر جوان، سەردەستە: ڤیان سەرتۆپی جوانانە.

سەرەتا (ئاك.) دەسپێك، پێش وتار و نووسین: سەرەتای دارِشتنەكەی جوانە.

سەرەتا (ن.) دەستپێك، پێش دەست، پێشەكی، بەرایی: سەرەتایەكی باشم بۆ گۆڤارەكە دارِشت.

سەرەتان (ن.) نەخۆشی شێرپەنجە، تیراوە: شێرپەنجە مەترسیدارە.

سەرەمەرگ (ئاك.) وادەی رِوح دەرچوون، كاتی مردن: دوژمنانی كورد لەسەرەمەرگدان.

سەرەمەرگ (ئال.) كاتی گیان مردن و روح دان: لەسەرەمەرگا تۆبەی كرد.

سەرەو نوگون (ئاك.) سەرەو خوار، بەرەو ژوور: سیامەند سەرەونوگون كەوتە خوارێ. ون بوون: ئەو بە یەكجاری سەرەو نوگون بوو.

سەرەولێژ (ئاك.) سەرەو خوار، سەربەرەو ژێر: ئاوەكە سەرەو لێژ دەرِوات.

سەرپەرشتی كردن(چ.) ئاگادارو بەخێر: هەتیوەكەی سەر پەرشت كرد.

سەرخەو (ن.ل.) كەمە نووستنێكە، كەمە چاوگەرم كردنێكە: جووتیارەكان لە چێشتەنگاودا لەسەر كانییەكە سەرخەوێكیان شكاند.

سەرخەو شكاندن (چ.) نوستنێكی كورت: سەر خەوێكم شكاند.

سەردان (چ.) زیارەت، چوونە لا: سەردانی ئازادم كرد لە نەخۆشخانە.

سەردانواندن (چ.) سەرشۆرِكردن، سەرنزم كردن، سەرهێنانە خوار، ملكەچ كردن: سەردانواندن بۆ دوژمن كاری نامەردانە.

سەرداو (ن.) ژێر زەمین، مارات، سارداو. ئەو لەسەرداوەكە مرد.

سەردەم (ئاك.) كات، وەخت، رِۆژگار: لەسەردەمێكدا ئەو پاشا بوو. -ی دەرەبەگ (ئاك.) چاخی رِژێمی كۆنە پەرستی، كاتی دەسەلاتی دەرەبەگ و ئاغاكان: سەردەمی دەرەبەگ بۆ جووتیار تاریك بوو.

سەردەم (ئاك.) كات، وەخت، قۆناغ. سەردەم، سەردەمی یەكتر خوێندنەوەیە.

سەردەمیی (ن.م.) تازە، نوێ، هاوچەرخ، هەنووكەیی، سەردەمیانە: مافی خۆمانە سەردەمی بژین.

سەرژنوی (ئاك.) سەرلەنوێ، لەسەرەتاوە. پێدڤیە سەر ژنوی پێكۆڵی بكەین.

| | |
|---|---|
| سەررەو (ئان.) | ١- ئـەوەی زۆر گـوێ بـەكاروبار نـادا؛ نابێـت سـەررەو بـین لـە بەرێوەبردنی كاروباردا، ٢- پڕتاو، هەنگاو هاوێشتنی توند. |
| سەرسەنگ (ن.) | ١- هاوینەهـەوارێكی خۆشـە لـە ناوچـەی بادینـان. گەشـتی قوتابیان بۆ هاوینە هەواری سەرسەنگ بوو. ٢- شتێك زیـاتر لە خۆی بكێشرێت بخرێتە سەر تەرازوو؛ |
| سەرشاخ (ئاك.) | ١- سەركێو، سەرچیا: پێشمەرگەكان پـۆل پـۆل چـوونە سـەر شاخ.<br>٢- شاخی حەیوان: سەرشاخی بزنەكە بەر دیوارەكە كەوت. |
| سەرچاو (ئاك.) | ١- بان چاو: سەرچاوم هاتی بۆ ئێرە. ٢- بـان چـاو ( ئەنـدام): سەرچـاوی منداڵەكـە سـوور هەڵگـەڕاوە. ٣- سەرچـاوەی ئـاو: سەرچاوەی ئاوەكە لێڵ بووە. |
| سەرچاوە (ن.) | ١- سەرچاوگەی ئاو و كانی: لای سەرچـاوەی كـانی دانیشـتین. ٢- كتێـب و بەرهـەم: چـەند سەرچـاوەیەكم بـەكارهێنا بـۆ نووسین. |
| سەرچڵ (ن.) | سەرلق: سەر چلی هەموو دارێكە. |
| سەرچنار (ئاڵ.) | سەر چنار لەشاری سولێمانی یە. |
| سەرگەرم (ئان.) | ١- تورەو توند: بەهەموو شتێ سەر گـەرم دەبـێ. ٢- خـەریكی كار، سەرقاڵ: سەرگەرمی وشەی فەرهەنگم. |
| سەرفرازی (ن.) | سـەربلندی، سـەربەرزی، شـكۆمەندی: سـەرفرازی دەستكەڤتەكە ب پارێ جیهانێ ناهێتە كرین. |
| سەرقاڵ (ئان.) | پڕ كار، نەپرژان، مژول ئیش‌و كـاری زۆر: جـوامێر سـەرقاڵی خوێندنە. |
| سەرقاڵ بوون: | سەرقاڵ بوون لە بێكاری باشترە. |
| سەرقاڵ كردن: | خـەریك كـردن، سـەرقاڵ كردنـی خـەڵك بـەكاری چـاك سوودمەندە. سەرقاڵی: مژۆڵ بوون، خەریك بوون، سـەرقاڵی كات لە مرۆڤ دەگرێت. |
| سەرقوت (ن.) | سەركۆت، بێ چارشێو و لەچكە: ژنەكان سەرقۆت بوون. |
| سەركەش (ئان.) | سەرچڵ، یاخی، سەربەرز: چیاكانی كوردستان سەركەشن. |

سەرکەڤتن (چ.) سەرکەوتن، چوونە سەرەوە، دەرچوون. گرنگ ئەوە ب دروستی سەرکەڤین.

سەرکەوتن (چ.) ١- بەرەو ژوور چوون: منداڵەکان سەرکەوتنە سەر بانەکە. ٢- گەیشتنە مەبەست: پێشمەرگەکان بەسەر دوژمندا سەرکەوتن.

سەرکەوتوو (ن.ب.) ١- بەرەو ژوور چوون: منداڵەکە ئازایانە بەسەر پەیژەکەدا سەرکەوتووە. ٢- گەیشتن بە ئامانج: قوتابییەکە لە وانەکانی سەرکەوتووە.

سەرکردایەتی (ئاك.) ١- سەرکردە، سەرۆکی پێشمەرگان، فەرماندەی لەشکر، پێشەوا. ٢- شوێنی سەرکردایەتی پێشمەرگە: فەرمانی لەشکری لە سەرکردایەتییەوە دەردەچێت.

سەرکردە (ن.) ڕێبەر، پێشەوا، فەرماندە، سەرۆك: شێخ مەحموودی سەرکردە شاعیریش بوو.

سەرکردە (ن.ب.) فەرماندەی لەشکر: سەرکردەی هێزەکە لە جەنگەکەدا بریندار بوو.

سەرما (ن.) دژی گەرما: سەرمای زستان ڕۆیشت.

سەرنج (ئاك.) تێبینی، تێڕوانین، لێ ڕامان، تێفکرین: کورد سەرنجی دۆستانی ڕاکێشاوە.

سەرنج (ن.) دیقەت، ڕوانین و وردبوونەوە: سەرنج لە کارەکەت بدە.

سەرنجدان (چ.) تەماشا کردن، بەوردی لێ ڕوانین، دیقەتدان: سەرنج لێدانەکەم بەلاوە سەیر بوو.

سەرنجدان (چ.) تێ ڕوانین، لێ وردبوونەوە، تێ فکرین، لێ ڕامان، تێبینی کردن: زۆر سەرنجمان لەو کارە داوە.

سەرهەلدان (چ.) ڕابوون، ڕاپەڕین: سەرهەلدانا مللەتان ژ ئەگەرا چەوساندنێیە.

سەرهەنگ (ن.ل.) ١ - دایکی مێش هەنگوین، شاهەنگ: لەناو مێش هەنگوینەکان سەرهەنگەکەشیان لەگەڵدایە. ٢- پلەیەکی سەربازییە: سەرهەنگ قەزافی زۆری داکۆکی لە کورد کردووە. ٣- ناوی پیاوانە: سەرهەنگ لە ئەڵمانیاوە گەڕایەوە بۆکوردستان.

سەروو (ئاك.) ١- لای ژووروو: لای سەروو دانیشە.

سەگ (ن.) سە،کسۆك، تووتك: سەگ بەوەفایە.

سەلاً (ن.) وێرد، سەلاوات، نزا، پاڕانەوە، نوێژ: سەلاً مرۆڤ پاك دەکاتەوە.

سەلام (ن.) ١- ناوێکی خودایە: خودا تەعالا سەلامە. ٢- بونی ئاسایش و هێمنی: خۆزگە خەلکی بەسەلام بژین. ٣- ناوی شاعیرێکە: سەلام یەکێکە لە شاعیرانی قوتابخانەی نالی.

سەلماندن (چ.) ١- بەلگە هێنان: بیر دۆزەکە بسەلمێنە. ٢- قەبوولاندن: سەلماندی کە هەڵەکە هی خۆیەتی.

سەلیقە (ن.) توانای، بەهرە: تۆ زۆر بە سەلیقەیت.

سەما (ن.) یاری کردن، هەڵپەڕکێ، دیلان: تیپێکی سەما سازکرا.

سەندن (چ.) ١- ئەستاندن، لێ وەرگرتن بە زۆر: ٢- وەدەستهێنان: بە هەوڵو ماندوو بوونی خۆم ئەو نمرەیەم سەندووە.

سەندن (چ.) بردن: گۆڤارەکەی لێ سەندم.

سەنگ (ن.) ١- قورسایی، کێش. بەردێکی بەسەنگە.

سەنگەر (ن.) ١- حەشارگە، سیپە، خەندەك، شوێنێکە کە مرۆڤ خۆی تێدا حەشار دەدا لە کاتی شەڕدا. پێشمەرگە بۆ پاراستنی کوردستان هەمیشە لە سەنگەر بوون.٢- بەرە. ئەو هەر لەسەنگەری پێشەوە بوو.

سەنگەربەستی (ن.ل.) دروستکردنی چەند قەلاًو سوپەرێکە بە گردی شوێنێکدا بۆ پاراستنی لە دوژمن: پێشمەرگە قارەمانەکان سەنگەری دوژمنیان بەزاند.

سەهم (ن.و.) ترس. ئەو سەهمە زۆرە.

**سەودا (ن.)** ١- ئـاڵووێر، مامەڵـە، گۆڕینـەوە: سـەودای بـە ئۆتۆمبێلەکـەی خۆی کردووە. ٢- ئارەزوو، خولیا: سەودای خوێندنی باڵا لـە مێشـکی داوە. ٣- دڵـداریو ئـەڤینی، تامـەزرۆ: سـەودای کچەکەیان بووە.

**سەوز (ئان.)** ڕەنگی سەوز، کەسك، سەبز. لەبەهاردا دنیا سەوز دەبێ.

**سەوز (ئان.)** کەسك: ڕەنگی سەوزم خۆش دەوێ. - بوون: شـین بـوون (چ.) نەمامەکە سەوز بوو.

**سەوزەگیا (ن.ل.)** گیای سەوز: لە بەهاران سەوزەگیا زەوی دادەپۆشێ.

**سەیر (ئان.)** عەجایب، عەنتیکە، سەمەرە، ڕەفتارەکانی سەیرن.

**سەیر کردن (چ.)** تەماشا کردن، تێ ڕوانین، سەرنجدان: نابێت بـە سـەیرکردنی تەلەفزیۆن کاتی خوێندن بفەوتێنین.

**سەیوان (ن.)** ١- چەتر، خێوە. ٢- ناوی گردێکـە لـە قـەراغ شـاری سلێمانی، گۆڕسـتانی شـارەکەیە: گـردی سـەیوان بۆتـە مـەنزڵگای زانـاو شاعیران.

**سپلە (ئان.)** بێ ئەمەك، بێ وەفا: هـاوڕێ یـی سـپلە مەکـە. سـەگ نانبـد، سپڵە نان مەدە.

**سپڵەیی (ئان.)** بەدنمەکی، بێنمەکی، نانکوێری، لەبەر چاو نەبوونی چاکەی خەڵك: هاوڕێیەتی مرۆڤی سپڵە مەکە.

**سپی (ئاك.)** ڕەنگـی سـپی، پێچـەوانەی ڕەش: سـپی ڕەنگـی پـاکیو بـێ گەردییە.

**سڕ (ن.)** سەرمایەکی زۆر: ڤـێ زڤسـتانێ ژ بـەر نـەبوونا سـووتەمەنیێ سڕێ ئەم برین!

**سڕبوون (چ.)** باوشین، پەككەوتنی ئەنـدامێکی لـەش، بـە تایبـەتی دەسـتو پـێ، لەبـەر ئـەوەی کـە خـوێن بـە ڕێکـی ناگـاتێ: لەسـەرما دەستو پێی نەخۆشەکە سڕ بووبوون.

**سڕبوون (چ.)** تەزین، گۆدبوون، ساردبوون: دەستەکانم سڕبوون.

**سرکاندن (چ.)** چرپاندن، بە ئەسپایی قسەکردن: لە بن گوێیان سرکاندووە.

| | |
|---|---|
| سروشت (ن.) | ١- سرشت، خۆكرد، خۆڕسك، له خۆوه: دیمەنەكانی سروشت له بەهاردا زۆر جوانن. ٢- ناوه بۆ مێینه. |
| سزا (ن.) | پێچەوانەی پاداشت، لێپێچانەوه لەسەر كاری خراپ: سزا بە پێی یاسا دیاری دەكرێت. |
| سڤك (ئان.) | سووك، سانا، ساناهی، ئاسان: سڤكا دایێ داپیره.( پەندە) |
| سفره (ن.) | خوان، ئاوازی له سەر خواردن: لەسەر سفره كۆ بووینەوه. |
| سك (ن.) | ١- زگ: سك ئێشه ناخۆشه. ٢- سكی منداڵبوون: ژنەكه سكی هەیه. ٣- سك سووتان: ژنی سك سووتاو دڵناسكه. |
| سكاڵا (ن.) | شكایەت: پێویسته سكاڵای خۆمان له دادگا بكەین. — كردن: سكاڵا كردن له دادگا دەبێت. |
| سكچوون (چ.) | زگ چوون، رەوان: سكچوون لە ئەنجامی چەوری خواردن ڕوو دەدات. |
| سڵاو (ن.) | سلاڤ، سەلام: ئەگەر برادەرەكانم نەبینم سڵاویان بۆ دەنێرم. |
| سمڵ (ن.) | بنكی گیایەكی بەهاری بۆن خۆشه: بۆنی سمڵ سروشتییه. |
| سمێڵ (ن.) | سمبێل، مووی پشت لێوی پیاو: ئەوەی سمێڵ سوور بوو هەمزه ئاغا نییه. |
| سمین (چ.) | كون كردن: گوێ ی منداڵەكەی سمی. |
| سنه (ن.) | شارێكی گەورەیه له ڕۆژهەڵاتی كوردستان: سنەو سابلاغ شاری خۆشن. |
| سنەوبەر (ن.ل.) | ١- ناوی داره: سنەوبەر دارێكی بەرزه. ٢- ناوی ژنانه: خوشكه سنەوبەر له ڕاپەڕینی قەڵادزێ شەهیدكرا. |
| سنگ (ن.) | ١- سینه، لەسگ بەرەو ژوور تا خوار مل: دەبێ سینگمان فراوان بێ. ٢- بزماری گەوره لەدار: سینگێكی له دیوار كوتا. |
| سنوور (ن.) | تخوب، كەنار، رۆخ: حەمرین له باشوور سنووری كوردستانه. |
| سهك (ن.) | سیركه، تورشی، ترش، سركه. ئەو پێدڤی پیچەك سهكێیه. |

| | |
|---|---|
| سۆبە (ن.) | گەرم کەرەوە: سۆبەی دار گەرمی زۆرە. |
| سۆز (ن.) | ١- بەڵێن، خۆشەویستی، سوێندخواردن، پەیمان، گفت، قەول، شادی و کەیف، گۆرانی خەمبار: من سۆزم داوە بە گەلەکەم بۆی تێبکۆشم.٢- بەزەیی، میهرەبانی، رەحم: تۆزێك سۆزت بۆی هەبێ. |
| سۆز (ن.) | ١- پەیمان، سۆز لە دەم هەرگیز خیانەتە لە نیشتمان ز ناڤەم. گفت، قەول: ٢- دەروون: شیعرەکەت زۆر جوان بوو هەستو سۆزی جووڵاندم. |
| سۆلاڤ (ن.) | ١- تاڤگە، ناوی هاوینە هەوارێکە لە ناوچەی ئامێدی. ٢- ناوی مێیە: سۆلاڤ نمرەیەکی باشی وەرگرتووە. |
| سۆلك (ن.) | پێلاڤ، پێڵاو، شمك، سۆل. سارە بێ سۆلك نەچیەدەر. |
| سواخ (ن.) | داپۆشینی دیوار بە قوڕی خووساو: دیوارەکەیان جوان سواخ دا. — کردن: لادێیەکان لە پایزاندا خانووەکانیان سواخ دەکەن. |
| سوار (ن.) | کەسێك بەسەر پشتی وڵاخەوە بێت: سوارەکە سواری ئەسپەکە بوو. — چاك: کورد سوارچاکی باشی هەبووە. — کردن: سوارکردنی منداڵ لە یاری ترسناك باش نییە. |
| سواری (ن.و.) | ڕۆیشتن بە سواری ئەسپ یا ئوتۆمبێل: سواری ئەسپ وەرزشە. |
| سواڵ (ئان.) | دەرۆزە، داواکردنی شت لە خەڵك، پاڕانەوە لە خەڵك: دیاردەی سواڵ لە زۆربەی وڵاتە دوا کەوتووەکاندا هەیە. — کردن: سواڵ کردن پیشەیەکی باش نییە. |
| سوپا (ن.) | لەشکر: سوپای بەعس تێك شکا. |
| سوپاس (ن.) | ستایش،مەمنون: پێویستە سوپاسی یارمەتی دەرانت بکەیت. — کردن: سوپاس کردن لە بری هەر کارێك پێویستە. — و پێزانین: سوپاسو پێزانینمان وەرگرت. |
| سولتان (ن.) | پاشای گەورە، ناوی فەرمان ڕەوای گەورە: خوا لە سوڵتان محمود گەورەترە. |
| سولەیمانی (ن.) | شارێکە لە باشوری کوردستانی: سولەیمانی شارێکی خۆشە. |

سووتان (چ.) ١- ئاگر تێ بەربوون: سووتانی لەش بە ئازارە. ٢- فەوتانی قەرز : ئەو پارەیەی لەلای کابرا بوو سووتا. ٣- تێپەڕبوون لە ڕادەی دیاریکراو دەکایەدا: کچەکە لەیاری خانەکە سووتا.

سوود (ن.) قازانج، گرنگی: ئامۆژگاری سوودی زۆرە.

سوودبەخش (ئان.) سوودار، قازانج، کەڵك بەخش: خوێندن بۆ مرۆڤ سوودبەخشە.

سوور (ئان.) ئاڵ، سۆر: ڕەنگی سوورم خۆش دەوێ

سووڕ (ن.) ١- چەرخ، سەردەم: سووڕی زەمانە تەواو گۆڕاوە. ٢- بادانو سووڕانەوە: منداڵەکە مزراحەکەی بە جوانی سووڕ دا. ٣- خوول سەری سووڕ دەخوات.

سووربوون (چ.) ١- ڕەنگی سوور بەسەردا هاتن: لە شەرما سوور بوومەوە. ٢- چەقینو پێداگرتن: کرێکارەکان سوور بوون لەسەر مانگرتن. سووتان: پەنجەکانی سوور بوون.

سووڕخواردن (چ.) گەڕانەوە، سووڕانەوە، خول خواردن، چەرخ لێدان: سووڕم خوارد بە دوای تۆ.

سوورك (ن.) سورێژە، سووریکە، جۆرە نەخۆشیەکە.

سوورێژە (ن.) سۆرك، سوورینجە، نەخۆشیە: بە کوتان منداڵ لە سوورێژە دەپارێزرێ.

سووسە (ن.) بەگومان دۆزینەوەی نهێنی: گوێی بۆ سووسە قیت کردبوو.

سووچ (ن.) ١- قوژبن، گۆشە: هەموو سووچێکی ژوورەکە گەڕام. ٢- خەتا، تاوان: سووچی تۆ بوو وام بەسەر هات. سووچ: لا: هەموو سووچێکی کوردستان دەڵێی بەهەشتە.

سووك (ئان.) ١- لەکێش کەم بێ: مافوورەکە سووکە. ٢- بێ قەدرو قیمەت. ئافرەتێکی سووکە. ٣- ئاسان: پرسیرەکان سووك بوون.

سوون (ن.) سن، ساوین، جۆرە مێشێکە گەنمو جۆ لە کاتی تەڕیدا دەخواتو لاوازی دەکات: جوتیارەکە دەرمانی سوونی لە دەغڵەکە دا.

سویر (ئان.) سوێر، سوور، پڕ خوێ، پڕ خێ: خوارنا گەلەکا سویر بۆهەمی کەسان یا باش نینە.

سیامەند (ن.) ناوە بۆ نێر: داستانی خەج و سیامەندم خوێندەوە.

سێبەر (ن.) سایە: لەسێبەری سابات دانیشە.

سیبەر (ن.) سێبەر: دز ژ سیبەرا خۆ دترسیت.

سیحر (ن.) جادوو: سیحر کردن گوناهێکی گەورەیە.

سیحراوی (ئان.) خەیاڵاوی، بەسیحر بوون: نووسینەکانی پیرەمێرد سیحراوی بوون.

سێدارە(ن.) سێ دارن بنێن وان ژێك فرنوسەرێن وان پێکڤە گرێدەن و وەریسەکی پێڤەشۆڕ دکەن خەلکێ پێڤە دهەلاویسن. وەکی وێیە ئەوا مەشکێ پێڤە دکەن، یان ئەوا گۆشت فرۆش بۆ هەلاویستنا لەشێ پەزی یان گاوگۆلکان پێڤە دهەلاویسیت دا پارچە پارچە بکەن.

سیس بوون (چ.ل.) پووچ بوون، ژاکان: گوڵەکە سیس بووە.

سیچکە (ن.) جۆرێکە لە بەرهەمی مازوو: سیچکەی دار مازوو بە سوودە.

سیفەت (ن.) ڕەوشت و تەبیعەت: سیفەتێکی خراپی هەیە.

سیلاڤ (ن.) سویلاڤ، تاڤگە: سیلاڤ هاڤینگەهەکا هوینە دکەڤیتە بەرامبەر کەلا ئامێدیێ.

سینی (ن.) مەجمە، خوانچە، سێنی، قاپێکی گەورەیە: سینی یەك پاقلاوە دەکرین.

# ش

**ش (پیت.)** ١- یەکێکە لە پیتەکان: (ش) یەکێکە لە پیتە بزوێنەکان. ٢- بۆ دووبارە بەکاردێ: منیش دێم لە گەڵتان.

**شا (ن.)** ١- گەورەی وڵات، سەرکردە، سەردار، پاشا: شای ئێران بەرامبەر کورد زۆردار بووە. ٢- گەورەو دایکی مێشە هەنگوین، شا هەنگ. ٣- داشێکی شەترەنجە (مەلیك). ٤- خۆزگە، خۆزی: شا بەحاڵت.

**شاباڵ (ن.ل.)** ١- باڵی گەورە، شاپەڕ. ٢- دەسەڵات: سەرکردەی دادوەر شاباڵی تەناهی میللەتە.

**شاه (ن.)** پادشا: شاه لە ئێران فەرمانڕەوایی دەکرد.

**شاپوور (ن.)** ناوە بۆ نێرینە.

**شاخ (ن.)** ١- کێو، چیا: کەو لە شاخدا دەبینرێت. ٢- قۆچی سەری ئاژەڵ: بزنە کێوی دوو شاخی جوانی هەن. ٣- ئەو توورەکەیەی کە ڕاوکەر کەلوپەلەکانی تێدا هەڵدەگرێ. ٤- لك، گوڵ، تاکە گوڵ، شاخە: ئەم شاخە گوڵەم بۆ تۆ هێناوە.

**شاخو داخ (ن.)** چیاو هەرد، چیاو کێو، بەرزایی.

**شاخاوی (ئان.)** پڕ شاخو داخو بەرزایی: کوردستان لە بواری جوگرافی ناوچەیەکی شاخاوییە.

**شاد (ئان.)** کەیفخۆش، دڵخۆش، ئاغووش، دڵشاد: شادم بە قوتابییەکانی خۆم.

**شادەمار (ن.)** دەماری سەرەکی. سەردەمانێك ئیبراهیم خەلیل شادەماری هەرێم بۆوە.

**شادمان (ئان.)** دڵخۆش، شاد: مرۆڤی ئازاد شادمانە. ـــــی (ن.و.) ١- دڵخۆشی: هەوڵبدە بەشادمانی بژیت. ٢- بەزم و داوەت، زەماوەند: بەزم و شادمانی گێڕا.

**شار (ن.)** ١- ئاوەدانی گەورە، شوێنێك كە دانیشتوانی زۆری تێدابێ: هەولێر شارێكی كۆنە.٢- بازاڕ، باژێڕ: هەموویان پێكەوە چووبوونە شار. ٣- جۆرە سەرپۆشو ڕەفتەیەكی ژنانە.٤- سەری مەیدانی وازی.

**شاراوە (ئان.)** نەهێن، دەرنەكەوتوو، بزر، نادیار: چەند مەبەستێكی شاراوەی لە دڵدا هەن، نایەوێ بیاندركێنێ.

**شارەزا (ئان.)** ١- ڕێگەزان، بەڵەد: باوكم شارەزای ئەم گوندەیە. ٢- زانا لە كاروبار: چوومە لای پزیشكی شارەزا لە دانسازی.

**شاردنەوە (چ.)** بزركردن، ون بوون، خۆدزینەوە، بێ سەرو شوێن كردن: خۆشاردنەوە لە كاری نیشتمانی تاوانە.

**شاردنەوە (چ.)** شاردن، بزركردن و دیارنەخستن: خۆی لە بەرپرسیارێتی شاردەوە.

**شارستان (ن.د.)** شاری گەورەو ئاوەدان: ناكرێت دوور لە شارستانی بژین. — یەتی: شارستانییەتی سۆمەری زۆر كۆنە.

**شارستانێتی (ن.و.)** ژیانی شارستان، ژیاری: خۆزگە هەموو ڕواڵەتی شارستانێتی یان پێوە دیار بوو.

**شارنشین (ن.ل.)** واتە لە شار نیشتەجێ بوون: شارستانییەكان گرنگی بە پاكو خاوێنی شار دەدەن.

**شارێگە (ن.ل.)** ڕێگای سەرەكی، شاڕێ: ڕێگای هەولێر حاجی ئۆمەران شارێگەیە.

**شاش (ئان.)** ١- قوماشی شل تەندراو، نەسفت: خەراری شاش بۆ تووتنە.٢- بیر بلاوی: مێشكی شاش بووە. ٣- گەورە (شاش بنووسن!). ٤- هەڵ ئەڤ نووسینە تژی شاشینە.

| | |
|---|---|
| شاعیر (ن.) | هۆنەر، هۆزانڤان، هەڵبەستڤان، هۆنیار: نالی شاعیرێكی گەورەی كوردە. شاعیریەتی: شاعیریەتی بەهرەیەكی خواییە. |
| شاكەل (ن.) | گوندێكە لە باشوری كوردستان بەعس وێرانی كرد: شاكەلەم نەدیوە. |
| شام (ن.) | ١- شارێكی سووریایە: شام لە مێژوودا بەناوبانگە. ٢- نانی شیوان: پێش نوێژی شیوان شامم كردووە. ٣- شامنم: شام لە ئاسوودەیی دا. |
| شان (ن.) | پیل، نێوان قۆڵ و مل: شانم دایە بەر گرانییەكەو خوێندنی خۆم تەواو كرد. |
| شان بەشان (ئاك.) | هاوكات، بەیەكەوە، یەكسان، هاوتا: دەبێت ژن شان بەشانی پیاو بێ لە كاروباردا. |
| شانۆ (ن.) | ١- ئەو شوێنەی هونەری نواندنی تێدا ساز دەكرێ، سەكۆ: ٢- ناوە بۆ مێینە. |
| شانۆگەری (ن.) | هونەری نواندن، یان چیرۆكێك بۆ نواندن نووسرابێ: بۆ وەگەڕ خستنەوەی هونەری شانۆگەری دەبێ ڕێو شوێنی باش بگیرێتە بەر. |
| شانۆی ناو ماڵ (ن.) | كتێبی ( مەلا مستەفای سەفوەت)ە. |
| شانازی (ن.) | سەرفرازی، سەربلندی، نازین، شكۆمەندی. سەركەوتنی ئەوان شانازییە بۆ ئێمە. |
| شانازی (ن.) | فەخر، خۆ بادان، نازین، خۆ هەڵكێشان: ئێمە شانازی بە دەستكەوتەكانمان دەكەین. — كردن: شانازی كردن بە نەتەوە سەر بەرزییە. بە ــ یەوە: بە شانازییەوە وتەكانم دەڵێم. |
| شانە (ن.) | شانەك، شەهنەك، شە. شانەی هەنگ، شانەی چەكداری، شانەی نهێنی. |
| شایان ( ) | شایستە، لێوەشاوە، لایەق: قوربانییانی هەڵەبجەو ئەنفال شایانی هەموو جۆرە ڕێز لێنانێكن. |

شایەت (ئاب.) شـایەد، کەسـێك ئاگـای لـەڕوداوێك: شـایەت چـوو بـۆ دادگـا. ___دان (چ.) کەسـێ خەبـەر دابـێ و ڕابگـەێنێ: شـایەت دان بەرپرسی یە. ئەو بەبێ ترس شایەتی خۆی دا.

شایەت (ن.) شهادەت: پێویستە شایەت راستی بڵێت. — دان: شـایەت دان بـە نارەوایی تاوانە.

شت (ن.) چشت، تشت، دانە دانەی هەموو کەلوپەلێك: هەموو شتەکانت هێناون؟

شەبەق (ئان.) ١- روونی کەناری ئاسمان لە کاتی بەرە بەیاندا. ٢- کونی گـەورە لە کالاْو دیوار: دیوارەکە شەبەقی زۆرە.

شەبەق (ن.) تـرووسکە، ڕووناکی، ڕەمی: لە شەبەقی بەیاندا بـەرەو کارەکـەم دەچم.

شەبەیخوون (ن.) پەلاماری شەوانە بۆ سەر دوژمن. لە شەبەیخونێکدا کوژرا.

شەترەنج (ن.) یاریەکە: شەترەنج یاریەکی بلاْوە.

شەپۆڵ (ن.) پێڵ، مونج، لێشاو: شەپۆڵەکانی دەریا بەهێزن.

شەختە (ن.) بەستەڵەك، سـەهۆڵ، سـەهۆڵبەندان، یـەخ: نمی تـەڕاییو شـەی هەوایە لـە پایزانـدا لەسـەر شـیناوەردیان دەنیشـێو لـە ساردی دەیبەسـتێو شـیناییەکان تێـك دەدات. شـەختە لەشـاران کـەم بووە.

شەخسی (ن.و.) تایبـەتی، پەیوەنـدی بـە کەسـەوە هـەبێ: یاداشـتیی شەخسـی نووسی.

شەڕ (ن.) جەنگ، لێکدان، پێکدادان، هـەرا، کێشـە: شـەڕ لـە بەرژەوەنـدی کەس دا نییە.

شەڕانی (ن. و.د.) شـەڕفرۆش: قوتـابی شـەڕانی کـەس خۆشـی ناوێـت. شـەڕاوی: شەڕخواز، مرۆڤ نابێت شەڕاوی بێت.

شەڕخواز (ن.ب.) ئـەو کەسـەی هـەردەم شـەڕو شـۆڕدەکات، شـەڕنانەوە، شـەڕانی، شیم: هەڵۆ قوتابییەکی شەڕخوازە.

شەرع (ن.) یاسا، لێکدانەوە، ڕوونکردنـەوەو هـەڵگێڕو داگێـڕی ئـایینی: لـە شەرعیشدا هەر من کێشەکەم بردەوە.

شەڕفرۆش: مرۆڤی شەڕ فرۆش هەمیشە بە کێشەیە.

شەڕکەر: مرروۆڤی شەڕ کەر خۆشەویست نییە.

شەڤ (ن.) شەو، لە رۆژاواوە تا ڕۆژهەلاَتیَ، پێگوهوڕکا رۆژێیە:١- هاڤینـان شـــەڤ کـــورتو رۆژ درێـــژ دبـــن.٢- ئەســـتێرە بـــەرزەکان ئەدرەوشـێنەوە بەشـەو.. وەك مـن بەداخـەوەن، نەسـەوتیان هەیە، نەخەو.( پیرەمێرد)

شەقام (ن.) جادە، ڕێگا و بان: شەقامەکان قیرتاو کراون.

شەکانەوە (چ.) لەرینـــەوە لەبـــەر بـــا: ئێســـتا ئالاَکـــەمان لـــەو شوێنانەشـــدا دەشەکێتەوە کە گوناه بوو تیایاندا باسی کورد بکرێ.

شەکر (ن.) شـیلەی شـیرینی وشـككراوە: شـەکر شـیرنەمەنی لێ دروسـت دەکرێت.

شەل (ئان.) کەم ئەندامی لە قاچ: مرۆڤی شەل هەست بە ناخۆشـی دەکـات. — و پەت: کارەکەی شـەلو پـەت کـرد. — کوێر: شـەلو کوێر ناپارێزێت. — وار: شەلوارێکی نوێم بە درووندا.

شتل (ن.) نـەمام، شـەتڵ. چـەندی شـتل بچێنین ئەوەنـدە ولاَت سـەوزتر دەکەین.

شەما (ن.) پاشمایا هنگڤینیە. مەنکارین شەما هنگڤین بکرین.

شەماڵ (ن.) ١- بـای بـاکوور: شـەماڵ هـەڵی کـرد.٢- نـاوە بـۆ نێـر: شـەماڵ بەرنامەی هەیە.

شەمەندەفەر (ن.) قیتار: سوار بوونی شەمەندەفەر خۆشە.

شەو (ن.) تـاریکی شـەڤ، دژی ڕۆژ: ئەرکـەکان بەشـەو ڕاپەڕێنـە._ نشـین (چ.) شـەو دانیشـتن، بێدارونەخـەوتن: لـە زۆری خەمـەکانی شەونشینە.

شەوگار (ن.د.) شەوی درێژو تاریك: شەوگارێکی ناخۆش بوو..

شەوق (ن.) ڕوونـاکی، ڕۆشـنی: تـاریکی نـاتوانێ شـەوقی مـۆم بزربکـات.٢- تاسەو ئارەزوو: زیندانەکە شەوقی هاتنە دەری هەیـە.٣- کـەیف خۆشی، شادی: بە شەوقەوە هەنگاوی دەنا.

شەیپوور (ن.) بۆڕی، زوڕنای لەشکر: شەیپوور ئامێرێکی موسیقی سەربازییە.

شەیپوورچی (ن.) شـەیپور لێـدەر، زوڕنـا ژەن: شەیپوورچـییەکان پـێش لەشـکر کەوتبوون.

شەیدا (ئان.) ١- دینی ئەوین، دێوانەی عەشق: مەم شەیدای زین بـوو.٢- نـاوە بۆ مێ: شەیدا شەیدای خوێندنە.

شپرزە (ئان.) تێکچـوو، پەرێشـان، واق وڕمـاو: بـە شـپرزە بـوونی بـرادەرت خۆشحاڵ مەبە.

شریت (ن.) ١- پـەتی باریـك، داو: شـریتی تووتنەکـە هەڵواسـرا. ٢- چـرك بەشـریتی لێبـدە. ٣- بـەتاڵ کـردن، پایـدۆز کـردن: باشـریت بکەین.

شکۆ (ئان.) گەورەیی، پایە بەرزی: هەنـدێ لـە ڕۆژهەلاَتناسـەکان کورد بـە خاوەن شکۆ دەزانن.

شکۆدار (ن.ل.) گەورەو مەزنو پڕ بەها. خاوەن شکۆ. بەڕاستی شکۆدارە.

شکار (ن.) ١- بڕاو، نێچیر: کـورد خـەریکی راووشـکاربوون.٢- کەڵەکەبـەرد (ن.) بەردی شکار لە شاخ هەیە.٣- بەردەڵان: ناوچەی شـکار بـۆ چاندن نابێ._ تە: زەویەکەی بە شکارتە داوە.

شکان (چ.) ١- پارچـە بـوون، لـەت بـوون، ورد بـوون: پەنجەرەکـە شـکا. ٢- ڕاکردن لـە شـەڕ، تێچوون، دۆڕانـدن، لـە شـەڕ: شـکانی دوژمـن مایەی خۆشحاڵی بوو. ٣- هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژو و دەستنوێژ: دەسـتنوێژەکەی شـکاند. ٤- نـرخ دابـەزین، هـەرزان بـوون: لـە شکانی نرخی کالاَو کەلوپەل خەڵك سوودمەند بوو.

شکاندن (چ.) پارچەپارچە کرن، پەڕتاندن، بەزاندن، ژناڤبرن، مەشکێنە (کاری داخوازی لەباری نەرێدا): دڵی کەس مەشکێنە تا کەس دڵت نەشکێنێت.

شکاو (ن.) ١- لەت بوو، ورد بوو: پەنجەرە شکاوەکان پێویستییان بە چاککردنەوە هەیە. ٢- هەڵاتوو لە شەڕ، ورە دابەزیو: سوپای شکاو بە زەحمەت خۆی پێدەگیرێتەوە.

شکایەت (ن.) سکاڵا: پیاوە زۆر لێکراوەکە شکاتی لە دادگا تۆمار کرد.

شکایەت کردن: شکایەتکردن مافێکی رەوایە.

شکەڤت (ن.) ئەشکەوت: شڤانان شکەڤت بکارئینایینە بۆ مەخەلا پەزی ژبەرکو زڤستانان گەرمن و هاڤینان هینن.

شکست (ن.) شکان: شکستی ئێسك بە ئازارە. شکست بازی، شکستی دەرونی — ڕووخان.

شل (ئان.) ١- تراو شتی روون: خواردنی شل بۆ نەخۆش باشە. ٢- شتی لەق: ئەم دارە شلە.

شلوشێواو (ئان.) شلوشەویق: نەخۆشەکە شلو شێواوە.

شلۆق (ئان.) بێ سەروبەر، شلێخە، ئالۆز، شکەست، تەقەتێکەوتن، پەشێو، ئاوێتە، جەنجاڵ: بارودۆخی عێراق شلۆق بووە.

شلۆق (ئان.) پەرێشان، بێ سەروبەر: مرۆڤێکی نارێك و شلۆقە. _ کردن (چ.) شێواندن، ماندووکردن: زۆریان لێدا وشلۆقیان کرد.

شلوکوت کردن (چ.) تێروپڕ لێدان، ئازاردانی زۆر: دوژمنمان شلوکوت کرد.

شڵەژان (ئان.) شێوان، تێکچوون، داچڵەکان، ئاراو، پەشۆکان: تیرۆرستان بارودۆخی ناوچەیی باشووریان شڵەژان.

شڵپە (ن.) دەنگی کەوتنە ناو ئاو: لەناو ئاوەکە شڵپەی دەهات.

شمشاڵ (ن.) بلوێر: دەنگی شمشاڵ خۆشە.

شمشاڵ (ن.) بلوێر، بلوول: دەنگی شمشاڵ زۆر خۆشە. شمشاڵ و نای و دووزەلە وەك یەکن، بەڵام یەك نین.

| | |
|---|---|
| شمشێر (ن.) | شیر، تیغی درێژو تیژ بۆ شەڕ: شمشێرو قەڵەم وەك یەكن. |
| شنانەوە (چ.) | شۆڕبوونەوە، لەرینەوە: وەك لقی شۆڕەبی دەشنێتەوە. |
| شنە (ن.) | بای بەیان، نەرمەبا: شنەی شەماڵ خۆشە. ناوە بۆ مێ: شنەخان كچێكی ئاقڵە. |
| شۆخ (ئان.) | جوان، بێگەرد، شەنگ، شەپاڵ، ڕەند، سپەهی: كچێكی شۆخم دیت. |
| شۆڕ (ئان.) | ١- گەورەو بەرین، فرە، داهێڵدراو: با شەرواڵەكە هەندێ شۆڕ بێ. ٢- جوان، ڕەند، چاك، ئازا: كوێخا سێوێ نموونەی شۆڕە ژنی كوردە. |
| شۆربا (ن.) | خواردنی شل: شۆربا بدە نەخۆش. |
| شۆڕش (ن.) | ١- ڕاپەڕینو بزووتنەوەی گەلو كۆمەڵ لە دژی دەسەڵاتو دوژمن: شۆڕشەكانی كورد چەندان دەستكەوتی گەورەیان لێكەوتۆتەوە. ٢- ناوە بۆ نێرینە. |
| شۆڕشگێڕ (ئان.) | بەو كەسە دەڵێن كە خەبات دەكات لەپێناو ئازادی: شۆڕشگێڕەكان سەركەوتن. |
| شۆڕشكردن (چ.) | خەبات، ڕاپەڕین بەرپابوون: كورد لە شۆڕشكردن بەردەوامە. |
| شوان (ن.ب.) | ١- چاودێری مەڕومالأت: شوانەكە بلوێری دەژەنی.٢- ناوە بۆ نێر: شوان بە ئەركەكە هەڵسا. |
| شوورە (ن.) | دیوار، پەرژین، تانۆك، تامان: لە شوورەكەدا یەك دەرگا هەبوو. |
| شووم (ئان.) | بەد، نەگبەت: كورد لە مێژوودا زۆر شوومی بۆ هاتووە. |
| شوێن (ن.) | ١- جێگا، جێ، : كوردستان لەسەر نەخشەی سیاسییدا شوێنێكی بەرچاوی هەیە.٢- دوای، پاش: شوێن كلاّوی بابردوو مەكەوە. |
| شوێن پێ گرتن (چ.) | لاسایی‌كردنەوە، بەدوادا ڕۆیشتن: شوێن پێی دوژمن مەگرە. |
| شوێن پێ | بنپێ، جێ پێ: شوێن پێی دزەكەیان هەڵگرت. |
| شوێنەوار | شوێنی كۆن، دێرین: كوردستان شوێنەراوی كۆنی زۆرە. |

شیان (ن.و.) توانـا، هێـز، پێڤـەهاتن: شـیانا پڵنگـی ژیـا گـای پـێترە. (چ.) توانایی، دەسەڵات: یێ شیا ئەزمانێ خۆ ئاریشە نـابن و سـەرێ وی نائێشیت.

شیاو (ئان.) ١- لایـەق و هێـژا: مامۆسـتا شـیاوی ئـەو ڕێزەیـە. ٢- نـاردراو: لەهەندەران شیاوە. مرۆڤی شیاو لەشوێنی شیاو بێ.

شێت (ئان.) دێوانە، ئەم عەقڵ: شێت هیچی لێ ناگیرێ.

شێخ (ن.) ١- پیری تەریقەت: شێخ مەحمود سەرکردەی کوردبوو.

شێدار (ئان.) تەڕەشوع، تەڕ، ئاودار: ژوورەکە شێدارە.

شیر (ن.) ١- شمشێر: شیر یەکێکە لـە چـەکە کۆنـە کاریگـەرەکان. ٢- ئـەو شــلەیەی لــە گــوانی ئــاژەڵو مــەمکی ئافرەتــدا هەیــە، خواردنەوەیەکە: شـیری دایـك چاکترە لـە جۆرەکـانی دیکـە بـۆ منداڵ.

شیر وەشێن (ن.) چەکداری شـیر بـە دەسـت، شمشـێر بـەکار هـێن، چـەکباز: شـیر وەشێنیش یەکێکە لە هونەرە وەرزشییەکان.

شیربایی (ن.و.) دراو یان شتێکی گران مایەیە کە کەس‌وکاری بووك بیسێنن لە زاواکەیان، نەخت: شیربایی نەریتێکی کۆنە لە کوردەواریدا.

شێرپەنجە (ن.ل.) ناوی نەخۆشییەکی کوشـندەیە، پەنجـە شـێر: زیرەکـی بلیمـەت بە نەخۆشی شێرپەنجە مرد.

شێروان (ن.) ١- نـاوە بـۆ نێـر: شـێروان لـە کۆرەکـە دواکـەوت. - مـەزن (ن.) نــاوی گوندێکـە لەسـەرووی کوردسـتان: شـێروان مــەزن زۆر ساردە.

شیرین (ئان.) شرین، شیرن: شیرینیا دارێ ژ بەلگانە.( پەندە)

شیڤ (ن.) نواڵ، چۆم، دۆڵ، جۆمك، شرۆرك، نانخوارنا ئێڤاری.

شیعر (ن.) هۆنراوە، هۆزان: شیعری كوردی پلەیەكی باشی بڕیووە.

شیلە (ن.) بەرهەمێكی شلی شیرینە سروشتیو دەستكردیشی هەیە: هەنگ شیلەی گوڵ دەمژێت.

شین (ئان) ١- رەنگی شین: ڕەنگی ئاسمان شینە. ٢- گریان و شیوەن: بۆشەهید شین و ڕۆرۆ مەكە.

شینباو (ئان.) ڕەنگی شین بەڕەنگی ئاسمان: دەریا وەك ئاسمان شینباوە.شین كردووە، شینباو بوو، تەواو شین نەبوو.

شێنەیی (ئان.) هێمنی، ئارامی، لەسەرخۆیی، هێدی: شێنەیی ئێمە بوو ئەوی لە توندو تیژی سارد كردەوە.

شینی (ن.و.) بەهی، تازە، پرسە. بۆ شیقێ وەرەنك مە. لەشینی براكەی چاوی سپی بوو.

شێوە (ن.) ١- جۆر، شێواز: شێوەكانی نووسین چی یە؟ ٢- رەوشت و ئاكار: شێوەی ڕەفتاری جوانە. ٣- زاراوە: بەشێوەی سولەیمانی دەنووسین.

# ع

عادل (ئان.) دادی یەکسانو راست: خۆزگە دادگایەکان عادل دەبوون.

عالم (ن.) فـرەزان، خوێنـدەوار، مـەلا، زانـا: عەلائـەدین سـەجادی عـالمێکی گەورەی کورد بوو.

عەبداڵ (ن.) عـەوداڵ، سەوداسـەر، گـراو، خولیـا: پەپوولـە عەبـداڵی شـیلەی گوڵە.

عەدل (ئان.) راست: رێگایەکی عەدلیان دروست کرد.

عەرەب (ن.) نەتەوەیەکـە: بەشـی زۆری نەتـەوەی عـەرەب موسـڵمانن. — سـتان: نیشـتمانی عـەرەبان: موسـڵمان بـۆ حـەج دەچـنە عەرەبستانی سعوودی.

عەرەبانەی سەر بەفر (ن.ل.) تاخووك، پاخێڵ: ئەسکیمۆ عەرەبانەی سەر بـەفر بـەکاردەهێنن بۆ هاتوچۆ.

عەرد (ن.) زەوی: عەردیان کێلا.

عەرز (ن.) زەوی، زەمین، خـاك: عەرزەکـەمان فرۆشـت. — وحـاڵ: عـەریزە، سکاڵا، داواکاری: شوان عەرزو حاڵ دەنووسێت.

عەشیرەت (ن.) هۆز، تیرە، بنەماڵە: عەشیرەتی بەرزنجی بەناوبانگن.

عەقڵ (ن.) زانایی، ژیری، زانست: ژیری بە گەورەیی‌و بچووکی نییە.

عەلی شیش (ن.) جۆرێ پەلەوەر، قەل: عەلی شیش بەخێوکردن سامانە.

عەمار (ن.) ئەنبار، شوێنی دەغڵو دانو دانەوێڵە: عەماری پڕ ئاشتی ماڵە.

عەمبار (ن.) شوێنی هەڵگرتنی گەنم وجۆ: دەغلەکەیان خستە عەمبارەوە.

عێراق (ن.) ناوی وڵاتە: عێراق لە دوو نەتەوەی سەرەکی پێك دێت.

# غ

**غاردان (چ.)** تاودانی ولاخ: ئەم سوارانە غارغارێن دەكەن.

**غەڵبە غەڵب (ن.ل.)** دەنگی زۆری مەردومو ژاوەژاویان : غەڵبە غەڵبێكی زۆر لەم ناوە دێت.

**غەم (ئان.)** خەم، پەژارە، پەشێوی، دڵتەنگی، ئازار: گەر دەپرسی من لەبەر چی كەم دەخۆم .. من بەبرسی قەت مەزانە غەم دەخۆم.

**غەم (ن.)** خەفەت، خەم: غەم بۆ ڕابردوو مەخۆ.

**غەمزە (ئان.)** خەمزە، ناز، بەتیلی چاو تەماشاكردن: بەغەمزەی چاوی مەخموری سیاهی مەستی مەی كردین.

**غیرەت (ئان.)** ئازایی، پیاگەیی، فرووك: پیاوی بە غیرەت هەرگیز سڵ ناكا لە ژیان.

# ف

فارگۆن (ن.) یەکــەی شــەمەندەفەر: ئــازاد لــە فــارگۆنی ژمــارە دووی شەمەندەفەرەکە سوار بووە.

فالنج (ن.) ئیفلیج، نەخۆشیەکە زارۆکان دگریت.

فانی (ن.و) نەمان، مردن: هەموو گیانێك فانی یە.

فەر (ئام.) پێدڤی، پێویست، گرنگ.

فەڕ (ئان) پیرۆزی و مبارەکی: وڵاتەکەمان بەپیت و فـەڕە. چاك: کارێکی فەرت کرد.

فەڕ (ن.) ودم، بەهرە، سوود: کوردستان وڵاتی فەڕو خۆشییە.

فەرامۆش (ن) لەبیرکراو، لەبیرنەمان: قسەی باش فەرامۆش لەبیرناکرێ.

فەرامۆشکردن (چ) لەبیر کردن، پشت گوێ خستن: باخەمەکان فەرامۆش بکەین.

فەرتووت (ئان) پیری پەك کەوتە: لەشەفەر تووتەکەیان بەخاك سپارد.

فەرش (ن) ڕایەخ: کاتی فەرش هەڵگرتنە.

فەرمان (ن.) ١- ئیش‌و کار: بـەجوانی جـێ بـەجـێ کردنـی فـەرمان کۆمەڵگە پێش دەخات. ٢- ناوی کوڕانە: فەرمان زانکۆی بـە پلـەی نایـاب تـەواو کـرد. ٣- فەرمایشـت، بڕیـار، ئـەمر: فـەرمان بـدەو بـا ئێمەش جێ بە جێی بکەین.

فەرمانبەر ١- مووچە خۆری دەوڵەت: دەبێ فەرمانبەری لێ هاتووبێـت. ٢- کارمەند: هەمو فەرمانبەری دایەرەی کارەباین.

فەرماندان (چ.) بریاردەرکردن: وەزیر فەرمانی داوە.

فەرماندە (ن.ب.) کەسێك فـەرمان بـۆ ژێـر دەسـتەکانی دەردەکات، سـەرکردە لـە سوپادا: فەرماندەی گشت بەرەکانی جەنگ دەستگیر کرا.

فەرمانرەوایی (ن.و) رژێمی حوکم کردن، بەڕێوەبردن: ڕژێمی فەرمانڕەوای سەددام نالەباربوو.

فەرمایش (ن.و.) قسەو گفتوگۆی پیاوی گەورە، فەرموودە: فەرمایشتەکانی باوکم بە دڵە.

فەرمایشت (ن.) داخوازی، داوا، فەرموودە: من فەرمایشتی تۆ جێبەجێ دەکەم.

فەریك (ئان.) کاڵ، پێنەگەیشتوو: نۆك بە فەریکی دەخورێ.

فەساڵ (ن) شکڵ، دەم وچاو: قامەت وفەساڵی ناشیرینە.

فەقێ (ن.) خوێندکار، قوتابی، شاگرد، فێرخواز: کە فەقێ بووم زۆر شوێن گەڕاوم.

فەلاح (ن) جووتیار: کاری فەلاحەتی کەم بووە.

فەیلەسووف (ن.) زانا، دانا، بلیمەت، لێهاتوو، هەڵکەوتوو: شێخ محەممەدی خاڵ فەیلەسووفێکی کوردە. فەلسەفە (ن.) گفتوگۆیەك لەسەر ناوەڕۆکی شت، بیروڕا بە گفتوگۆ، وشەیەکی گریکییە بە مانای (حەز بە زانیاری کردن).

فرۆشتن (چ.) فرۆتن، شتێك لەبەرامبەر بەهایەك بدرێتە کەسێکی دی: ئەو خانووەی پێشتر تێیدا بووم فرۆشتیان.

فرۆشیار (ن.ب) کەسێ کە شت بفرۆشێ: فرۆشیارەکە راستگۆیە.

فڕۆکە (ن.) تەیارە، بالەفر: بە فڕۆکە سەفەر دەکەم.

فراوان (ئان.) گوشاد، بەرین، پانو پۆڕ، گەورە، فرە: پارچە زەوییەکی فراوانیان هەیە ساڵانە دەیکەنە دەغڵ.

فراوان بوون (چ.) گەورە بوون، فرە بوون، زیادبوون، بەرین بوون: بە زۆر بوونی دانیشتوان بازنەی شاریش فراوان دەبێ.

فراوانکردن (چ.) گوشادکردن، زیادکردن، گەورەکردن، بەرینکردن: فراوانکردنی شەقامەکانی هەولێر پێویستە.

**فره (ئان.)** ١- زۆر، گەلێك، پڕ، زێده: كورێكی فره باشه. ٢- پانو پۆڕ، فراوان، گەوره، بەرین: ٣- ترسنۆك، هەڵاتوو: فرەیه زوو هەڵدێ.

**فرمێسك (ن.)** ١- ئەشك، ئەسرین، رۆندك: فرمێسكی چاوی دایكی شەهیدان وشك نابێت. ٢- ناوه بۆ مێینه.

**فریادڕەس (ن.ل.)** فریاگوزار، رزگاركەر: تۆ لەم گرفته فریادڕەسم بوویت.

**فریاكەوتن (چ.)** بەهاناچوون، دەهاوارهاتن، یارمەتی گەیاندن له كاتی پێویست: فریاكەوتنی لێقەوماوان ئەركه.

**فڕین (چ)** چوون بەئاسمان، بەرزبووونەوه، بڵندببون: پۆڵه مەلەكه فڕین.

**فكر (ن)** بیرو هۆش، هزر: فكری زۆر شت دەكەینەوه.

**فلس (ن.)** جۆره دراوێكه، له دینار بچووكتر: باوكم ٥٠ فلسی دامێ.

**فڵچه (ن.)** ١- فرچه، تۆپه مووی بەداردا كوتراو، كه بۆ ڕەنگكردنو خاوێنكردنەوه بەكار دەهێنرێ: خۆشنووسەكان فڵچه بەكاردەهێنن بۆ نووسینی تابلۆكانیان. ٢- دەنگی شتی تەڕو قوڕ كه پێی پێدادەنرێ: كەوشەكەی تەڕ بووبوو هەر فڵچەی دەهات.

**فۆلكلۆر (ن.ل.)** كەلەپوور، بەرهەمی سەر زاری خەڵك: كورد خاوەنی فۆلكلۆرێكی دەوڵەمەنده.

**فوو (ن.)** پف، با هاتنەوه، لەنێوان هەردوو لێو: دەتوانین به فوو هەندێ چرا بكوژێنینەوه.

**فیدا بوون (چ.)** به قوربان بوون: پێش ڕاپەرینیش قوتابییان گیانفیدا بوون.

**فیداكار (ن.د.)** پێشمەرگه، خۆ بەختكەر، چەكدار، ڕزگاریخواز: ئەو وڵاتپارێزێكی فیداكاره.

**فیز (ئان.)** لووت بەرز، بەدەمار، به دەعیه: به فیز مەڕۆ لەسەر زەوی.

**فیزك (ن)** فیزیازانی: لەوانەی فیزیك شت فێردەبیت.

**فیسیولوژی (ن.)** زانستی جەستە، ئەو زانستەیە لە ئەندامەکانی لەش دەکۆڵێتەوە. توێکارزانی: ژن و پیاو لەڕووی فیسیولوژییەوە لەیەك جیان.

**فیشەك (ن.)** گولله، بەرکێ تڤەنگێیە: یێ زێرەڤان بیت فیشەکا وی ژ خۆڕا ناچیت.

**فیکتۆر هۆگۆ (ن.)** شاعیرێکی گەورەی فەرەنسایە.

**فێنك (ئان.)** ١- هەوای سازگار، نەگەرمو نە سارد، هێن: دوای هەلاّتنی گەلاوێژ شەو فێنك دەبن.(ن.) ٢- ناوە بۆ مێینە.

# ق

**قات (ن.)** ١- دەستە جل: قاتێكی تازەم بۆ هات. ٢- نهۆمی خانوو و تەلار: نووسینگەكەمان لە قاتی یەكەمە. ٣- دووبارە كردنەوەی چین، شت: دوو قات بۆیاغم لە دەرگاكە داوە. ٤- نەمانو دەست نەكەوتنی شت، نەهات: سالی رابردوو سالێكی قات (نەهات) بوو. — و قڕی (ئان.) گرانی، نەمانی زەخیرەو خواردن: نە بارینی باران قاتو قڕی دروست دەكات.

**قارەمان (ئان.)** ١- ئازا، جوامێر، لێهاتوو، زیرەك، وریا، چەلەنگ، پالەوان: لەیلا قاسم كچە كوردێكی قارەمان بوو.

**قارەمانی (ن.)** ١- پالەوان، ئازا، نەبەز، دلێر، بەجەرگ، رابەر، ناوە بۆ نێرینە، گوندێكی كوردستانە: شێخ مەحموود قارەمانێكی ماندوو نەناس بوو. قارەمانییەتی: قارەمانیەتی پیشەی كوردە.٣- ناوە بۆ نێرینە.

**قازانج (ن)** بەهرەی سەودا، دژی زەرەر: لە مامەلەكەدا قازانجی كرد.

**قاسپە (ن)** دەنگی كەو: بەیانیان قاسپەی كەو خۆشە.

**قاسید (ن.)** نێردراو: وەلامەكەم بە قاسید ناردەوە.

**قاچ (ن.)** ١- پێ، پا، لاق، لینگ: لەكاتی تۆپێندا پێویستە ئاگات لە قاچت بێ. ٢- بەردە باز، بەردی بازەلێن. ٣- جۆرە دارێكی دڕكاوییە: ئەم دارە قاچە نەك سنەوبەر.

**قالب (ب)** ١- بۆتە كانزای تواوەی تێ دەرێژن: زێر دەخەنە قالبەوە. ٢- شێوەی گرتووە: قالبی سابوون تاواوە

**قالی (ن.)** مافوور، فەرش، بەڕە: قالی دێرین نرخێكی گرانبەهای هەیە.

قامیش (ن.) لەڤەن، لێڤن، قەڕام، قەرەم، قەمیش. ئەو قامیشانە بێنە.

قاوە (ن.) مادەیەکی هۆشیارکردنەوەیە وەکو چای وایە: قاوە مرۆڤ هۆشیار دەکاتەوە.

قایمکردن (چ.) ١- بەستن: سەری دوو بەنەکە بەتوندی بەیەکەوە قایمکە. ٢- داگرتن، چەقاندن، کوتان: پێت قایمکە تا نەخلیسکێ. ٣- پێوەدانی دەرگا، قفڵدان، کلۆمدان: پێویستە لەکاتی نووستندا دەرگاکان قایم بکرێن. ٤- توند کردن: ئەوان باش خۆیان قایم کردووە.

قەبر (ن.) گۆڕ، گلکۆ: قەبر دوا ماڵمانە. قەبرستان: گۆڕستان، زیارەتان، ئاوەدانترین شوێن قەبرەستانە.

قەتار (ن) ١- شتی بەریز وەستاو: خەڵکەکە قەتارەی بەستووە ٢- جۆرە گۆرانی و مەقامێکی کوردی خۆشە: قەتار ئێستا باونی یە. ٣- ژووری شەمەندەفەر: سەفەری قەتار بەشەو خۆشە. ٤- جێگەی فیشەك: قەتارەی لەخۆ بەستووە.

قەد (ن.) ١- بەژن: قەدو بالای یارم جوانە. ٢- ئەندازە: پێت بەقەد بەرەکەت ڕاکێشە. ٣- توێ، لا: قەد قەد لەسەریەك داندرا. ٤- کەمەر: کچە ناو قەد باریکەکە هات. ٥- قەدی دار: قەدی دارەکە خوار بووە. ٦- دوو لا: لێفەکە قەد بکە. ٧- قەت، هەرگیز، قەد کاری خراپ ناکەم. ٨- بەرزی: کابرا بەو قەدەدا هەڵگەڕا.

قەدەغەکردن (چ) نەهێشتن، ماوە نەدان: خواردنی مریشك قەدەغەکرا.

قەدەم خێر (ن.ك.) ناوی ژنە کوردێکە: قەدەم خێر شێرە ژنێکی کورد بوو.

قەدپاڵ (ئاك.) قەدپاڵی هەرشتێك: قەدپاڵی چیاکانی کوردستان پڕ لە گوڵو گوڵزارە.

قەراخ (ن.) کەنار، ڕۆخ، تەنکاو: لە قەراخ ئاوەکە دانیشتین.

قەرزار (ن.ب) کەسێ پارە یان شت لەیەکێ وەرگرتبێ و نەیگەڕاندبێتەوە- ئێمە قەرزاری زانایانین.

قەسیدە (ن.) چامە قالبێکی ناسراوی شیعری کلاسیزمە.

قەشەنگ (ئان.) ١- جوان، ڕێك: چرپە کچێکی قەشەنگە. ٢- ناوی کچانە: قەشەنگ بێژەرێکی باشە.

قەلاّ (ن.) ١- قەلاّت، قوللە، خانووی چەکداران لەسەر کێو و شاخ: ٢- خانووی ئاغاو خانو میران: قەلاّی خانزادی میری سۆران لە بانەمانە. ٣- کانزایەکی سپیو نەرمە بۆ بواری لەحیمکاری بەکاردەهێنرێ.

قەلاچ (ن.) ١- قوژبن، گۆشە، پەنا، کوژی. دەبێ ئێستا لە چ قەلاچێك بێت؟ ٢- نەزان: ئەو بەڕاستی قەلاّجە هەرەی لەمەڕە دەرناکات.

قەلاّچۆ (ك.) قڕ کردن، لەناو بردن: قەلاّچۆی مێشو مەگەز پێویستە.

قەلاّچۆلاّن (ن.) گوندێکە سەر بە پارێزگای سلێمانی، سەردەمانێك مەڵبەندی میرنشینی بابان بوو.

قەڵەم (ن.) ١- خامە، پێنووس، بنووس: زیاتر بە قەڵەمی ڕەنگ ڕەش دەنووسم. ٢- ئاسنی نووك تیژ کە بەردو داری پێ دەکۆڵنو شەق دەکەن. ٣- هێزی دەستو پێ: کە هەواڵەکەیان پێ دا، قەڵەمی شکا. ٤- ئەو کورتە دارەی یان ئەو پەلە دارەی بۆ موتوربە بەکاردەهێنرێ. ٥- ئەندازەیەك لە پارە، بڕە پارەیەك: قەڵەمێکم پارە داوەتێ.

قەڵەمباز (ن.و) بازی زل بازدان وپەڕین، قازەکە قەڵەمبازی بۆ ناو ئاوە برد.

قەڵەمبڕ (ن) چەقوی بچووك: قەلەمبڕەکە تیژبکە.

قەڵەمڕەو (ئان) ئەو شوێنانەی لەژێر دەسەلاّتی کەسێك یا دەوڵەتێك ناوچەی کوردستان قەڵەمڕەو کرابوون.

قەلەندەر (ئان) ١- فــەقیرو بەلــەنگاز: پیــاوێکی قەڵەنــدەرم. ٢- عەبــداڵ ودەروێش: قەلەنــدەری دەســتی نــەبوونی یــە. ٣- بەســتەزمان وبێ زیان: بێ ئەقڵێکی قەلەندەرە.

قەلەندەرخانە(ن) شوێنی فەقیران، خانەی نەدارىیان: لە هەموو شوێن قەلەنـدەر خانە هەیە.

قەڵەو (ئان.) پڕ، گۆشتن، دابەستی، رپیتە. کوڕەکەم قەڵەو بووە.

قەڵۆز (ئان.) پشت کۆم، قەمبوور، قەنبوور، کووڕ. ئەو لە پیریا قەلوز بوو.

قەنارە (ن.) سێدارە، هەڵواسین: بـە هـەزاران لاوی کـورد بـە پـەتی قـەنارە خنکێنران.

قەندە (ن.) قلیان، سەبیلە، قەلن. ئەو قەندە کێشە.

قەوارە (ن.) قەبارە، بارست: قەوارەی کورد لـە باشـووری کوردسـتان جـێگیر بووە.

قەیسەر (ن.) پاشا: زەڕرەیەك خاکی وەتەن نادەم بە قەسری قەیسەری.

قەیسەری (ن.) ڕاسـتە بـازاڕ، ڕیـزە دوکانێکـە کـە سـەریان بـە تـاق گیرابێـت: بازاری قەیسەری کۆنترین بازارە لە شاری هەولێر.

قڕبوون (چ.) لەناوچـوون، فـەوتان، کۆتاییـان هـات، تێکـڕا مـردن: مانگاکـان قڕبوون.

قربوون (چ.) نەمان، بریان، بنبربوون، ژنافچوون.

قسە (ن) وتە، ئاخافتن: قسە هەزارە دوانی بەکارە.

قسەی نەستەق (ن) وتــەی بــەنرخ وبــاش: هــەموو نەتەوەیــەك قســەی نەســتەقی هەیە.

قلیان (ن.) ١- نێرگەلە، قەننەی ئاوی: ٢- سەبیلەی کلك درێـژ: -تێکـردن (چ.) سەبیلە تێکردن:

قڵیشان (چ.) درزدان، شــەق بــوون، دڕان، لەبەریــەك چــوون: زەوییەکــە لــە وشکی قڵیشاوە.

قۆپی (ن) شوێنێکە لە سلێمانی: چووینە قۆپی و سەرچنار.

قۆرت (ن) ١- بەرگر، لەمبەر: رێگا قۆرتی هەر هەیە . ٢- بەڵاو چۆرتم: ژیان بێ قۆرت نابێ.

قۆستنەوە (چ) لە هەوا گرتنەوە: دەریاکە هەڵۆکەی قۆستەوە.

قۆچ (ن) شاخی ئاژەل: قۆچی مامزەکە جوانە.

قوتابخانە (ن.) فێرگە، خوێندنگا، مەکتەب: پێویستە پاكو خاوێنی قوتابخانە بپارێزین.

قوتابی (ن.) خوێنـدکار، فێرخـواز، خوێنـدەڤان: قوتـابی زیـرەك لـەلای مامۆستا خۆشەویستە.

قوتان (چ.) لێـدان: قوتانـا قوتـابی قەدەغەیـە چـونکی چارێن دی هەنـە بۆپێڤەبر نای.

قوژبن (ن) شوێنی بزر، پەنا: هەموو قوژینی ماڵەکەم خاوێن کرد.

قوژبن (ن.) گۆشە، قورنە، بن میچ: منداڵەکە لە قوژبنێك دانیشتووە.

قوڕ (ن.) هەڕی. هەموو لە قوڕ دروست کراوین.

قورئان (ن.) ئەو پەرتووکە پیرۆزەی ئاسمانە کە خوای گەورە بۆ پێغەمبـەر (درودی خوای لێبێت) نارده سەر زەوی: قورئانی پیرۆز پـڕ لـە ئامۆژگاری جوانە.

قوربان (ئان.) جەناب، گەورە، رێزدار: قوربان زۆر باشـە: کارەکـە جـێ بـەجێ دەکەم.

قوربان بوون (چ) فیدابوون، خۆبەخت کردن: شەهید قوربانی وڵات بوون.

قوربان بوون (چ.) خۆ لەبەر گێڕان، گوری بوون، حـەیرانی بـوون: ئێمـە قوربـانی خاکی خۆمانین.

قوربانی (ن.) ١- خێراتو بەخشین:

٢- گیان بەخشین: قوربانیمان بەگیان ماڵ داوە.

قوڕبەسەر (ن.ل.) گوناح، خاك بەسەر، هەش بەسەر، مـاڵ وێـران: دانـا مرۆڤێکـی قوڕ بەسەرە.

قورس (ئان.) ١- گران، ناشیرین، سەنگین: باری ماشێنەکە قورسە. ٢- بەڕێز: زانا پیاوێکی قورسە.

قورم (ن.) قەد. لە قورمە ئەوە بیبڕەوە.

قومار باز (ن.ب) ١- قووارکەر، لەسەر پانە یاری کردن: قومار بازی پەشیمانی یە.
٢- فێڵ باز: کەسی قومارباز ناحەزە.

قومەك (ن.) فڕەك. قومەك ئاوم بدێ.

قووتدان (چ.) ئاواکردن: منداڵەکە پارچە نانەکەی قووت دا.

قووتوو (ن.) قاوغ، قەپێلك، کارتۆن، بەرگ: سەری قووتووەکەم هەڵپچڕاند.

قووڵ (ئان.) ١- چاڵێکی نەوی: بیرەکانی نەوت زۆر قووڵن. ٢-ورد، باش: قووڵ بڕوانە ناوەڕۆکی ئەو بابەتەی هەمانە.

قیژاندن (چ) هاوار کردن، دەنگ گەورە کردن: گالیلۆ هەستایە سەرێی و قیژاندی.

قیژاندن (چ.) قیڕاندن، هاوار هاوارکردن، گریانی دەنگی بەرز: قیژاندن بەسەر مناڵەکان خراپە.

قیژە (ئاك.) قیڕە، هاوار: قیژە مەکە.

# ك

| | |
|---|---|
| کا (ن.) | پووش، خواردنی ئاژەڵە (مەڕو بزن و مانگاو...) کا لە قەسەڵ دروست دەکرێت — دان، دێن: شوێنی هەڵگرتنی کا: کادێنەکەمان پڕ لە کا کرد. |
| کابرا (ج.ن.نادیارە) | فلان، بێڤان. کابرا بەقسەی کەس ناکات. |
| کابرا (ن .) | کەسێك نەیناسین و ناوی نەبەین : کابرا دەستی دەروات . |
| کات (ن.) | ١- دەم، سات، تاو: لە چی کاتێك دێی بۆلام. ٢- ناوی کاتە: کات چەندە؟. |
| کار (ن.) | ١- شۆڵ، ئیش، پیشە: ئەمرۆ ناتوانم بێم، چونکە هەندێ کارم هەیە. ٢- بەچکەی بزن بەساوایی: لە دەشتاییەکەدا هەندێك گیای بۆ کارەکان هێنایەوە. ٣- لە ڕێزماندا: کار توخمێکی سەرەکی ڕستەیە. |
| کاربەدەست (ن.) | کارمەند، کەسێك کارێکی میری هەبێ: کاربەدەستانی شارەوانی لەخۆبردووانە کار دەکەن |
| کاربەدەست (ن.ل.) | لێپرسراو، بەرپرس، مەسول: برام لە پەروەردە کار بەدەستە. |
| کارەبا (ن.) | کارەبا سەرچاوەی ژیانە. |
| کارەسات (ن.) | ڕوداوی بەترس و کاریگەر : کورد تووشی کارەساتی ئەنفال ببوو. |
| کارەسات (ن.) | ڕویدا نەکا نەخۆشا مەزن، دەردەکێ گران، دەردەسەری: بەد ڕەفتارا ئەنفالکرنا کوردان کارەساتەکا گەلەکا مەزن بوو. |
| کارەسات (ن.) | کاری سەخت، ڕووداو: مردن کارەساتە. |
| کارتێکردن (چ.) | کارتێکرن، کارلێکرن. کارتێکرنا وی یا دیارە. |

کارگە (ن .) کارخانــە ، شـوێنی و ئامێرەکـانی : خۆزگـە جۆرەهـا کارگـە لـە کوردستان دەبوو.

کارگەر (ن. د.) کرێکاری کارگـەی پیشەسـازی: کارگـەکانی کارگـەی چـنین مـان دەگرن.

کارکردن (چ.) ئیشکردن، شۆلکردن: دوای دەرچوونی، ئێستا لە کۆمپانیایـەکی ناوخۆیی کار دەکات.

کارەبایی (ن.) کەلوپەلی بـەکارەبا کـار کـردوو: بـواری بـەکارهێنانی کەلوپـەلی کارەبایی فراوان بوو.

کاریگەر (ئان.) کارتێکەر، بەتەئسیر: نەخوێنـدەواری کاریگـەری خراپـی هەیـە لەسەر ئایندەی وڵات.

کاروان (ن.) ١- ڕێچـکە، قافڵـە، چـەند کەسـێك بەیەکـەوە بـڕۆن، بـاری بەیەکـەوە: ماڵەکـەیان بەسـێ کـاروان گواسـتەوە. ٢- نـاوە بـۆ نێرینە.

کاروان سەرا (ن.) جێگـای پشـوودانی کـاروان. جـاران هـەولێر پڕبـوو لـە کـاروان سەرا.

کاروبار (ن.) ئـیش، شـۆل، ڕێ و شـوێن، ئـەرك و واجبـات: کاروبـاری ئـەم دایەرەیە هەمووی بەسەر شانی کارمەندەکانەوە دابەش کراوە.

کاروکاسبی (ن.ل.) ئیش و کار، کـارکردن: پێویسـتە مـرۆڤ بـە کـارو کاسبی خـۆی خەریك بێت.

کارێز (ن .) ١-ئاوی دەر هێنـراوی ژێر زەوی :باغەکە یان کارێزی تێدایە

کارین (چ.) شیان، توانین. بکاریت ( کـارێ رانـەبردوویێ مەرجیـیە): ئـەو کەسـێ بکاریـت ئیشـەکی بکـەتو دبـەرڕا بخوینیـت ژی ئـەو مرۆڤەکێ زیرەکە.

کاسە (ن.) قـاپ، بـادی، بادیـە، گلینـە: کاسـەو فەخفوریيـەکانم بـەجوانی شوشت.

کاسەسەر (ن.ل.) قاپیلکـە سـەر، کاژەڵـە: منداڵەکـە کاسـەی سـەری بەدیوارەکـە کەوت.

کاگڵ (ن. ل.) قوڕی گیراوە لە کـا، سـواخی قـوڕ، قوڕکـە: دەفرەکـە لـە گـا کـل دروستکراوە.

**کاغەز (ن.)** پەڕ، پەڕك. کۆلارە فرۆکەی کاغەزە.

**کاکڵ (ن.)** ١- دەنکـی بـادام و گـوێز....، کـاکر: گـوێزی ئازایـان هەیـە کاکڵـەکانی زوو دەردێـن. ٢- نـاوەڕۆك: کـاکڵی باسـەکەمان لـە دیاردەی ڕێژەی دەرچوون دەدوێ.

**کاڵ (ئان.)** ١- پێنەگەیشتوو، خاو، کاڕك: کاڵەکەکان نەگەیشتوون، هێشتا کاڵن. ٢- ڕەنگی چاو کە بەلای زەرددا دەچێ: چاوەکانی کاڵن. ٣- هەر ڕەنگێك تۆخ نەبێ.

**کاڵا (ن.)** شمەك، جل و بەرگ، کەل و پەل، قوماش، کوتاڵ: کاڵا بەقەد باڵایە.

**کاڵا (ن.)** کەلوپـەل، دانـە دانـەی بازرگـانی: سـوودێکی زۆری لـەهێنانی کاڵاکانی کردووە.

**کام (ن.)** ١- ئارەزوو، ئاوات، تاسە: هیـوادارم بگـەیت بـە کـامی دڵت. (ج. پ.): ٢- کیژ، کام: کام لەم جۆرانەت لا جوانن؟

**کامەران (ئان.)** ١- بـەکامو ئـارەزوو گەیشـتوو، بـە ئامـانجو ئـاوات گەیشـتن بەختـەوەر، شـاد. ٢- نـاوی کوڕانـە: کامـەران قوتـابی کۆلێـژی پزیشکییە.

**کان (ن.)** ١- کونێکـە کـە دارتـاش بـە ئەسـکەنە لـە دار هەڵیدەکـەنی. ٢- شوێنێك لە زەوی کە بەرهەمی کانزایی تێدابێ وەك زێڕ، زیـو، بـەرد، نـەوت، خـەڵوز: کوردسـتان کانـە نـەوتی زۆرە. —ی ١- ئـاوی کـانی خۆشـە. ٢- نـاوە بـۆ مێینـە. — یـاو: لـە بەهارانـدا کانیاوەکان هەڵدەقووڵێن.

**کان (ن.)** کاراك، کارە، شوێنێك کە ماددەی بـەنرخی تێدابێ: بێجگـە لـە کەرکووك کانە نەوتەکان لە چەند شوێنێکی دیکەی کوردستان هەن.

**کانزا (ن.)** ئـەو بابەتانەیـە کـە لـە کانـەوە دەردەهێنـرێن واتـە لەکانـەوە دەزێت. هەر کانزایەك سوودێکی هەیە.

**کانگا (ن.د.)** کارگـەتان، سەرچاوە، شـوێنی دەرهێنـانی کانزاکـان: کوردسـتان کانگایەکی شاراوەیە.

| | |
|---|---|
| **کانی (ن.)** | **سەرچاوە، سەرچاوەی ئاو، چەشمە: ئاوی کانی سازگارە.** |
| **کانی (ن.)** | **سەرچـاوە، کـەهنی، کانیـاو، چـاوگە، چـەشمە، زەویەیەکـە لـەخۆوە ئـاوی لێ هەڵـدەقوڵێ لـە بەهەرهانـدا: هـەر کانییـەك ئاوت لێ خواردەوە بەردی تێ فڕێ مەدە.** |
| **کانیاو (ن.ل.)** | **١- ئاوێـك لـە کـانی دێتـە دەر: ئـاوی کانیاوەکـەی بـەرماڵان شیرینە. ٢- ناوی کچانە: کانیاو کراسی سووری لەبەرە.** |
| **کاوەی ئاسنگەر (ن.)** | **قارەمـانی داسـتانی کـاوە و زوحاکـە: کـاوەی ئاسـنگەر هێمـای ئازایەتییە.** |
| **کاوڵ (ئان.)** | **ماڵی بێ سەروبەر، وێرانە، خەرابە، خـاپوور، رووخـاو: دوژمـن گوندەکەمانی کاوڵ کرد.** |
| **کە (ئام.)** | **١- ئامرازی لێکدەرە لە ڕستەی ئاوێتە: کە هـاتی منـیش دەڕۆم. ٢- تر، دی، دیکە: جارێکی کەش بژمێرە، هەموویان نەهاتوون. ٢- ئامرازی ناسیاوییە: هەڵوژەکە ترش بوو.** |
| **کت (ن.)** | **تاك، یەك، ئێك: ژمارە بچویك و مەزن کتو جووتن.** |
| **کتومت (ئان.)** | **وەك خۆی، لە ناکاو: زانا کتومت لە باوکیەتی.** |
| **کەتان (ن.)** | **١- ناوی گیایەکە: کـەتان گیایەکـە بـەرز دەبێتـەوە. ٢- قوماشـە: قوماشـی کـەتان لـەبازاڕ زۆرە. ٣- نـاوی ژنانـە: کـەتان ژنـی نـاو ژنانە. ٤- ناوی گۆرانییەکی فۆلکلۆرییە: گۆرانی کـەتان کەتانـە بە دەنگی زیرەك خۆشە.** |
| **کەژ (ن.)** | **کێو، چیا: کەژ و کێوەکانی کوردستان رەنگینن.** |
| **کەڕ (ئان)** | **گوێ کپ: شوێنی تایبەت بۆ کەڕوڵاڵ هەیە.** |
| **کەڕ (ئان.)** | **ئەو کەسەیە کە گوێی لە دەنگان نیە: مرۆڤـێ کـەڕ نـابی بیتـە خویندنێ چونکی گوە ل دەنگان نینە.** |
| **کەر (ن.)** | **کەرت، پارچە، لەت، نیوە، بەش، پشك، پرت دەنگێ ( ك.) دڤێ پـەیڤێ دایـێ نازکـە:مرۆڤـێ چاڤتێر نانـەك هـەبیت دێ کەتـە دوو کەر ئێکی ئەو دێ خۆت یێ دی دێ دەتە هەڤاڵێ خۆ.** |
| **کەرب (ن.)** | **رق، کین، رك: کەربێ ژ کەسێ نەهەلگرە.** |
| **کەرە (ن.)** | **نڤیشك، زبدە، ڕۆن: کەرە لە ماست دروست دەکرێت.** |

کەرەم (ئان) کەسی بەرچاو تێر و بەرێز: کەرەم سیفەتێکی بەرزی مرۆڤە.

کەرستە (ن.) تشت، تشتومشت، شتومەك، کەلوپەل.

کەرکووك (ن.) نــاوی شــارێکی باشــوری کوردســتانە: نــەوتی کــەرکووك خوێناومانە.

کەزان (ن.) کەزوان، کەسکان، قەزوان، بێمك. ئەز حەژ کەزانی د کەم.

کەس (ن.) ١- تاکــە تاکــەی خــەڵك: نزیکــەی ٥٠ کــەس لــە کۆڕەکــەدا دانیشتبووین. ٢- پاڵپشت، خزمو سەرپەرشت: کەسم نەماوە، هەر خۆم بە تەنیا ماوم.

کەس‌وکار (ن.) هەڤالو هەڤگور، هەڤالو هۆگر، خزم، دۆستو برادەر. خـزم و خویش: کەس و کاری هیچ پەیوەندیان بەوی نییە.

کەسکاتی (ن.و.) کەسکایەتی، گـژوگیا، سـەوزە، سـەوزەوات. بـە بـەهاران دنیـا هەموو دەبتە کەسکاتی.

کەچی (ئام.) بەلأم: کات تێپەڕی کەچی ئەو هێشتا نەهاتووە.

کەڤتن (چ.) کەوتن، بەربوونەوە: کەڤتن یا هەی دبیتە ئەگەرا سەرکەڤتنێ.

کەڤر (ن.) کێو، بەردێکی زۆر گەورە: ئەڤە کەرو ئەڤە کەڤر.( پەندە)

کەڤن (ن.ئان.) کۆن، دێـرین: نـوی هـاتن کـەڤن خـەلاتن ( پەنـدە). رامـان ژێ تشتێ نویو تشتێ کەڤن.

کەف (ن) ١- شتێکی سپیە سەر ئاو دەکەوێ: نوزەی کەف چۆرینی گەلی دێت: سابوون لە ئاوی سوێر کەف ناکات.

کتك (ن.) پشیلە، پیسك، ختك، گوربە: کتك ئاژەڵێکی سفڵەیە.

کتکت ( ئان.ژ.) تـاك تـاك، یـەك یـەك، ئێـك ئێـك: هـژیرێن ئـەورکی کـت کـت دوەرییێن وناهێنە خوارن.

کەڵ (ن) ١- نێــری رەشــە ولأخ و بزنــە کیــوی و گــامێش: کـەڵ پــێش بزنەکان دەکەون. مەردانە: کەڵ ژیا.

کەل (ن.) ١- چــیاو کــەژ: ئاســۆ لــەدەم کەلــە. ٢- درز، کــەلێن، قــەڵش: دیوارەکە کەل بووە. (ئان.) ٣- ددان کەوتوو: ددانی کەل بووە. ٤- حەیوانی کۆت، شاخ شکاو.

کەل (ن.) قەلاٌ، قەلاٌت، کـەلات. (ك.)ەکـەی نازکـە: کـەلا ئامێـدیێ و کـەلا

رەواندزێ لسەر بەریو کەڤری هاتینە چێکرن، کەلا هەولێرێ لسەر گرێ ئاخێ.

کەلوپەل (ن.) شتومەك: لە هەلگرتنی کەلوپەلە قورسەکان هاریکاریم کرد.

کەلا کەوتوو (ئان) کەنار کەوتوو، بەسەر یەك دا کەوتوو: هۆنراوەکانی کەلا کەوتووبوون.

کەلآخستن (چ .) هەرشتیك لە سەر یەك دانرێ : کەل و پەل کەیان کەلآ خستن.

کەلاوە (ن .) خاپور ، کاول ، شوێنی وێرانە : شێتەکە لە کەلاوەکە دابوو.

کەڵەپیاو (ن.ل.) کەڵەمێر، پیاوی مەرد، مرۆڤی مەزن: کورد کەڵەپیاوی بەناوبانگی تیا هەڵکەوتووە.

کەڵەگەت (ئان.) چوار شانە، بەخۆوە، پیاوی قەد بەرز، بالآ بەرز: پیاوێکی کەڵەگەتو بەخۆیەوە بوو، نەمناسی.

کەڵەك (ن) چەپەری سەر کوندە بۆ پەرینەوە لە ئاو: بەکەڵەك لە قەندیل پەرینەوە. ناوی شارۆچکەیەکە دەکەوێتە رۆژئاوای هەولێرەوە.

کەڵك (ئان.) سوود، خێر: خوێندن بە کەڵکە.

کەللە (ن.) ١- سەر، لە ئەستۆ بەرەو ژوور: کەللە ئەندامێکی هەستیاری مرۆڤە. ٢- عەقڵ مێشك: کەللەی نییە، تێ ناگا. ٣- شتی وردی توند بەیەکەوە نراو: پێشتر شەکری قەند بە کەللە هەبوو.

کەلو (ن.) ١- بە هەر خانەیەکی شانەی هەنگ دەوترێت: هەنگ کەلوی شانە پڕ دەکات. ٢- بورجەکانی ئاسمان: هەندێ جار لێکدانەوەی کەلوەکان ڕاستە. ٣- پۆرگی پاقلە و ماش و پۆلکە و فاسولیا. ٤- هەڵکێشی ئەو شتانەی کە بە شیش دەچێنرێن وەك گۆرەوی و لیفکە.

کەلێن (ن) قوژبن، بەینی دووشت: کەلێنی دیوارەکە بگرە.

کەم (ئان.) بڕێك، کەمێك، پێچەوانەی زۆر: کەم بخۆ بەلآم زوو زوو بخۆ. کورد دەڵێ: کەم خۆری دایم خۆر بە.

کەمال (ئان) رادەی بەرزو تەواو بوون، بەرزترین پلە لە سیفەت: پیرەمێرد هۆنراوەی گەیاندە کەمال.

کەمانچە (ن) ١- ئـامێری مۆزیقـا ژەنـین: ئـاوازی کەمانچـە خۆشـە.٢- نـاوی چیرۆکێکە: چیرۆکی کەمانچە ژەنم خوێندۆتەوە.

کەمتەرخەم (ئان.) تەمبــەڵ، سســت لــە جێبــەجێکردنی کــار، ئــیش نەکــەر: کەمتەرخەم مەبە لە جێ بە جێ کردنی ئەرکەکانت.

کەمەر (ن.) ناو قەد: پانتۆڵەکەم کەمەرەکەی گچکەیە.

کەمەر بەند (ن.) پشتێن، پشتێن بەند، چیت. کەمەر بەندەکەی لەگەڵ جلەکەی دەسازێ.

کەنار (ن.) ١- رۆخ، رەخ، قەراخ، دەم، لێوار: کەناری ڕووبارەکە زۆر خـۆش بوو. ٢- دەوەنێکی بۆن خۆش. ٣- ناوە بۆ مێینە.

کەنتۆر (ن.) ژ داری‌و فایبـەری چـێدکەن بـۆ هـەلگرتن و پاراسـتنا جلکـان. هەمی مالەکێ پێدڤی پێ هەیـە، بچویك‌و مـەزن هەنـە. هەیـە یەك دەرەو هەیە دوو.. سێ .. تا شـەش دەری: دەرێ کـەنتۆری نەهێلە ڤەکری.

کەندەڵان (ن.د.) لێـواری قوڵکـەی زۆر فـراوان: کەندەڵانەکـەی بـەرماڵان پـڕ کرایەوە.

کەنگی ( ئاك.پ.) کەی، کەینێ، چ کاتێك، چ دەمێك: کەنگی تە زانی ؟

کەنین (چ.) کەنی، پێکەنین: کەنینێژی کات‌و دەمێن خۆ یێن هەین.

کەواتە (ئان.) کەوا بوو، کەوایە: من نایەم، کەواتە بڕۆم باشە.

کەوتن (چ.) بەربوونــەوە ، لەســەرەوە بــۆ حــوارەوە : فرۆکەیــەك کەوتــە خوارەوە.

کتوپڕ (تاك .) لەناکا و ، بێ ئاگاداری ڕودان ژ نشـکێڤەوە : مردنەکـەی کتـوپڕ بوو.

کەورکو (ن.) ناوی شاخە: کەورکو شاخێکی سەرکەشە.

کەی (ج.پ.) کام دەم، کەنگی ؟ : کەی لە کەرکوك گەڕایتەوە؟

کتێب (ن.) پەرتووك، کیتاو: ئەم کتێبە هی ئازادە.

کپ کردن (ك.ل.) بێـدەنگ کـردن، بێهەسـت‌و خۆسـت، کـش‌و مـات، دامرکانـدن، ڤەمراندن: منداڵەکە کپ کەوتووە لەناو جێگادا.

کڕ (ك.) ١- باڵندەی مێ کە لەسگر هێلکە دەکەوێت بۆ هـەڵهێنان. ٢- بـێ

دەنگ، کرپە ئەگەرنا دەتکوژم. ٣-( کورك ): مریشکەکە پازدە ڕۆژە کڕ کەوتووە.

کردار (ن.) کار، فرمان، ئیش، شۆل: کرداری باش جێگای ڕێزە.

کردە (ن.ب.) کردار: کردەی پەشیمان بی نەك نەکردەی پەشیمان. (پەند)

کردەوە (ن.د.) ١- کـردار، ڕەفتـار: کـردەوەی چـاك، چـاکەی لـە دوایـە. ٢- کردنەوەی شتێك: ئازاد پەنجەرەکەی کردەوە.

کردن (چ.) ئەنجامدانی کارێك: نەشمیل نانەکەی کرد.

کرمانجی (ن.) بەشەزمانی کوردی،بەتایبـەتی بـەکرمانجی ژووروو دەگـو تـرێ ڕۆژنامەکە بەزاری کرمانجی دەردەچیت.

کرن (ن.) کردن، ئەنجامدان، بەجێ هێنان، کر: گەلێ کورد سـەرهەلدانەك کر ل جیهانێ دەنگڤەدا.

کرنووش بردن (چ.ل) سەجدە بردن، بەگوێ کردن: کرنووش بردن بۆ خوایە.

کرێ (ن.) ١- حەقی کار: کرێکارەکان ڕۆژانـە کـرێ وەردەگـرن. ٢- کرێـی خانوو دوکان: کرێی خانووەکە گرانە.

کرێت (ئان.) ناشـیرین، نـەجوان، نـەڕێك: گـۆتنێن کرێـت شـەرما خـودانی دبەنەڤە.

کرێکار (ن.ب) ئیش کردن بە پارەو کرێ: جەژنی کرێکاران لە ٥/١ دەبێت.

کرێوە (ن.) بـەفری بـە بـا هـاتوو، تـۆف، باگـەلێر، گـەردەلوول، بابەلیسك: سەرما و کرێوەیەکی بەهێز هەلّی کرد.

کرێوە (ن.) سـایەقە، ڕۆژی تـووش: سـەرماو کرێـوە ڕێ لـە شۆرشـگێڕان ناگرێت.

کزۆلّ (ئان.) لاواز، لەت، بێ هێز، بێ تـوان: هـەر چـەندە کـزۆلّ و لاواز بـین خاوەن باوەڕین.

کش‌ومات (ئان.) ١- بێدەنگ، ئارام، بێ هەست: دونیا کش‌وماتە.

کشت (ئان.) بادراو، توندکراو، لوولدراو: بەنەکە زۆر کشت مەکە.

کشتوکالّ (ن.) کشـتوکالّ (ن.) کشـتوکار، چـاندنو کـێلاّن: کشـتوکالّ لـە ولاّتەکەمان پێویستی بە پەرەپێدانە تا گەشە بکا.

کچ (ن.) کیـژ، ڤیـز، زەری، کیژۆلّـە، دۆت، کەنیشـك: کچا بـێ دایـی، بـێ

تەكبیرو رایی.( پەندە)

**كفن (ن)** پاچەی خامی سپی یە مردووی پێ دەنێژن: مردوو زوو كفن و دفن دەكرێ.

**كلۆ (ن.)** تۆپەداو، خوری : سەری بووە بە كلوی سپی. تۆپەڵە كڵۆی بەفر.

**كلۆر (ن.)** ١- دەرمانێكە بۆ پاك كردنەوەی ئاو بەكاردێت: پێویستە كلۆر لە ئاو بكرێت. (ئان.) ٢- بۆش، بەتاڵ، خاڵی: داری كلۆر زوو دەكەوێت.

**كڵۆڵ (ئان)** چارە رەش، داماو: گەنجێكی كڵۆڵ و داماوە.

**كڵۆڵ (ئان.)** بێ دەسەلاّت، دەست و پێ سپی، هیچ لەدەست نەهاتوو: مرۆڤی كڵۆڵ شەرمەزارە.

**كلاّورۆژنە (ن.ل.)** كولینكە، پەنجەرە، كولانك، كولەك، رۆچنەی سەربان: باران لە كلاورۆژنەی خانووەكەمدا هاتە خوارەوە.

**كڵپەی ئاگر (ن.ل.)** دەنگی بڵێسەی ئاگر: سۆپاكە كڵپەی ئاگری لێ بەرز بووەوە.

**كڵپەی شۆڕش (ن.ل.)** گرمو هۆری شۆڕش: كاوەی ئاسنگەر كڵپەی شۆڕشی هەڵگیرسان.

**كۆت (ن.)** ١- داری ئەستووری دەستو قاچی زیندان: كۆتو زنجیرو پێوەنم پلپڵەو لەرزانەیە. ٢- بن خەرمان، پووشو كا: گەنمەكە شەنەبا كراو كا و كۆتەكەی ماوە. ٣- داری ئەستوور بۆ گا: كۆتی ملی گاكە ئەستوورە. ٤- جلكی لە پشتێن بەرەو ژوور (چاكەت ): كۆتو شەرواڵەكەم جوان دووراوە. ٥- سەری بێ كلاّوو سەرپۆش: كیژەكە سەری كۆت كردووە.

**كۆتایی (ن.و)** تەواو بوونی شتێك ، دووماهی : كۆتایی تراژیدیە كەیم دیت.

**كۆڕ (ن)** ١- كۆبوونەوە بۆ بابەتێك و باسێك: لە كۆڕەكە بەشداریم كرد. ٢- شوێنی كۆبوونەوە: چووین بۆ كۆڕی زانیاری كوردی. ٣- كۆڕ: ئەكادیمیا.

**كۆڕە (ن.)** دەنگی خوڕینی ئەسپ. كۆڕە لێ بكە.

**كۆڕەڤی (ن.)** كۆڕەو، رەڤینا پێكڤە: كۆڕەڤیا كوردان بهارا سالاّ ١٩٩١ دۆزا كوردان گەهاندە هەمی جیهانێ.

**کۆرپە (ن.)** کۆرپەلە، مەلۆتکە، ساوا: کۆرپەکە خەوی لێکەوتووە.

**کۆسپ (ئان.)** تەگـەرە، گیروگرفـت، ئاریشـە، ناخۆشـی، ئاسـتەنگ، گرفـت، کێشە: مرۆڤی ژیر ئـەو کەسـەیە بتوانێت بەسـەر کۆسـپەکانی ژیاندا زاڵ بێت.

**کۆسپە (ن.)** کۆسپ، پلیکانە، پەیژە: منداڵەکە بەسەر کۆسپەکە کەوت.

**کۆش (ن.)** ١- تـەقالاً، کۆشـش: بـۆ گەلەکـەی کۆشـی. ٢- سـەر هـەردوو ڕان، باوەش، ئامێز. پارو بکەوێتە کۆش لەئەرزی باشترە. (پەند)

**کۆشك (ن.)** تەلار، قەسر: دوێنێ چووم بۆ کۆشکی هونەر.

**کۆچەر (ن.)** ١- ڕەوەنـد، ئەوانـەی کوێسـتانو گـەرمێن دەکـەن. ٢- نـاوە بـۆ هەردوو توخمی مرۆڤ.

**کۆچك (ن.)** تـــەلار، دیوەخـــان، دیوانخانـــە، جڤـــات، مێڤانخانـــە: کۆچـــکا خانەدانان هەر یا تژی مێهڤانە.

**کۆچکردن (چ.)** ڕۆیشتن: کۆچکردن بەرەو هەندەران بەردەوامە.

**کۆکردنەوە (چ.)** گردکرنەوە، خڕکردنەوە، لەسەر یەك دانان: بەو پارەی ڕۆژانە دەیدرایێ زۆری کۆکردۆتەوە.

**کۆکین (چ.)** قۆخین: کۆکینی بەتین بۆ تەندروستی خراپە.

**کۆڵ (ن)** ١- شان، پشتی ئادەمیزاد بەلای هەردوو شـانی یـەوە: منداڵەکـە بکەرە کۆڵت.

٢- بارێکە ئەخرێتە سەر شان: کـۆڵێ دار بهێنـە.٣- زۆر: ژنەکـە کۆڵێ گریا.

**کۆڵ (ن.)** ١- سەرشـان، بـار، مسـتەکۆڵە، کۆڵەپشـت، هەگبـە، توورەگـە. ٢- یەخـە: کچـەکەم لـەکۆڵ بـۆوە.. بـێ کۆڵـدان (ك.) بێهەوڵـدان، تێکۆشانی بەردەوام، بێوچان، تەسلیم نـەبوون، بـەبێ شـەکەت بوونو دەست کێشـانەوە لـەکار. قـەت کۆڵنـادەم یـان ئـەو، یـان سەری خۆم لەرێ دەدەم.

**کۆڵ (ن.)** پشـت: پیاوەکـە بـە کـۆڵی خـۆی شـت هەڵـدەگرێت. — نـەدەر: بـــەردەوامی مـــرۆڤ لـــەکاری خۆیـــدا: گـــەلی کـــورد گـــەلێکی کۆڵنەدەرە.

كۆڵ نەدان (چ.ك) وەرس نـەبوون، كـاركردن بـێ وەسـتان: كـورد بـۆ ئـازادی كـۆڵی نەداوە.

كۆلەشێركردن(چ.) سڵ نەكردنەوە، نەترسان، دەست دانەهێنان.

كۆڵەمەرگی (ئان.) ژیانی مەمرەو مەژی: ژیانی كۆڵەمەرگی لەگەڵ مـردن فـەرقی نییە. قوتی لایموت. ئەوەی هەیە قوتی لایموتە نەك ژیان.

كۆڵین (چ.) زەوی هەڵدانەوە: زەوی كـۆڵین كەرەسـتەی باشـی دەوێ. ٢- نـاو لەدارو بـەرد دەرهێـنـان: نـاو كـۆڵین لەسـەر بـەرد مێژووەكـەی كۆنە.

كۆمار (ن.د.) سیستەمی سیاسی فەرمانرەواییە، عێراق دەوڵەتێكی كۆمارییە.

كۆمەكی (ن.و.) یارمـەتی، ئِریكاری، ئاریكـاری، هاوكـاری: بـاوكم كۆمـەكی ماڵـە هەژارەكەی كرد.

كۆمەڵ (ن) گـەل،میللـەت: هـەر كۆمـەڵێك نیشـتمانی هەیـە. كۆمەڵـە پێنوسەكەی كڕی.

كۆمەڵ (ن.) جەماوەر، خەڵك، كـۆ، تۆپـەڵ: مـن كـار دەكـەم بـۆ پێشـكەوتنی كۆمەڵ.

كۆمەڵایەتی (ن.د.) كاروبـــاری خـــەڵك: بابـــەتی كۆمەڵایـــەتی لـــە قوتابخانـــە دەخوێندرێ.

كۆمەڵە (ن.د.) دەستە، كۆ: كۆمەڵە، ڕێكخراوێكی كوردستان بوو.

كۆن (ئان.) شـتی لـە مێـژ، دێـر زەمـان، بـە تەمـەن، كـەون: پێویسـتە شوێنەوارە كۆنەكان دووبارە بەشێوەی خۆیان نوێ بكرێنەوە.

كۆنەپەرست (ئان) كەسی دوا كەوتوو، حـەز بـە تـازە گـەری نـەكات، بـیرو بـاوەری كۆن: پیاوی كۆنەپەرست ناپەسەندە.

كۆیلایەتی (ن. و.) ژێـر دەسـتی، بەندایـەتی، عەبدایـەتی: سـەردەمی كۆیلایـەتی بەسەر چوو.

كۆیلە (ن.) بەندە، عەبد، خولام، بەردە: نابێت كۆیلەی كەس بین.

كو (ئام.) كە، ئامرازی لێكدەرە: كێ نەزانیە ل كوردستانێ كو مافێن خـۆ ب دەسـتڤە ئینـان؟ كـە (جێنـاوی لێكـدەرە): ئـەو یـاریزانێ كـو خەلاتكری خەڵكێ باژێڕێ مە بوو.

کوانوو (ن.) ئاگردان، مەکۆ: چیاکانی کوردستان کوانووی پێشمەرگەن.

کوت و مت (ئان) لە یەك چوون، وەك یەك، ئاواز کوت و مت خوشکیەتی.

کوژاندنەوە (چ.د) ١- دامرکـــانی ئـــاگر: ئاگرەکـــەی کوژانـــدەوە.٢- ســـرینەوە: تەختەکەی کوژاندەوە

کوژەك (ئان.) بکوژ، کوشندە: ئەنفلووەنزا باڵندان نە ساخیەکا کوژەکە.

کوژی (ن.) گۆشـە، قـوژبن، قـولاچ، پـەنا. کـوژی خانیـاوی کـژی تشـتێ بچویکن.

کورت (ئان.) بچووك، پێچەوانەی درێژ: ئەو کچە باڵای کورتە.

کورت (ئان.) دژی درێژە: وەریسکێ درەوینی یێ کورتە.( پەندە)

کورد (ن.) نەتەوەی کورد. کورد نەتەوەیەکی نەژاد ئاریە.

کوردستان (ن.) خاکی کوردان، وڵاتی کوردان: کوردستان لـە شـەڕی چاڵدێراندا بە ناهەق لە نێوان عوسمانییەکانو سەفەوییەکان دابەش کرا.

کورسی (ن.) ١- داری لێکـدراو: منداڵەکـە لەسـەر کورسـی دانیشـتووە. ٢- ئایەتێکە لە نێو قورئان : ئایەتی کورسیم لەبەرە.

کوڕگەل (ن.) گەنجو لاوی کۆم بوو، کوڕگەلینە ئەمڕۆ رۆژی هیمەتە..

کوزرین (چ.) سووتانی موو، سووتانی گۆشـت بـە بـرژان یـان سوورکردنەوە، سـووتانی جـەرگو دڵ بەسـەرهاتێکی دڵ تـەزێن: دلێ مرۆڤـێ دلۆڤان زوی ب سەرهاتانو کەسان دکوزریت.

کوشتار (ن.) کوشـتنی بەکۆمـەڵ، ڕەشـە کـوژی: ئـەو کوشـتارەی بـەعس لـە گوندی عەوێنەدا کردی، بێ وێنە بوو لە مێژوویی زۆرداریدا.

کوشتن (چ .) مراند ن بە هەر ڕیگایەك بێ : تیرۆرستە کەیان کوشت .
؟ (چ .) سەربڕین : قوربانیەکەیان کوشتەوە.

کوچك (ن.) ئاگردان: کوچك لسەر سێ پێپکان دروینیت.

کولاڤ (ن.) کولاو: دەستێ خۆ دانە سەر کولاڤێ خۆ دا با نەبەت.( پەندە)

کوڵان (چ) جۆش هاتنی بەگەرمی : ئاوەکە تەواو کوڵا.

کوڵان (چ.) ١- جۆش هـاتنی ئـاو: ئـاو لـە سـەد پلـەی سـەدی دیتـە کـوڵ. ٢- پوخت بوونی شتی خاو: چێشتەکە کوڵا.

کولله (ن.) ١- کللۆ: باڵدارێکی درێژکۆڵـەی قـاچ زبـرە سـەوزایی دەخـوات و

زیان بەخشە: دەرمانی تایبەت هەیە بۆ لەناو بردنی کوللە. ٢- پەردەیەکی تەنکی لەهاویندا بەدەوری جێگای نووست دەگێردرێ: لە ترسی مێشوولە شەوان لە ژێر کوللە دەخەوین.

**کوڵمە (ن.)** ڕوومەت، گۆنا: کوڵمەکانی سوورن.

**کولێرە(ن.)** نانیکی حره ، ئەستوکی ناو تە ندوره : کولێرەی گەرمم بۆ بێنە چونکە لەگەڵ چا خۆشە.

**کولیچە (ن.)** کلۆچە، کلۆچ، جۆرە بەرچاییەکە لە جەژناندا دروست دەکرێ: چەند کولیچەیەکمان بە چا خوارد.

**کون (ن.)** ١- هەر شتێ لەناوەوەی ڕووناکی لێ دیاربێ: کونی دەرگاکە دابخە. ٢- خانووی جانەوەرانی وردیلە: کونە مێرووەکە بگرە.

**کون و قوژبن (ن)** دەلاقەی بچووك لە شتێکا، شوێنی بزر و بەکەلێن: کون وقوژبنیماڵەکە گەرام.

**کوندە (ن.)** لە پێستی ئاژەڵ دروست دەکرێ بۆ هەڵگرتنی ئاو: ئاوی نێو کوندە پاکە. — پەپۆ: کوندە پەپۆیەکان دژی ئازادی و ڕووناکین.

**کوورەی هەنگ (ن. ل.)** شانەی هەنگ، شارەی هەنگ، پوورەی هەنگ: کوورە هەنگەکەیان دەرهێنا.

**کوون (ن.)** ڕەشماڵ، کوین، کۆن، چادر. کونێ ڕەش نازناڤا نڤیسەرێکی کوردە.

**کوێ (ئاك.)** کام شوێن، کام جێگا: بۆ کوێ ڕۆیشت.

**کوێ (ج.پ.):** کێندەر، کام جێ: دوێنێ دوای نیوەڕۆ چووی بۆ کوێ؟

**کوێ(ج.پ)** پرس لە شوین دەکرێ کێندەر: دکتورات لە کوێ هێناوە .

**کوێخا (ن.)** کۆخا، کێخوا، هەڵبژاردەی گوند، موختار: گوندی ژاڵە کوێخایەکی بە هەڵوێست و خزمەتگوزاریان هەبوو.

**کوێر (ئان)** نابینا: کوێر بەهرەیەکی تری هەیە.

**کویر (ئان.)** قووڵ، کوور: چیا چەندێ بلند دبیت گەلیێ وی هندێ کویرە.(پەندە)

**کوێر (ن.)** نبینا، مرۆڤی بێ چاو: کوێر تا دەمرێت بە تەمای دوو چاوی

ساخه. ایی: گەلی کورد بە کوێرایی چاوی دوژمنـان یـەکگرتوو دەبێت. — ەوەری: نەخوێندەواری کوێرەوەرییە.

کوێرەوەری (ئاك.) ناخۆشـــی، دەردەســـەری، هـــەژاری، تەنگانـــە، دەربـــەدەری، کۆرەوەری: کورد کوێرەوەری زۆری دیوە.

کوێستان (ن.) ١- زۆزان، کوێستان، کۆسار، شوێنێکی ناو چیایە، لە هاویندا ئاو و هەوای فێنکەو ئـاو و لـەوەڕی بـاش بـۆ مـەڕو مـاڵات هەیـەو ســەیرانگەیەکی دڵڕفێنــە: ڕەوەنــدەکان لــە بــەهاردا بــەرەو کوێستانەکان هەڵدەکشێن. ٢- ناوە بۆ مێینە.

کێ (ج.پ.) کامیان، کما، کام کەس: کێ بوو تازە لە دەرگای‌دا؟

کێشا (ن.) ١- زۆر خایانـدن: تـەواوکردنی فەرهەنگەکـە درێـژەی کێشـا. ٢- کێشـانی جگـەرە: پیاوەکـە جگـەرەی کێشـا. ٣- شـت کێشـان بـە تەرازوو: ئازاد گۆشتەکەی کێشا.

کێشان (چ.) ١- لە تەرازوودان، پێدان: کـام شـووتی گەورەیـە بۆمـان بکێشـە. ٢- خواردنی جگەرە، فڕ لێدانی جگەرە: بە خەیاڵیشمدا نایـەت جگەرەم کێشابێ. ٣- وێنە کردن، دروستکردنی وێنە: حەمـەی برادەرم بە وێنە کێشان خەریکە.

کێشە (ن) تەنگ وچەڵم، گیرو گرفت: کێشەکەمان چارەکرد.
کێشە (ن.) شەڕو دەمەقاڵێ: کێشەی نێـوان کـوردو داگیرکـەران کۆتایی نایە.

کیشوەر (ن.) قاڕە، چەند ولاتێك بەیەکەوە کیشوەرێك پێکدێنن: کیشـوەری ئاسیا گەورەترین کیشوەرە لە جیهاندا.

کیڤی (ئان.) کیوی، چیایی، کۆڤی.

کیلۆمەتر (ن.ل.) یەکەی پێوانە: کەرکووك نزیکـەی ١٠٠ کیلۆمـەتر لەهـەولێرەوە دوورە.

کێڵگە (ن. د.) ١- زەوی کێڵـــراو بـــۆ بـــەروبوومی کشـــتوکاڵی جوتیارەکـــە کێڵـگەکەی بـاش راگرتـووە.٢- شـوێنی بـەخێوکردنی ئـاژەڵ و پەلەوەر: سیروان لە کێڵگە کار دەکات.

کێم (ئان.) کـەم، پیچـەك، تۆزێـك، کـەمێك: مـرۆڤ چـەند فێرببیـت هـەر کێمە.

# گ

**گا (ن .)** نێرەی چێڵ : لە گوێی گادا نوستووە

**گاتا (ن .)** نـزاو نوێـژ لـە ئـاینی زەردەشـتی: گاتاکـان بەشـێوەی هـەورامی بوون.

**گازکردن (چ .)** بانك کردن: هاوارکردن سیامەند گازی حەجی کرد.

**گازیکرن (چ.)** بـانگکرن، مێڤـانکرن: رێڤەبـەرێ ڤوتابخـانێ پێدڤییـە بلایـێ کێمیڤە سالێ دووجاران دایكو بـابێن ڤوتـابیێن خـۆ گازیکەتـە جڤیانێ.

**گاسن (ن .)** ئاسنی نووك تیژ زەوی پێ دەکێلن: گاسنی لە زەوییەکەدا.

**گاڤ (ئاك.)** کات، دەم، وەخت، سات: د گاڤا خۆدا بخینە.

**گاڵتە (ئاك.)** ڤۆشمـە، سـوحبەت، ترانـێ، پـێ رابـواردن: گاڵتـە بـە هـەژاران مەکە.

**گاڵتە پێ کردن (چ.)** پێ ڕابواردن، سوحبەت پێکردن، گەپ: گاڵتە بە کەس مەکە.

**گەپ (ن.)** ١- گاڵتە: منداڵەکان گاڵتەو گەپ دەکەن. ٢- ڤووت: گەپی کە.

**گەر ( ئام )** ئەگەر: گەرچی تووشـی ڕەنجـەڕۆیی‌و حەسـرەت‌و دەردم ئـەمن .. لەت لەتم کەن، بمکوژن هێشـتا دەڵـێم کـوردم ئـەمن.( هـێمن موکریانی)

**گەڕ (ن.)** گۆڵ، گۆم. خەریك بوو لە گەڕەکە بخنکێ

**گەڕەك ( ن .)** کۆڵانە . کوچە : ماڵمان لە گەڕەکی ڕاپەڕینە .

**گەردبین (ن.ل.)** وردبین، میکرۆسکۆب: ڤایرۆس بە گەردبین دەدیترێ.

گەردش (ن.) هاتوهاوار، دەستیان بە تەپڵ لێدان کرد کردیان بە گەردش.

گەرم (ئان.) ب تێهن، دژی سارە. ئەمساڵ دنیا زۆر گەرمە.

گەرمو گوڕ (ئان.) گورجو گۆڵ، خێراو رێكو پێك: چوستو چەلەنگ: لە رێ ڕۆیشتنەکەدا زۆر گەرمو گوڕ بوون.

گەرما (ن.د.) تینی خۆرو ئاگر: گەرما ئاوی سارد ئەخاتە برەو.

گەرماوگەرم (ئاك.) زوو بەزوو ،لەکاتی خۆی دەسبەجێ. شت گەرماو گەرم نەبێ بێ سوودە.

گەڕیان (چ.) گەڕان، سووڕان، گەڕان و سووڕان: گەڕیام و گەڕیام من نەدی کەس وەك تۆ جوان بێ.

گەڕیدە (ن.) گەڕۆك، گەشتیار، گەڕهۆك، دونیا دیدە: گەڕیدە ڕۆژهەڵاتناسەکان زۆر شتیان لەسەر کورد نوسوە.

گەزۆ (ن.) ئاونگی شیرینی داری گەز: گەزۆی سلێمانی بەناوبانگە.

گەش (ئان.) ١- گوڵی پشکووتوو: گوڵی گەش جوانە. ٢- ئاگری خۆشو بەتاو: ئاگری گەش رووناکیو گەرمی هەیە. ٣ مرۆڤی رووکراوە: منداڵەکە بە دیتنی باوکی گەش بووەوە. — کردنەوە: بە گەش کردنەوەی خەڵوز بۆنی نامێنێت.

گەشانەوە (چ.) ١- جوان بوونەوەی گوڵ دوای ئاودانو سست بوون: دوای ئەوەی ئاومان دان زۆریان نەبرد گەشانەوە. ٢- رووخۆش بوون، کەیف هاتن، پێکەنین: بە چوونی ئێمە هەموویان گەشانەوە. ٣- سوور بوونەوەی ڕەژوو، خەڵووز: تا خەڵووز تەواو نەگەشێتەوە باش نییە لێی نزیك بیتەوە.

گەشبوون (چ.) بشکڤین، پشکۆتن: گول چاوا ب ئاڤو هەتاڤێ گەش دبن، دل ژی وەسا ب خۆشیو هیڤیان خۆش دبن (پەندە)

گەشت (ن.) سەیران: قوتابخانەکەمان گەشتێکی خۆشی ئەنجامدا.

گەشەپێدان (چ.) پەرە پێدان ، باش کردن : رەخنە بۆ گە شەپێدان گەنجینەیە.

گەشتیار (ن.ب.) دونیاگەڕ، گەڕیدەی شاران: گەشتیارەکانی باشوور لەهاوینە هەوارەکان دەمێننەوە.

گەل (ن.) ١- میللەت، خەڵکێك کە بەیەك زمان بدوێن: هەموو گەلان برای منن، تەنیا زۆرداران دوژمننن. (پاش.): ٢- بۆ کۆکردنەوەی ناو. مێ گەل، کوڕ گەل.

گەلا ( ن .) پەلکی دار و درەخت و گوڵ: گەڵای پایز هەلدە وەرێ.

گەلا (ن.) ١- پەلك، بەرگ: درەخت بە گەلاوە جوانە. ٢- ناوە بۆ مێینە.

گەلا: سەد دۆلار، گەلایەکم بدەرێ.

گەلاڵە (ن.) ١- ناوی شارۆچکەیەکی کوردستانە لە باڵەکایەتی: (ئان.) ٢- کارێك کە تازە یا نیوە تەواو بێ، یان دوا بڕیاری لەسەر نەدرابێ: پرۆژەکە گەلاڵە بووە، ماوە بخرێتە بەر دەست.

گەلای سینەمەکی (ن.ل.) گەلاێەکە دەرمانی رەوانی لێ دروست دەکرێ.

گەلەك (ئان.) گەلێك، زۆر، پڕ، فرە: گەلەك لێهاتن ژ گەلەك ژێهاتنان باشترن. (پەند)

گەلێ (ئان .) زۆر،گەلێك : قاسپەی کەو گەلێ خۆشە .

گەلی (ن.) کویراتیا دناڤبەرا چیایێن بلنددا، شیڤ: گەلی عەلی بەگ هاوینە هەوارێکی خۆش و بەناوبانگە دەکەوێتە پارێزگەی هەولێر.

گەلێك (ئان.) گەلەك، هەندێك، زۆر، فرە: بەشێکی زۆر: لەکاتی نەخۆش کەوتنم گەلێك لە برادەرەکانم سەردانیان کردم.

گەمارۆ (ن.) ١- شالاو، پەلامار: هێزی پێشمەرگە گەمارۆی کەرکووکیان دا و ڕزگاریان کرد. ٢- دەورەگیران: گەمارۆی ئابووری کارەساتی لەدوا بوو.

گەماردان (چ.) دەباخکردن، دەباخکرن. گەماردان پیشەیەکی کۆنی کوردستانە.

گەمە (ن.) یاری، وازی: گەمەی مندالان خۆشە.

**گەمیان (ن .)** گەرمانی / ناوچەیەکە

**گەنج (ن.)** لاو، جان، جەحێل، تۆلاز، خورت: مرۆڤێ گەنج هەرێ ل گورە.

**گەنم ڕەنگ (ن.ل.)** مرۆڤی ڕەنگ پێست زەرد ( نە سپی نە ڕەش ) : مندالی گەنم ڕەنگ خوێن شیرینە.

گرواندن (چ.) پێستی ئاژەڵ یا ولآخی بۆ مەشکەو جانتاو ... چاك دەکەن بەهۆی ئاراوەی مازوو: مازوو بەکاردێت بۆ خۆش کردنی پێست.

**گەهشتن (چ.)** گەیشتن، گەیین: یێ خۆ بوەستینیت دێ گەهیتە مرادا خۆ.

**گەواهی(ن . و)** شایەتی : خەڵك گەواهی بۆ نووسینەکانی پیرەمێرد دەدات.

**گەورە (ئان.)** ١- زل، زەلام، زەبەلاح، قەبە: هۆڵێکی گەورەیان بۆ کۆبوونەوە دروست کردووە. ٢- پایە بەرز، بەناوبانگ، بەنرخ، بەڕێز: خانەوادەیەکی گەورەن. ٣- بەتەمەن: بە چەند ساڵێك لەو گەورەترم. ٤- درێژ، بەرز: ئەم دارە لەوە گەورەترە. (ن.) ٥- سەرۆك، پێشەوا، ڕێبەر: ئێمەش گەورەمان هەیە پرسی پێدەکەین، گەنج بووە. کچەکەت گەورە بووە.

**گەیاندن ( چ .)** ١- ناردراو بەخاوەن بوون: دیاریەکەم گەیاندە دەستی. ٢- رەسیە کردنی خواردن و میوە: چێشتەکەمان پێگەیاند.

**گەیاندن (چ.)** گەهاندن: گەیاندنی ڕاستییەکان بە خەڵك ئەرکی هەمووانە.

**گەیشتن (چ.)** ١- ڕەسین، وەختی کەڵك بەخشین، پێگەیشتن، کامڵ بوون: هێشتا ترێیەکە بە تەواوی نەگەیشتووە. ٢- هاتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك: هەر کاتێك گەیشتن ئاگادارم کەن.

**گژوگیا( ن .)** گیاو گۆڵ : کەروێشکەکە لە ناو گژوگیا دابوو.

**گڕ(ن .)** بلێسە: ١- گڕی ئاگر بەرزە، تا ئاگرەکە تەواو گڕی سەند . ٢- زبر : پیستە ی گڕ بوو .

٣- زەبری دەنگ : دەنگی گربووە ٤- زل : کابرایەکی ددان گرە.

**گروتین (ئان.)** هێزو توانا: لەزگین گروتینێکی زۆر بەکاردێنێت لە کارکردندا.

گران (ئان.) ب بها، بهادار، بەهادار، بسەنگ: گران بە دایێ گراڤی بی (پەندە).

گرتن (چ.) ١- دیلکردن: ئەوانەی لە شەڕەکەدا گیرابوون، هەموویان بەر بوون. ٢- کوشین: پێڵاوەکە تەنگە پێم دەگرێ. ٣- بەند کردن، ڕاگرتن: توند گرتمان نەمانهێشت بجوولێ. ٤- بەڕۆژوو بوون: هەر چەندە بە تەمەن گچکە بوو بەلام زۆربەی ڕۆژووەکانی گرتوون.

گرتنە بەر (چ.) ١- پەیڕەو کردن،: بۆ چارەسەری کێشەکە هەموو ڕێگایەك دەگرینە بەر. ٢- ڕۆیشتن بە ئاڕاستەیەکی دیاریکراو: بۆ سەلامەتی ڕێگا دوورەکەیان گرتە بەر.

گرتنەوە (چ.) ١- شتێك کە لە بڵندایییەوە بکەوێ بگێریتەوە: نەمهێشت بکەوێتە سەر زەوی هەر لە هەوا گرتمەوە. ٢- ڕێگرتن لە ڕەت بوون، تێپەڕین: گۆڵچییەکی باشیان هەبوو هەر تۆپێکی بۆ دەچوو دەیگرتەوە. ٣- شتێك پێشتر گیرابێ‌و جارێکی دی بگیرێتەوە: هەلاتووەکانیان دووبارە گرتنەوە. ٤- هەندێك شت دەگیرێتەوە تا بەکاردێ، ئامادەکردن: لەگەڵ خواردنەکەدا ماستاوێکی تیریشیان بۆ گرتبووینەوە.

گرد (ن .) تەپۆلکە: شەهیدان لە گردی سەیوان نێژراون.

گرد (ن.) ١- تەپە، تەپۆلکە، بەرزایی: چەند جار ئاگری نەورۆزمان لەسەر گردەکە کردۆتەوە. (ئان.) ٢- خڕ، درشت، گەورە: دەنکە گوڵە بەڕۆژەکان زۆر گرد بوون. -بوونەوە (چ.) کۆکردنەوە. کۆبوونەوە، خڕ بوونەوە، کۆم بوون: بۆ باسکردنی کێشەکە هەموومان گرد بووینەوە. —کردنەوە (چ.) کۆ کردنەوە، خڕ کردنەوە: نازانم بۆچی گردیان کردینەوە.

گرژ (ئان .) کشت، لە توڕەی : ناوچەوانی گرژ بوو.

گرم‌و هۆڕ (ن.) دەنگی بەرز، گرمە: لەبەر گرمەو هۆڕەی تۆپەکان کەس ئاگای لەکەس نەما.

گرمۆڵەبوون (چ.) خۆکۆکردنەوە، سەر لە قاپێل نان، گرمۆتە: لە سەرمانا خۆیان گرمۆڵە کردبوو.

گرمە (ن.) دەنگی بەرزی وەك تۆپ‌و هەور: هەور لە بەهاراندا دەگرمێنی.

گرمە (ن.و.) دەنگی گەورە، بلێچ، گۆڵە: گرم‌و هۆری هەور ئەم ناوەی پڕ کردووە.

گڕنژین (چ.) بشکوڕین، خەنـدە، زەردەخەنـە: گڕنـژین نیشـانەکا ئاشـتی و خۆشتڤییێیە.

گرنگ (ن.) جێگەی بایەخدان، پڕ بایەخ: ئەمە کارێکی گرنگە.

گرێ (ن .) ١- فرێز لە کوردی گرێ ناوی لەکش گرێ کاری دێت. ٢- کێشە. ئەمە گرێیەکی پڕ ئار کێشەیە.

گرێ (ن.) ئالۆزی، کۆسپ: گرێیا دەستان نەدە بەر ددانان.( پەندە)

گریان ( چ .) فرمێسـك هاتنــە خــوار، ئــاو لــە چــاو هــاتن : گریانەکــەی دانامرکێتەوە.

گرێدان (چ.) بەستان: خودان کار نابیت پێ خۆ ب پێ بێ کارا ڤە گرێدەت.

گزر (ئان.) وشك: گەلای گزر بۆ خواردنی ئاژەڵە.

گزیر (ن.ب) کەمێکە کارو باری دێ یەك ببینێ: گزیری دێ یەکەی راسپارد.

گشت (ئان .) هەموو: یاخوا گشت ئاواتەکانمان دەهاتە دی .

گڤە (ن.) دەنگی با، هاشە، وورشە.

گڤێرین (چ.) هەرسکرن، هاڕین، بووژین.

گفت (ن.) پەیمان، بەڵێن، قەول، سۆز: گفتیـان بەیـەك دابـوو کـە تـا سـەر لەگەڵ یەك بن.

گفتوگۆ (ن.) قســەکردن بەیەکــەوە، گوفتــار، دانوســتاندن، وتووێــژ، هەڤپــەیڤین: گفتوگۆکــەمان لــەبارەی پرســە سیاســییەکانی ئێستای عێراق بوو.

گڵەزەردە (ن.ل.) ١- ناوی شوێنە: گڵەزەردە گوندێکی کوردستانە.

گلەیی (ن.و) گازاندە : گلەیی لە رۆژگار ناکرێ.

گڵپە (ن .) دەنگی بڵێسەی ئاگر : لە گڵپەی ئاگرە کە ترسا.

گۆ (ئان.) هێلکەیی، مەیلەوخر: گوارەی لەگوێی سێ گۆیە.

گۆبەند (ئان.) گێچەڵ، شەڕوشۆڕ، کێشمەکێش، فەلّتەنە: گۆبەندو هەرا مەنیێوە.

گۆتن (چ.) قسەکردن، وتن، ئاخفتن، پەیڤین: گۆتنا باش‌و یاخراپ ژ دەڤەکی دەردکەڤن. ( پەندە)

گۆڕ (ن.) ١- قەبر، گڵکۆ: تا دەچینە گۆڕەوە پێویستە لە بەدیهێنانی نیازەکانت بەردەوام بی. (ئان.) ٢- تەختایی، ڕاستایی: لە زەوییە گۆڕەکەدا دەستمان بەشایی کرد. (ئاك.) ٣- زەوی، جێ، عەرد: عەلاگە برنجەکەی لێ بەو گۆڕەوە وەربوو. سەردەم شیعرە کانی گۆراو گۆرکرد.

گۆران (ن .) ١- نازناوی شاعیرێکی ناوداری کوردە.٢- ناوی عەشیرەتێکی گەورەی کوردستانە. ٣- بەشەزاری کوردی: ئەدەبیاتی گۆران پێشکەوتووە.

گۆڕان (ن.) وەرچەرخان لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی دی: باروگوزەرانی گوندەکانیش وەك خۆی نەماوە گۆڕاوە.

گۆرانی (ن.) ١- زاری گۆرانی: زاری گۆرانی زمانی شیعری مەولەوی بوو. ٢- بەستە، ستران: گۆرانی کوردی هەنگاوی باشی ناوە.

گۆرانی بێژ (ن.ل.) گۆینندە، هۆنەر، شایێر، ستران بێژ: گۆرانی بێژانی رەسەن خۆشەویستن.

گۆڕاوگۆڕکردن (چ.) ئاڵوگۆڕکردن ، وەرگێران

گۆڕستان (ن.د.) گڵکۆ، ئارامگە، پانایی، قەبرستان: پیرەمێرد لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

گۆڕگواستنەوە: یاخوا سەدام گۆڕاو گۆڕ بکرێ.

**گۆڕین (چ.)** ١- شتێ لە جێگەی شتێك ساندن: کراسەکەم گۆڕی بە کراسێکیتر. ٢- جلك داکەندن بۆ شووشتن: کراسە چڵکنەکەم گۆڕی. ٣- ئاڵوگۆڕکردن: پارەکەم گۆڕی.

**گۆزە (ن .)** دەفرێکە بۆ ئاو، گۆزك: گۆزەی بردە سەر کانی .

**گۆشت (ن.)** ١- ئەو نەرماییيەی کە نێوان ڕەگو پێستی پڕ کردۆتەوە: گۆشتی گۆلك زیاتر لای ئەم قەسابە هەیە. ٢- هەرچی لەنێو قەپێلكو توێکڵی میوەدا بێ.

**گۆشە (ن.)** ١- سووچ، قوژبن، قوڕنە: لە گۆشەیەکی مزگەوتەکە پاڵ کەوتبوو. ٢- ئامێرێکی بیرکارییەو لە کاروباری هێڵکاریدا بەکاردێ.

**گۆشەگیر (ئان.)** ١- دابڕاو، کەنارکراو، دوورخراو، لادراو، دوورەپەرێز، دوورە خەڵك: گۆشەگیربوون باش نییە. ئازاد گۆشەگیر بووە لە خەڵك. ٢- ئامرازی ژێ لە کەوان قایم کردن.

**گۆگرد (ن.)** کانزایەکی زەردە زوو گڕ دەگرێ: هێمای کیمیایی گۆگرد (S)ە.

**گۆم (ن.)** ئەستێڵ، حەوز، پنگاندنەوەو کۆکردنەوەی ئاو: دانا لە گۆمەکە مەلەی دەکرد.

**گۆیندە ( ن.ب)** گۆرانی بێژ قسەکەر: حەسەن زیرەك گۆیندەیەکی ناودارە.

**گواستنەوە (چ.)** ١- ڕاگواستن، هێنانو بردن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك: کەلوپەلەکانمان بە چەند ئۆتۆمبێلێك گواستەوە خانووە تازەکە. ٢- هاتنە ماڵی ژن دوای مارەکردن، بووك گواستنەوە.

**گوتن (چ.)** ١- قسەکردن، ئاخافتن، پەیڤین، وتن: قسەکەم بە هاوڕێکەم گوت. ٢- ئاواز خوێندن: کچەکە گۆرانی گووت.

**گوپیتك (ن.)** لووتکە، بەرزترین شوێن لە چیاو لە دار: گوپیتکا چیایێن بلندێن کوردستانێ هەر ژ بەفرێ دسپینە.

گوڕ (ن.) ١- گڕ، بڵێسه: گوڕی ئاگرەکه ئەوەندە زۆر بوو دونیای ڕووناك کردبووەوە. (ئاك.) ٢- خێرا، بەپەلە، لەز: باران بە گوڕ دەهاتە خوارەوە.

گوڕ( ئان .) توان و تاقەت : ١- پیره بەڵام بەگوڕه .٢- گڕی ئاگر: ئاگرەکه بە گوڕدەسوو تێ ٣- هاتنە خوارەوەی فرمێسك: فرمیسکی بە گوڕ دەهاتە خوارێ .

گورج (ئان.) چاپووك، وریا، دەستبەجێ، توند، لەز، توندو تۆڵ، خێرا، جمو جۆڵ: لەمەولا کارەکانت بە گورجی ئەنجام بدە.

گورج (ئان.) چوستو چەڵەك، توند، خێرا، بەپەلە، پەیت و پۆڵ: زانا گورج دەڕوات.

گورچیله (ن.) ئەندامێکی لەشە، کلیه: مرۆڤ دوو گورچیلەی هەیه.

گورگ (ن.) گور، شینۆ، دوژمنی سەرسەختی مەڕو پەز: گورگ لە ڕانە مەڕەکەی داوەو چەند سەرێکی لێ خواردوون.

گوزەران (چ.) ژیان: مایەی گوزەرانی ئەمساڵمان هەیه.

گوزەران (ن.و.) واتە ژیان بەسەربردن: ئازاد گوزەرانی خراپە.

گوشاد (ئان.) دڵشاد، دڵخۆش، کەیف خۆش، شاد: گوشاد بووم بە دیتنت.

گوڵ ( ن .) خونچەی پشکوتوو : گوڵی پاکی ئیرەمی بۆتانم.

گوڵ (ن.) ١- خونچەی پشکوتوو: لە باخچەکەدا چەندەها گوڵی جوان هەبوون. ٢- لەیاری گۆرەوی بازیدا، دەست لێدان: گوڵم لێدا.. دەو گوڵەی دابوو. ٣- نەخش لە مافووری چنراودا: ئەو مافوورە گوڵی وردە.

گوڵ (ن.) ١- گوڵی بۆنخۆش: باغچەکەمان گوڵی جوانی تێدایه. ٢- گوڵ لە یاری کلاّوین: گوڵ بێنە. ٣- نەخشو شتی چنراو:

مافوورەکـەمان گـوڵی ڕەنگـاو ڕەنگـی لەسـەر چـنراوە. ٤- نـاوی ژنانە: گوڵە گوڵی ناو ژنانە.

گولاڤ (ن.) گـولاو، ئـاوی گـوڵ، ئاڤـا گـولان، بـۆن، بـۆ: گولاڤبـاران نیشـانا دڵخۆشییێیە.

گولاڵە (ن .) ١- مێلاقە ،ڕەبەنۆك : نیشانەی بەهارە . ٢- ناوە بۆمێ : گولاڵـە گوڵێکی لێکردەوە.

گوڵە بەیبوون (ن.ل.) جۆرە گولێکە: گوڵە بەیبوون گوڵێکی بۆنخۆشە.

گوڵەزەردە (ن.ل.) جۆرە گوڵێکە بۆ داوو دەرمان بەکاردێت.

گولله (ن.) فیشەك، بەرکێ تڤـەنگێ: دوژمنـان ب هـزاران گـەنجێن کـوردان گولله باران کرینە.

گوڵی کێوی (ن.ل.) ئەو گولاڵنەی کـە لـە کێـوو شـاخان هـەن: گـوڵی کێـوی لـە کێـوو شاخەکانی کوردستان سەر دەردێنن.

گومرانی (ن .) شـك و گومـان ئـەوجا : قسـەی راسـت لـە گومراییمـان رزگـار دەکات.

گونەهـ (ن.) گوناه، تاوان: گونەهکار ناچنە بەهەشتێ.

گونەهبار (ن.ئان.) تاوانبار، خەتابار: جهێ گونەهباران لسەر دنیـایێ زیندانـەو ل بن دنیایێ ناڤ ئاگردانە.(پەندە)

گونجان (چ.) ڕێکەوتن، پێکهاتن، بـۆی بـووە، سازاندن: ژیـانی هاوسـەری بـە گونجان دەبێ.

گوند (ن.) لادێ، دێهـات، ئـاوایی: دوای ڕاپــەڕین بەشـێك لـە گونـدەکانی کوردستان ئاوەدان کرانەوە.

گوهـ (ن.) گوێ، گوێچکە، ئەندامی بیستنە: یێ گوهێ خۆ نەدەتە مـەزنان دێ لێ هێن شاخێن بزنان (پەندە)

گوهوڕین (چ.) گۆڕین: مرۆڤێ نەزان گرانی دگوڕیت ب ئەرزان.

گوێ (ن.) ١- ئەندامی بیستن، گوش، گێ، گوێچکە: گوێیەکانی گرانن پێویستە لە پێشەوە بێ. (ئاك.) ٢- لا، ڕۆخ، دەم، کەنار، جەم: لە گوێ ئاوەکەدا دانیشتبوون.

گوێدرێژ (ن.) کەر، چوار پێ: بارەکەی بە گوێدرێژەکەی ئێوە گواستەوە.

گوێز (ن.) بەری داری گوێز، لە لادێ شاخاوییەکانی کوردستاندا زۆرە: گوێزی هەورامان بەناوبانگە.

گوینیك (ن.) گووش، گۆنیە، تویرکەکێ مەزن، توورەکەیەکی گەورە: یێ گوینیکێن گران ببەر خۆ ڤە راکەت دێ ناڤکاوی کەڤیت.

گیا (ن.) سەوزاییەکە لە خۆیەوە سەوز دەبێ: بەرخەکەمان گیا زۆر دەخوات.

گیان (ن.) ١- جان، ڕۆح: هێشتا گیانی لەبەردا مابوو کە ناوی بکوژەکەی ئاشکرا کرد. ٢- لەش، بەدەن، جەستە، قالب: هەموو گیانی ژان دەکا. ٣- وشەی وەڵامدانەوە لەکاتی بانگکردندا: کاکە، گیان، چییە؟

گیاندار (ن.) گیانەوەر، گیانلەبەر، جانەوەر. مەڕ گیاندارێکی بەستەزمانە.

گیانی بەگیانی (ئان.) دۆستو بڕادەری زۆر نزیك، خۆشەویست، هاوڕێ لە دڵا شیرین: ئازاد برادەرێکی گیانی بەگیانی منە.

گیاوەردێنە (ن.ل.) جۆرە گیایەکە: گیا وەردێنە بۆ نەخۆشی چاو ئێشە دەرمانی لێ دروست دەکرێ.

گێتی (ن.) جیهان گێتی: جەنگی یەکەمو دووەم دوو جەنگی خوێناوی بوو.

گێژ (ئان.) گیانداری وڕو کەم هۆش: مرۆڤی گێژ تێگەیشتنی ئەستەمە. — او: کورد ئەمڕۆ زیرەکانە خۆی لەو گێژاوە رزگار دەکات. — بوون: گێژبوونی منداڵەکە بەهۆی نەخۆشی بوو. — کردن: گێژ کردنی ئاژەڵەکە بەهۆی نەخۆشی بوو. — وتوویژ: ژیان لەگەڵ مرۆڤی گێژو وێژ ناخۆشە. — دان: دانەوێڵەکەیان لە گێژاندا.

گیرۆده (ن.) گرفتار، هۆگر: گیرۆدەی دووچاوی مەستی تۆم.

گێڕان (چ.) ١- گەڕاندن: منداڵ گێڕان بۆ سەیرانگاکان پێویستە. کوتینـەوە سەربان گێڕان پێویستە.

گیرفان پرکردن (چ.) پارە کۆ کردنەوە : بانە کرێتە هۆی گیرفان پر کردن .

گیرکردن (چ.) ١- گرتنـــەوە، ڕاگــرتن، وەســتاندن، تــاخیر کــردن، دواخســتن: بەدەست خۆمان نەبوو ئەوان گیریان کـردین. ٢- تونـد کـردن، قـایمکردن، مکومکردن: تونـد گـرتمو هـەردوو دەسـتم لـێ گـیر کردون.

گێرمەو کێشە (ن.ل.) کێشە کێش: گێرمەو کێشەی نێوانمان کۆتایی هات.

گێچەڵ (ن.) تەشقەڵە، کێشە، گرفت، ئاژاوە: گێچەڵ بە کەس مەکەن.

گێڵگە (ن.د.) زەوی‌و زار: گێڵگە بە مین چنراوەکان پاك دەکرێنەوە.

گینگڵە (ئان. ) حولیا ، جینگل ، لەتاو ئازاری گینگڵەی دەدا.

# ل

**لۆزەندەر (ئان.)** کەڵەگەت، چوار شانە، زەبەلاح.

**لۆك ( ئاك.)** داخراو، قفلّ، گاڵەدان، گریّ دان، کلّۆمدراو: دەرگا کەم لۆك کرد. هێشتا نەکراوەتەوە: ئۆتۆمبیلەکە لۆکە.

**لۆك کران (چ.)** داخران، گارەدان، گریّدان: دەرگاکان لۆك کران.

**لۆکە (ن.)** ١- پەمۆ، پەمبی، مادەیەکی سپی نەرمە لە بوارەکانی تەندروستیو دروستکردنی پێخەفو پیشەسازی رستنو چنیندا بەکار دەهێنریّ: پێخەفەکەم لە لۆکە دروست کراوە. (پاش.): ٢- بۆ بچووککردنەوەی ناو بەکاردیّ، کاریلۆکە، ڕوالۆکە.؟

**لۆمە (ن.)** گازندە، گلی، گلەیی، سکالاّ: لۆمەکرن دەرازنیکا دەرییە.( پەندە) لۆمەم مەکەن.

**لا (ئاك.)** ١- رۆخ: لەلای رووبارەکە گەمییەکە ڕاوەستا.٢- نەسازو سەرسەخت: کابرایەکی لایە ناسازیّ. ٣- تویّ، ناو: لۆکەکەم خستۆتە لایەکەوە. ٤- بەشێك: لایەك لە لایەك زیاترە. ٥- کن، نك، جەم: منداڵەکەی لای منە. ٦- دوورەپەرێز، بیّ تەرەف: من لەو کارانەم لام. ٧- فەرمان بە دوورکەوتنەوە: تۆ سەری خۆت لا. ٨- خوار، خێچ: من دەڵێم سەرێکی ئەم دیوارە لایە. ٩- هاریکار، یاریدەر: لەم کێشەیە من لای تۆم.

**لات (ئان.)** ١- نەدارو هەژارو هیچ نەبوو: پیاوێکی لاتە. (ن.) ٢- بەردی پانو لووس، تات: (ئان.) ٣- ڕاکشاو، حاڵ پەرێشان: لەویّ لات کەوتبوو.

لاته (ن.) ١- باوه، ئەو خەتانەی کە لە زەوی کێڵدراودا چاك کراون بۆ چاندن: یەك لاتە ماوە ئاوی بگاتێ. ٢- پارچە زەوییەکی دیاریکراو: لاتە زەوییەکەی ئەوبەری کردۆتە شینایی.

لاپاڵ (ئاك.) ١- قەد پاڵی کێو: لەلاپاڵی کێوەکە خانوویان دروست کرد.٢- تەنیشت: لەلاپاڵم دانیشت.

لاپەڕ (ئان.) ١- تەریكو دوور، دوورە پەرێز: خانووەکەیان لاپەڕە. (ن.) ٢- لاپەڕە، دیوێکی کاغەز: هێشتا چەند لاپەڕەیەکم ماوە تەواوی کەم.٣- لایەکی کاغەز، لاپەڕ: لە چەند لاپەڕەیەك باسی ئەم بابەتەم کردووە.

لاجانك (ن.) نێوان روومەت و ئەستۆ: دەستی خستە لاجانگی و خەیالی ڕۆی.

لادێ (ن.د.) دێهات، گوند، دەشت: لادێکانی کوردستان ئاوەدان کرانەوە.

لاشە (ن.) تەرم، کەلەخ: سەربازەکان لاشەی کوژراوەکانیان جێ هێشت.

لافاو (ن.) لاخێز، زۆر بوونی ئاو هەستانی: بەهاران لافاو هەڵدەستێت.

لاکە (ن.) ١- جوولانەوەی لەدەست دەرچوو، بەملاو بەولادا چوون: ئێسترەکە لاکەی دەهات لەبرسان. ٢- لاشەی مردوو بیست لاکە لەوێ کەوتبوون.

لاکی (ن.) ١- کەلەش، کەلاك، لاشەی تۆپیو. ٢- کەپەكو جۆی لە ئاودا خوساو بۆ ئاژەڵو سەگ.

لاو (ن.) خۆرت، جحێڵ، گەنج، تۆلاز، کوڕ، فرزەند، نێر، زێبا، دەلال، خوێن گەرم، ڕواڵ، خۆشەویست: لاوان داینەمۆی داهێنانن لەنێو کۆمەڵگا.

لاواز (ئان.) ١- پێچەوانەی قەڵەو، دالگۆشت: منداڵەکەیان پێویستی بە ڕێنمایی دکتۆر بوو، چونکە زۆر لاواز بوو. ٢- سست: ئەم دەغڵە زۆر لاوازە.

لاوان (ن.) گەنج، کوڕ: سەنتەری لاوان هەیە. _ ۆ : بۆ بانگەوازە بۆ لاو: لاوۆ لەخەو ڕابە.

لاوچاك (ئان.) تۆلاز، گەنجی، گەنجی خۆشکۆك، ڕەند، جوان، شۆخ، شەنگ: بەڕاستی لاو چاکە.

لاوك (ن.) ستران، لاڤژە، لاڤجە، جۆرە سترانێکی کوردییە. لاوك بێژی باشمان هەن.

لاوێتی (ن.م.) گەنجێتی، گەنجایەتی: لاوێتی خۆشترین تەمەنی ژیانە.

لایەن (ن.) ١- نك، جەم، کن، تەرەف: لەلایەن کێوە هاتووە؟

لبەرە (ئاك.) نیازە. مەلبەرە سەردانێ هەوە بکەین.

لە (ئام.) ئامرازێکی پەیوەندییە لە تەك وشەی دی بۆ چەند واتایەك بە کاردێ: قەڵەمەکە لە گیرفانتدایە.

لە .. وە (ئام.) ئامرازی پەیوەندی: لە هەولێرەوە هاتووم بۆ لاتان.

لە ... دا (ئام.) ئامرازی پەیوەندی: منالآن لە باغچەکەدا یاری دەکەن.

لە - دا (ئام.) لە هەولێردا.

لەباتی (ئاك.) لەجیاتی، لەجێگە، لەشوێنی: لەباتی تۆ کارەکە دەکەم.

لەبار (ئان.) باش ، شیاو: ووتەکانی باش و لەبارن.

لەبەر ئەوە (ئا.) هۆی ئەوە، لەبەر هەندێ: زۆر دەخوێنێ لەبەر ئەوە زیرەکە.

لەبەرچاو (ن.ل.) ١- دیار، ئاشکرا: مندالّەکە لەبەرچاوم دیارە. ٢- لەبیرنەکراو: چاکەی تۆم لەبەر چاوە. لێپرسراو (ن.ب.) بەرپرس: لێپرسراوی بەشی ڕاگەیاندن لەکار لادرا.

لەبیرنەچوون (چ.) لەیاد نەکردن: چاکەی کەسم لەبیر نەچووە.

لەتەك (ئاك.) ١- لەگەڵ، دەگەڵ: لەتەك کاوە ڕاسپاردەکەم بۆ بنێرە. لەتەنیشت: لەتەك براکەم دانیشتم.

لە تەکیا (ئاك.) لە پاڵی، لە تەنیشتی، لە ڕۆخی، لە کەناری، لە لێواری، لە قەراغی: من لەتەك مامۆستا ئەرۆیشتم.

لەپ (ن.) چنگ، پەل، ناودەست: لەپی دەستی زامدارە.

لەپاش (ئاك.) ١- لە دوای: لەپاش هەموویان لە دایك بووم. ٢- لەپشتەوە: لەپاش ملە باسی خەڵك مەکەن.

لەپاشان (ئاك.) لە دوایدا، ئەوجا: سەیران هاتەوە لە پاشان خوێندی.

لەپەو روو (ئاك.) دەمەو روو: کابرا لەپەو روو بەربووەوە.

لەجیاتی ( ) لەبر، لە بریتی، لەباتی، لەجێی: هێمن لە جیاتی شوان کارەکانی منی ڕاپەڕاند.

لەدایکبوون (چ.) ١- مێینە کاتێك دەزێ: منداڵەکە بە ئازارەوە لەدایك بوو. ٢- دامەزراندن: لەدایکبوونی بەرەی کوردستانی مژدەبەخش بوو.

لەدەوروبەری (ئاك.) ١- لە کاتێ، لەسەردەمێك: لەدەوروبەری پەنجاکان باوبوو. شوێن: ماڵیان لەدەوروبەری ئەو گەڕەکەیە.

لەرزوتا ناوی نەخۆشییە: چارەسەری لەرزوتا ئاسانە.

لەرزین (چ.) ١- جوڵانەوەی گیاندار لەسەرما یا لەترسا: نەخۆشەکە دەلەرزی.٢- دوای بوومە لەرزە و بۆردومان : شارەکە هەمووی لەرزی.

لەڕووی (ئاك.) لەباری، لەبایەتی، لەناحیەی: کوردستان لەرووی ئاوەدانییەوە پێشکەوتووە.

لەسەرەخۆ (ئان.) هێور، هێمن، بەکاوەخۆ، نەخت، کەم کەمە، پیچ پیچە، تۆزە تۆزە، بەرە بەرە: کارەکانم لە سەرخۆ ئەنجام دا.

لەش (ن.) بەدەن، جەستە، قەلب: لەشم هەمووی ئازاری هەیە.

لەش (ن.) گیان، لاشە: لەشی ئەزیەت نادات._ قورس (ئان.) بێتوانا، لەش گران: لە لەش قورسی هەڵناستێ.

لەشکر (ن.) سوپا، هێز: پێشمەرگە لەشکری بەهێزی کوردستانە.

لەشکر شکێن (ن.) شەڕ کەرو جەنگاوەری ئازا، بەهێز، قارەمان: ئەحمەد پاشای گەورەی میرنشینی بابان لەشکر شکێن بوو.

لەگەڵ (ئام.) دە گەڵ، پێکەوە: ئارا لەگەڵ چرپە یاری دەکات.

لەگەڵ (ئام.) دگەڵ، با: لەگەڵ مامۆستاکان هاتم.

لەگەڵ (ئام.ل.) دگەل، ئەگەر: من لەگەڵ هاوڕێیەکانم دەچم بۆ قوتابخانە. — ئەمەش- ئەمەشدا- ئەوەش- ئەوەشدا: ئەگەر دوژمنانی کورد زۆرن، لەگەڵ ئەمەشدا خەباتو تێکۆشان بەردەوامە.

لەق (ئان.) ١- بن سست، شل، لەرزۆك، لەترکزە: پەیژەکە لەقە ئاگات لە خۆت بێ. (ن.) ٢- قەپ، گاز، حەپار: ٣- لك، لق.

لەقە (ن.) ١- شلاق، هاویشتنی پێ، لێدان: کە ڕێوییەکە لمۆزی خۆی بۆ بلند کرد لەقەیەکی لێداو دەمو ددانی شکاند. ٢- جووڵان، هاتنو چوون: توندم کردۆتەوە، لەقەی نایەت.

لەقەب (ن.) نازناو،جێ ناو، سەرناو، شۆرەت: لەقەبی شیعری فایەق - بێکەسە.

لەلە (ن.) کەسێك بۆ ئامۆژگاری و بەخێوکردن شدەزابێ: پێویستیان بە پیرێکە وەك ( لەلە ) بێ.

لەمەوبەر (ئاك.) لە پێشترە، لە کۆنەوە: ساڵێك لەمەوبەر کڕیم.

لەناو دوو تۆی (ئاك.) لە نێو دوو تۆی، لە نێوان، لە مابەین، لە بەین: لەناو دوو تۆی بەڵگەنامەکاندا باسی گەلی کورد کراوە.

لەناوبردن (چ.) نەهێشتن، توناکردن، تەفروتونا کردن: لەناوبردنی گەلی کورد کارێکی ئاسان نەبووە.

لەهەرسەرێکەوە (ئا.) ١- بەراوردکردن، ئەو بابەتەم بۆ لێکبدەوە.٢- بیرکردنەوە لە شت و ووردکردنەوەی لە دڵا: قسەکانی لێکدانەوەی دەویست.

لەو (ئام.) لە _ ئەو: لەوکاتەوە نەهاتووین.

لەو هاتن (چ.) لێی وەشاو، بۆوی باشە: حەیران گووتنەکە لەو دەهات.

لەوانەیە (ئاك.) ڕەنگە، بیری بۆ دەچێ، دوور نییە، شمانە دەکرێ: لەوانەیە زوو بگەڕێمەوە.

لەوەڕ (ن.) گیای ئاژەڵ، خواردنی ئاژەڵ: بۆ لەوەڕ مەڕوماڵات دەبرێتە کوێستانەکان لە هاویندا.

لەوەڕاندن (چ.) چـەراندنی ئـاژەڵ، دەرخـواردانی ئـاژەڵ: کۆچـەرییەکان بـۆ لەوەڕاندنی مەڕو ماڵاتەکانیان هەورازو نشێوی زۆر دەکەن.

لەوەڕگا (ن.) جێ لەوەڕ، شوێنێك کە گژوگیای باشی لێبێ بۆ ئاژەڵو مەڕو ماڵات: قەد پاڵی چیای هەلگورد لەوەڕگای باشی لێیە.

لەوحەلەوە (ئاك.) لە کاتەوە، لەو دەمەوە: لەو حەلەوە ئاوارەبوو.

لەوڕا (ئام.) بۆیـە، ژبـەر هنـدێ، ژبـەر وێ چـەندێ، ژبـەر وێ یـەکێ. ئـەز نەهاتم لەورا نەساخ بووم.

لەولاشەوە (ئاك.) لەلایەکی ترەوە: دەخوێنم و لەولاشەوە گوێ لەبەرنامە دەگرم.

لەوێوە (ئاك.) لەو شوێنەوە، لەوێندەرێ: لەوێوە بە سواری پایسکل هاتم.

لدویڤ (ئام.) بەپێی، بەگوێرەی، لپێی، لدوو. لدیڤ ئاخافتنی وی، کەس وێرێ نەمابوو.

لچ (ن.) لێو: لە بن لچ قسە مەکە.

لچ (ن.) لێوی خـوارەوە، ئەنـدامێکی لەشـی مرۆڤـە: لچی منداڵەکـە شـین هەلگەڕاوە.

لگەل (ئام.) لەگەڵ، پێکەوە، ب هەڤڕا. بلا لگەل تە بێت.

لق (ن.) ١- چلی درەخـت، کـەڵی دار، لـك: هێلانەکـە لەسـەر لقـی دارەکـە بوو.٢- قۆڵەی لەشکرەکە دەگاتـە سـێیەکی هێـز: لـق سـەرکردەی دەوێ.

لق و پۆپ (ن.) کـەل و پـەلکی دارو درەخـت: بەسـەر لـق و پـۆپی درەختەکـە کـەوت. لـق: مەلبەنـدەکی سیاسـیە. ئـەر ئەنـدام لقـە نـەك سەرکردایەتی.

لم (ن.) رەمل: لمی باغچەکەمان گۆڕی.

لمۆز (ن.) لـووت، لـووز، قـەپو لـۆز، لمبـۆز، کـەپو دەوی ئـاژەڵ: لەگـەڵ بەربوونەوەکەی ئێسترەکە لمووزی شکاوە.

لوتکە (ن.) قۆپك، سەرووی شاخو چیا، تۆپکە، ترۆپك، دوند: ئاگری نەورۆز لەسەر لوتکەی چیا هەڵدەکرێت.

لووابوون (چ.) ریچك كەوتن، بۆ رەخسان: هەلێكی باشی بۆ لووابوو.

لووت (ن.) كەپوو، لمۆز: لووتی بریندار بووە.

لوولە (ن.) ١- بۆڕی، هەموو شتێكی درێژی ناو بۆش لە هەندەسەكاری، لوولەك: لوولە شێوەیەكی ئەندازەییە. ٢- بێچووی ورچ و بەراز. ٣- خریلەی داو، بەكرە.

لێ بووردن (چ.) بەخشین، عافووكردن لە هەڵەو خەتا: جار جار پێویستمان بەلێ بووردن هەیە.

لێ تاڵ بوون (چ.) تام نەهێشتنی شتێك: منداڵەكە نانەكەی لێمان تاڵ كرد.

لێدان (چ.) ١- ئازاردان: نابێت لێدان لە قوتابخانەكاندا بمێنێ. ٢- ئاگاداركردنەوە، لە دەرگادان: بچیتە هەر ماڵێك پێویستە لە دەرگا بدەیت. ٣- بە ئاودادانی قوماش پێش بردنە لای بەرگدروو: قوماشەكەت لە ئاو داوە. ٤- گوشران‌و هاتنەوە یەكی دڵ، گرژ بوونی دڵ: كە ترسێك دات دەگرێ دڵ زیاتر لێدەدا. ٥- وەكار خستنی مۆسیقا، دەنگدانی مۆسیقا: حەزم لێیە ئاوازێكی خۆشمان بۆ لێدەی. ٦- چاككردن، دەقاڵبكردن: موحەممەد پاشای میرنشینی سۆران پارەی لێداوە. ٧- قازانج كردن لە مامەڵە: لەو بازاڕە ناهاوسەنگە باش لێی داوە. ٨- دزین، بەتاڵان بردن: كەی كاربەدەستەكە دەگۆڕن، دوای ئەوەی زۆری لێداو خواردی. ٩_ كەیف هاتن، خۆشی بینین، چێژ وەرگرتن: خواردنێكی چەوریان هەیە لێدە.١٠- هەڵاتن‌و خۆ بەدەستەوە نەدان: كە زانی خەتای ئەوە لێیدا ڕۆیشت.

لێدوان (چ.) ئاخافتن دەربارەی ، وتووێژ: لە لێدوانەكە زمانی پاراوبوو.

لێدوان (چ.) ئاخافتن دەربارەی شتێك: لێدوانەكانی ڕاگەیاندن ترسناكە.

لێزمە (ن.) خوڕەباران، ڕێژنە، بارانێكی قایم‌و توند: باران بە لێزمە دەبارێت.

لێشاو (ئان.) لافاو، شەپۆل، هێرش: دوژمن بە لێشاو هێرشیان هێنا.

لێگرتن (چ.) ١- بەهەندهەلگرتن، عەیب دەرخستن: نابێ لە هاوڕێمان بگرین.٢- هەڵبژاردن: رستە باشەکانی لێگرتن. لێبگرە بەدڵی خۆت.

لێکۆڵینەوە (چ.) توێژینەوە: لێکۆڵینەوەی زانستی خوێنەری زۆرە.

لێکدانەوە (چ.) بەراوردکردن: لێکدانەوەی هۆنراوەکە بەسوود بوو.

لێکچوون (چ.) ١- وەك یەك بوون، بەیەکچوون، لە یەککردن، هاوشێوە بوون: هەردووکیان لە زیرەکی لەیەك دەچن. ٢- لێکترازان، لێك دوور کەوتنەوە: بڕبڕەکانی پشتی لەیەکچوونە، پێویستی بە چارەسەرییەکی ورد هەیە.

لیمۆ (ن.) ١- میوەیەکی زەردە وەکو نارنجو پرتەقاڵ: لیمۆ میوەیەکی بەتامە. ٢- ناوی ژنانە: لیمۆ ژنێکی شۆخو شەنگە.

لێهاتن (چ.) ١- شیاوو گونجاوی: کەسێکی لێهاتوو بدۆزنەوە تاوەکو ئەو پۆستەی بدەینێ. ٢- نەخۆشییەك یان نیشانەیەك لە مرۆڤ دەردەکەوێ: ئازاد بالووکەی لێهاتوون. ٣- بارین، باران هاتنە خوار: دوێنێ بارانێکی باشو بەخوڕی لێهات.

لێو (ن.) ١- لچ. ٢- کەنار، رۆخ، قەراغ، دەم: ئەندامێکی لەشی مرۆڤە: لێوی منداڵەکە ئیشك بۆتەوە

# م

**مات (ئان.)** کز ، خەمگین : پیرەکە زۆر بە ماتی دانیشتووە._ەمینی (ن.) . غــەم بــۆ مــردن ، نازیــە بــۆ مــردوو: لەماتــەمینی یەکــە بەشداریمان کرد. خـۆی _ کـرد (چ.) بـێ دەنـگ و بـێ جوولـە: مارەکە خۆی مات کردبوو.

**مار ( ن.)** جۆرە خشۆکێکی و زەهرداره: مار هێلکەکەرە.

**مازوو (ن.)** بـەری دارێکـی لێرپیـە، مـازگ. مـازی لـە پیشەسازییدا بـەکار دەهێنرێت.

**ماف (ن.)** بەش، پشك، حـەق: نابێت مـافی کـەس بخورێت. — پـەروەر: شادانی هـاوڕێم مافپـەروەرە. — نـاس: شـێرکۆ مافناسـێکی بـە توانایە. — خوراو: گەلی ماف خوراو داوای مافی خۆی دەکات.

**ماف (ن.)** هەق، حەق، بەش: واز نـاهێنینو دەسـتبەرداری خـەبات نـابین تا مافمان وەرنەگرین.

**مافوور (ن.)** رایەخ: کارگەی مافوور چنین لە هەولێرە.

**مافی خۆڕێبەرایەتی (ن)** خۆیــان ڕابەرایــەتی خۆیــان بکــەن: گــەلی کــورد خۆیــان سەرکردایەتی و ڕابەرایەتی خۆیان دەکەن.

**ماقووڵ (ئان.)** پەسـەند، بـاوەڕ پێکـراو، رێـزدار، بـەرێز: پیـاو مـاقولانی شـار کۆبوونەوە.

**ماك (ن.)** ١- پەڵە: شوێنی مانەوەی هەندێ نەخۆشی زیاتر لەسەر پێست دەردەکـەوێت. ٢- بناغــەو سەرچـاوە ریشــەی شــت. ٣- جـۆرە هەنگێکە کە پوورە دەدات

**ماڵ (ن.)** ١- شـوێنی حەوانـەی خێـزان: ماڵمـان لەگـەڕەکی مامۆسـتایانە.

٢- شتو مەكی تایبەتی كەسێك: ئەم زەوییە ماڵی كەس نییە هی خۆمە. ٣- دەوڵەمەندیو پارەو دارایی: پەكی ناكەوێ ماڵێكی زۆری هەیە. ٤- كەلوپەل: ئەو بازرگانەی پێش نیوەڕۆ گەیشتە جێ ماڵێكی زۆری هەیە.

| | |
|---|---|
| ماڵ (ن.) | خانوی، خانی، خانوو، دراڤ، سامان، خێزان، فامیل: مالا درەوینی خراپ بوو كەسێ باوەر ژێ نەكر (پەندە) . بماڵ (ن.) خاوەن ماڵ .. هتد. بێ ماڵ (ن.) بێ ماڵ .. هتد. |
| ماڵ ئاوایی كردن (چ.) | خواحافیزی، بەجێ هێشتن: مێوانەكە ماڵ ئاوایی كرد. |
| ماڵات (ن.) | ئاژەڵ، وڵسات، حەیواناتی ڕاگرتن، مەڕو بزن: بۆ بەخێوكردنی مەڕو ماڵاتەكەیان بەهاران بەرەو كوێستان هەڵدەكشێن. |
| ماڵین (چ.) | ڕادان، لابردن، فرێدان، ماشتن: بەفر بە بەفرماڵ دەماڵدرێ. |
| مام (ن.) | ١- برای باوك، ئاپ، ئاپۆ. ٢- وشەی ڕێزەو لەپێناوی ئەو كەسانەوە دادەنرێ بۆ بانگكردنو ناو هێنان. |
| مام ناوەنجی (ئا.ن.) | مام ناوەندی: برا مام ناوەنجییەكەم ئەندازیارە. |
| مامۆستا (ن.ل.) | ئەو كەسەی كە خوێندنو زانست فێری كەسانی دیكە بكات: مامۆستاكەمان لێهاتووە. — یەتی: مامۆستایەتی كارێكی پیرۆزە. |
| مان (چ.) | ١- لە بەین نەچوون، نەچوون، مانەوە: هەموویان چوون تەنها من مام. (ن.) ٢- هەیڤ، مانگ. |
| مان (چ.) | ١- مانگ، هەیڤ، ما: ئەڵێی مانی تابانە. ٢- نەمردن، لەژیان بوون: مان بە دیلی شەرمەزارییە. ٣- نەچوون: خزمان لێرە مان. ٤- لەبەین نەچوون: هەر مان لەگەڵ ئەم هەموو ئازارە. ٥- پاشگر بە واتای ( ئێمە ): خوێندنمان تەواو كرد. ٦- چاووگی (مان ): مان ئامانجی هەلپەرستانە. ٧- مانگرتن: مانگرتن شێوازێكی نوێی خەباتە. ٨- خانو مان: كەژاڵ ئافرەتێكی خانو مانە. ٩- ناوی كوڕانو كچانە: مان هونەرمەندێكی بە توانایە. |

مان (چ.) ١- نەمردن، لەژیان دابوون: یان کوردستان یان نەمان.٢- تەواو نەبوونی هەر شتێ: ڕستەم پێ نەما.٣- راناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی کۆ.

مان (چ.) مانەوە، نەچوون. لەنێوان مان و نەمان دابوو.

مانا ( ئاک.) واتا، مەبەست، ڕاڤە، لێکدانەوە: مانای وشەکەی دەزانێت.

مانا (ن.) واتا: مانا تەواوەکەی بنووسە.

مانە (ن.) ١- هەمبانە، هەنبانە، پێستی گورێندراوی مەڕو بزن کە دەکرێتە کیسەی شت تێکردن. ٢- مانا، واتا. ٣- بەهانەو پەڵپ: خۆی نایەوێ کارەکە تەواو بکاو بۆیە مانەی پێوە دەگرێ.

مانەوە (چ.) نەڕۆیشتن‌و جێگیر بوون لە شوێنێ، گیر بوون: لە دوا سەردانم بۆ ماڵی باپیرم یەك هەفتە مامەوە.

ماندوو (ن.) شەکەت بوو: مامۆستاکانمان بە ئێمەوە ماندوون. — بوون (چ.) شەکەت بوون، هیلاك بوون: بێ ئەوەی هەست بە ماندوو بکەن شەو و ڕۆژ کاردەکەن.

مانگ (ن.) ١- بریتییە لە سی رۆژ و مانگی نەورۆز بەهارە.٢- مانگ لە ئاسمان، هەیڤ: مانگ خەرمانەی داوە. _ انە ( ) ١- هەموو مانگێ: مانگانە کۆبوونەوە دەکەین.٢- مووچەی سەرەمانگ : پەککەوتە مانگانە یان هەیە.

مانگانە (ن.ژ.) ١- نرخی شتێ هەر ٣٠ ڕۆژ بە جارێك: مووچەی مانگانەی مامۆستایان کەمە. ٢- گۆڤارێك مانگێ جارێك دەردەچێ: گۆڤاری گەلاوێژ، مانگانە بوو.

ماوە (ئاک.) ١- کات، پێش ئێستا، رادەیەك لە کات: ئەو ماوەیە بە چ خەریك بووی؟ (ن.) ٢- بەین، نێوان، دووری دوو شت: ماوەی هەولێرو کەرکوك چەندە؟ ٣- ئەوەی لە دابەشکردن‌و کەمکردنەوەی بیرکاریدا دەبیندرێ: لە دابەشکردن بەسەر سێدا دوو ماوە بە یەك ئەژمارد دەکرێ.

ماوەدان (چ.) بواردان، ڕێگا پێدان: دوژمن ماوە نادات بحەسێینەوە.

ماوەیەك ( ئاك.) كاتێك، دەمێك، ساتێك، تافێك: ماوەیەكە سەفەرم نەكردووە.

مایە (ن.) ١- هۆ، هۆكار: نەخوێندەواری مایەی نەخۆشییە.٢- نەفەوتاو، ماوە: رەوشتی خراپە هەر ماوە.٣- دراو، پوول: مایەدار بازرگانە._ سەر _ (ن.) خاوەن پارەی زۆر: كوردستان سەرمایەداری زۆرە._ پووچ (ئان.) كەسێ یێ مایە و ئەنجام دەربچێ: لە هەوڵەكەی مایە پووچ بوو.

مە (پگ.) ١- بۆ نەرێ و نەفی كردن: بكە دەبێتە مەكە. ٢- ئێمە پیاوانی مە پیاوی رۆژی تەنگانەن.

مە (ج.) ئێمە، كوردستانێ مەیە.

مەبەس (ن.) مەبەست، واتا و مانا : مەبەس لەم كارە زۆرە چییە؟

مەبەست (ن.) ١- نیاز: خۆزگە مەبەستەكانم دەهێنایە دی. ٢- ناوی كورانە: مەبەست منداڵێكی ژیكەڵەیە.

مەبەست (ن.) واتا، نیاز لە قسە وكار: پێشخستنی میللەتمان مەبەست بووە.

مەجازی (ن.) بەرانبەر راستی و راستی: مانا مەجازییەكەی جیاییە؟

مەجلیس (ن.) شوێنی دانیشتن، كۆمەڵێ دانیشتوو: میری مەجلیس هات.

مەحوی (ن.) شاعیری گەورەی كوردە.

مەدرەسە (ن.) قوتابخانە، حوجرە.

مەڕ (ن.) پەز، مە: مام بایز خاوەنی ١٠٠ سەر مەرە.

مەرج (ن.) گرۆ، بەڵێن، گفت، پەیمان: بۆ وەرگرتن چەند مەرجێكیان داناوە.

مەرد (ئان.) ١- ئازا لە شەڕ: شێخ سەعیدی پیران پیاوێكی مەرد بوو. ٢- خاوەن پیاوەتی: مەردی حەمە ئاغای كۆیە لە مێژوودا باس دەكرێ.

مەرد (ن.) ١- پیاوی ئازا لەشەڕ: پیاوی مەرد بۆ شەڕ باشە.٢- خاوەن پیاوەتی: مرۆڤی مەرد زۆرە._ ایەتی (ن.و.) پیاوەتی و ئازایەتی رەوشتی باش: كورد وێنەی مەردایەتی ی زۆرە.

مەردانە (ئان.) ئازایانە، بە مەردی: كاری مەردانە هەر لە خۆمان دێ.

مەردوم (ن.) خەڵك، خزم، خۆیش: مەردومی زۆرم هەیە.

مەرگ (ن.) مردن: بەمەرگی کەس شاد مەبە. سەرە _ (ن.) کاتی مـردن و گیان سپاردن: لەسەرەمەرگا وەسیەتی دەکرد.

مەرگە (ن.) ناوچەیەکە لە کوردستان.

مەرگەیی (ئان.) خەڵکی ناوچەی مەرگە.

مەریوان (ن.) شارێکە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

مەزن (ئان.) گەورە: ڕێـزی مرۆڤـی مـەزن بگـرن. — ایـەتی: مەزنایـەتی لـە هـەموو کـەس نایـەت. — دە: گریمانـە: بـە مەزنـدەی مـن کوردستان پێشدەکەوێت. ی: — مەزنی گوندی خۆشەویستە.

مەسەلە (ن.) بابەت، مەسەل و ڕووداو: مەسەلەی زۆرداری چارەبکەن.

مەستی (ن.و.) ١- سەرخۆشـی، سـەرگەرم، خومـاری: چـیمەن مەسـتی بـادەی عیشقە. ٢- بەسە مەست بووم بە درۆیەکانت.

مەشخەڵ (ن.) خەتیرە، دەسکە چیلە، مەشخەڵ: مەشخەڵی زانستمان هەڵگرت.

مەعنەوی (ن.) واتایی: یارمەتیدانی مەعنەوی گرنگە.

مەغز (ن.) ١- کاکڵ. ٢- مژی، مێشك: مرۆڤ لە مەغزەوە فرمانی بۆ دێت.

مەغزا ( ن.) مانـا، واتـا، دەلالـەت، بۆچـوون، نیـاز: مـەغزای قسـە کـردنم کارکردنە.

مەقام (ن.) جۆرە گۆرانی ، ستران: هۆنراوەکەی بە مەقام گووت.

مەکینە (ن.) ١- ئامێر، ئامراز، جوولێنـەر: مەکینەکـەی گۆڕیـوە، ٢- ئـامێری جل دروون.

مەل (ن.) باڵنـدە، تـەیر، پەلـەوەر، پەرەنـدە: مەلـەکان پـۆل پـۆل بـە ئاسماندا دەفرن.

مەلا (ن.) ١- سـەرۆك، یەکـەم پیـت، بـەرە، لـە هەنـدێك گەمـەدا وەك ماتـانێ و کێـل کێلانـە: -کێ مەلایـە؟ -مـن. مـن مـەلام خستە خـوارەوە. ٢- زانـای ئـایینی ئیسـلام، عـالم: پێشـتر مەلایـەکی چاکیان هەبوو.

مەڵبەند (ن.) ناوچە، شوێن: سلێمانی مەڵبەندی شێرانە.

مەم (ن.) ئەویـنداری بەناوبانگی زیـن، سـووکە نـاوی محمـەدە: مـەم وەك مۆم دەسووتا.

**متمانه (ن.)** سقه، باوەڕ: مرۆڤی ژیر متمانه بـه ئاسانی بـه هـەموو کەسـێ ناکات.

**مەمەند (ئان.)** ١- لەسەر خۆ، هێمن. (ن.) ٢- ناوە بۆ پیاوان.

**مەند (ئان.)** ١- خـاوەن، کـه دەچـێته سـەر چـەند وشـەیەك: ئـازاد کـوڕێکی بەهرەمەندە. ٢- مەنگ، پەنگ خواردوو، ئاوی ڕاوەستاوی بـێ جووله یـان سست ڕۆیشتن: ڕووبـارێکی بـه خـوڕ نییـه، بـەڵکو مەندە. ٣- سەنگینو لەسەرخۆ. پیاوێکی مەند.

**مەه (ن.)** ماه، هەیف، مانگ: یێ خۆ ل سالێ گـرت دێ خـۆ ل مـەهێ ژی گریت ( پەندە). ماهی سەرچاوەی حەیاتم کەوتـه بەنـدو داوی شەسـت .. پشـتی دەسـتی خـۆم لـه حـەیوانیو لـه بـێ عـاری نەگەست. (حاجی قادری کۆیی)

**مەودا (ن.)** ١- ماوەی نێوان دوو شت: مـەودای دوو شـارەکه دوورە.٢- مـاوە، مۆڵـەت: مـەودامان مـاوە بـۆ نووسـین.٣- نـووکی خەنجـەر و شمشێر: مەودای وەك خەنجەر تیژە.

**مەولەوی (ن.)** شاعیری کوردی ( مەلا عبـدالرەحیم تـاوەگۆزی) لـه هـەورەمان ژیاوە: مەولەوی شاعیرێکی ناودارە.

**مەی (ن.)** دۆشـاوی، گـەنیوی جـۆ، خواردنـەوە. ئـەو نـاتوانێ واز لەمـەی بێنێ.

**مەی (ن.)** شەراب، بادە: مەی حەرامه بـۆ سـەهەندەو بـێ غـەمان. مـەرام (ن.) ڕاز، مەبەستی دڵ: چەندی وت له مەرامی تێنەگەیشتم.

**مەیاندن (چ.)** خەسـتکردن، پـەیتکردن، چـڕکردن. ئـەم هـەویرە پێویسـتی بەمەیاندنە.

**مەیدان (ئاك.)** ١- گۆڕەپان، جێی شەڕو ململانێ: له جـەنگی جیهـانی دووەمـدا چەندەها وڵات بوونە مەیدانی جـەنگ. ٢- بـوار، بیـاڤ، لایـەن: لــە زۆر مەیــدانی ڕۆشــنبیریو هونــەریو ڕۆژنامەنووســیدا بەهرەوەر بوو.

**مەیل (ن.)** ئارەزوو ، تاسه، خۆشەویستی: منداڵ مەیلی دایکیەتی.__ کردن (چ.) ئارەزوو کردن : مەیلی رشانەوە دەکات.

مەیموون (ن.) ناوی گیانداره: مەیموون لاسایی مرۆڤ دەكاتەوە.

مەینـــەت (ئـــان.) ناخۆشـــی، دەرد، كێشـــە، ئاریشـــە، گرفـــت: مەینەتەكانمان زۆرن.

مەیین (چ.) توند بوونەوە، خەست بوونەوە، پەیت بوونەوە، رەق بوونەوە: خوێن لە دەرەوەی لاشە خۆی ناگرێو زوو دەمەیێت.

مخابن ( ) حەیف، تەحەم، داخەكەم: مخابن نەماڵی ما نە سەر.

مژویل (ئان.) پریش، خەریك. ئەو گەلەك مژویلە.

مژین (چ.) ١- مـژتن: مـژینی دووكـەڵی جگـەرە زیانبەخشـە. ٢- قووتـدانی تەرایی: زەوی یەكە ئاوەكەی مژی.

مرۆڤ (ن.) ئـادەمیزاد، بـەنی ئـادەم، مـرۆ: پێویسـتە مـرۆڤ لـە خـەمی نیشتمانی خۆیدا بێت. — ایەتی: یارمەتی دانی یەكتر كارێكی مرۆڤایەتییە.

مرۆڤایەتی (ن.و.) پیاوەتی، مرۆڤایەتی: خوێن بەخشین ئەركێكی مرۆڤایەتییە.

مره (ن.) نەخۆشییەكە تووشی هەنگ دەبێت. شانەكەیان تووشی مـرە بووە.

مرخ (ن.) ١- خەیاڵی چاو تێبڕین، نیاز، حـەز: دەمێكە دوژمنـان مرخیـان لە خێرو بێری وڵات خۆش كردووە. ٢- دەنگی نووستو، پرخە.

مردار (ئان.) حەیوانی گیان دەرچووی بـێ سـەربڕین، پـیس، حـەرام: مـردار بوونەوەی بە كۆمەڵی باڵندە رەنگبێ نەخۆشی تایبەت بێ.

مردن (چ.) پێچـەوانەی ژیـان، گیـان دەرچـوون، نـەمان، مـرن: مـردن ئـەو رێیەیە كە هەمووومان دەیبینین.

مردن (چ.) گیان دەرچوون: مردنی گۆران كۆستێكی گەورە بوو.

مردن (چ.) مرن، گیان لە دەست دان: مەژی بۆ مردن، بمرە بۆ ژیان.

مرن (چ.) مردن، گیان لە دەستدان. دهی ئەو مر.

مرواری (ن.) مراری، بەنرخی ناو ئاوە: ملوانكەی مرواری بەنرخە.

مرید (ن.) دەروێش، پیر، سۆفی، تۆبەكار، تۆبەدار: شـێخ سـەعیدی پـیران مریدی زۆر بوون.

مریشك (ن.) مامر: ئەمساڵ مریشك زیندەبەچاڵ كران.

مزگەوت (ن.) مزگەفت، مزگە، ماڵی خوا، جێگای نوێژ لێكردن: زۆربەی شاعیرەكانمان لە مزگەوت خوێندوویانە.

مزگێن (ن.) مژدە، مژدانە: مزگێنی خۆش دڵ خۆش دەكات.

مشە (ئاك.) زۆر، گەلەك، زاف، تژی، پڕ. كچ مشەنە.

مشوور خواردن (چ.) خەم لێ خواردن، لەخەمێ بوون: مشوورخواردن بۆ ماڵ و منداڵ پێویستە.

مفا (ن.) سوود، قازانج، كەلك. ئەڤ ڤەكۆلین ب مفایە.

مل (ن.) ستۆ: ملت زۆر نەوی كەی تووشی مل یەشە دەبی.

مل (ن.) شان: بێهنا زارۆكی ل بەرملێ دایكێ پتر ژ هەمی كەسەكی دهێت. ملیان پەراند.

مل بمل (ئاك.) شان بەشان، دگەلێك، لەگەل یەكدا، بەتەنیشت.

ملیۆنێر (ن.ب.) خاوەن ملیۆن پارە: مەرج نییە ملیۆنلێر قەڵەوبێ.

من (ج.س.) ١- ئەز، خۆم: من بووم لە دەرگام دا. ٢- لە ڕێزماندا جێناوی كەسی یەكەمی تاكە.

من (ج.ك.) ئەز: من وشەی فەرهەنگیی دەنووسم.

منارە (ن.) ١- گومبەت، گومەز: منارەی مزگەوتەكە تەواو بوو. ٢- ناوی گەرەكێكە لە ناو هەولێر.

مناڵ (ن.) زارۆك، بچیك، منداڵ: مناڵی كورد لە زۆر خۆشیەكانی ژیان بێ بەشە.

منداڵ (ن.) فرزەند، ڕۆڵە، زارۆك: منداڵەكانم نواند.

مننەت (ن.) سپاس، منە: چاكە منەتی تێدا نییە. بێ - (ن.) ١- دڵنیا: كالآیەكە زۆر باشە بێ منەت بە.٢- بێ سوپاس كردن: پێویستی بە كەس نیە بێ منەتە.

مۆخ (ن.) مژی، ئەوەی دەناو ئێسكو مێشك دایە.

**مۆزەخانە (ن.)** مۆزە، شوێنی هەڵگرتن و پاراستن و پێشانگای شتی بەنرخ: مۆزەخانەی کۆن لە هەولێر هەیە.

**مۆسیقا (ن.)** ١- مۆزیقا، شەیپوور، ئەو ئامێرەی کە ئاوازی پێ لێدەدرێ: زۆر حەزم دەکرد فێری مۆسیقا ببم. ٢- دەنگو ئاوازی گۆرانی: مۆسیقایەکی خۆشیان بۆ گۆرانییەکەت داناوە.

**مۆڵ (ن.)** ١- لێك کۆبوونەوەی گاو گۆڵ لە شوێنێك: ٢- پشوودان، حەسانەوە: لە بەیانییەوە مۆڵی نەکردۆتەوە. — خواردن (چ.) ڕاکشان لەسەر زەوی، لێك خربوونەوە.

**موتریب (ن.ب.)** جۆرە گۆرانی بێژە: موتریبەکە دەنگی خۆشە.

**موحاکەمە (ن.)** دادگایی کردن: موحاکەمەی سەدام لە ئارادایە.

**موژدە (ن.)** مزگێنی، مژدە، هەواڵی خۆش: خۆم مژدەی دەرچوونەکەیم بۆ برد.

**موسەك (ن.)** ناوی گوندێکە لە کوردستان.

**موسڵمان (ن.)** کەسێك باوەڕی تەواوی بە بنەماڵەکانی ئیسلام هەبێت: زۆرینەی کورد موسڵمانە.

**موکر (ئان.)** نەترس، وێردراو: موکریان لە موکرەوە هاتووە.

**موکریان (ن.)** ناوچەیەکە لە کوردستان : هێمن موکریانی شاعیرە.

**موڵك (ن.)** خاوندیتی لە خانوویەرە و هەر شتێ: دەسکەوتی ڕاپەڕین موڵکی هەمووانە.

**موناقەشەکردن (چ.)** گفت و گۆ کردن، لێدوان: کەڵك لە موناقەشەکردن وەربگرە.

**موو (ن.)** ١- تووك، ئەو تاڵانەی سەر لەپێست دەردەچن: هێشتا مووی سپی نەکەوتۆتە سەری. ٢- برینێکە لە شێوەی زیبکە لە پێست دەردەچێو زۆر بە ئازارەو کوشندەیە بە کێماوەوە واڵا دەبێتەوە: ڕەبی مووی لیێبێ زمانی پەنجەکانی هەڵوەرێ هەر کەسێ گوڵشەن بەدەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ.٣- خوری مەڕو بزن، کە بۆ ڕستنو چنین بەکار دەهێنرێ.

**موو (ن.)** ١- پرچی سەر: مووی سەری هەڵوەریوە.٢- تووکی ئاژەڵ: موو دەکرێتە گوریس.

**مووبەق (ن.)** شوێنی چێشت خواردن ئامادە کردن، نانـدین: مووبـەق گـەورە بێ باشە.

**مووتاوی (ن.و.)** مووتابچـێتی، دروسـتکردنی خـەراو: بەرهـەمی مووتـاوی لـە کوردستان زۆرە.

**مێخەك (ن.)** بـەری درەختێکـی گەرمیانییـە بـۆنی خۆشـە: بـۆنی مێخـەك ژوورەکـەی بـۆن خـۆش کـردووە. — بەنـد: کچـەکە مێخـەك بەندی لە ملە. مێخەك: گرێ، قونێری وشـك، مێخـەکی لـە پـێ هاتووە.

**مێژوو (ن.)** تۆمـاری ڕابـردوو، ئـەوەی پـێش ئێسـتا، زانسـتێکە لـە زانسـتە کۆمەڵاتییەکان: زۆر کەس مێژووی ژیانی خۆی تۆمار دەکا.

**مێر (ن.)** پیاو، مێرد، خاوەن ژن.(ئان.) پیاو، مەرد. شاسوار مێرێ منە.

**مێر (ن.)** پیاوی ئـازا: سـیروان مێرێکـی هەڵکـەوتووە. — انـە: سـەخاوەت پیشەی مێرانە. — انی: مێرانی لە هەموو کـەس نایـەت. مێـر، مێرد: ئەو مێری منە.

**میرات (ن.)** کەلەپوور، پاشماوە: کەلەپوور و میراتی کورد دزراوە.

**میراتگر (ن.ل.)** ئەو کەسەی میرات وەردەگرێت: کورد میراتگری مادەکانن. ئـەو میراتگری باوکێتی.

**میراودەلی (ن.)** ناوی هۆزو گوندێکی کوردستانە.

**میرەدێ (ن.)** ١- گونـدێك کـە مـیری تێـدا بـژی. ٢- نـاوی گوندێکـە لـە کوردستان.

**مێرد (ئان.)** ١- پیاوی ئازا، زەلام: بۆیـە نەدەترسـان، چـونکە مێردبـوون. ٢- (ن.) شوو، پیاوی ژن، هاوسەری ژن: نەسـرین مێردێکـی چـاکی هەیە.

**مێرد کردن (چ.)** کچ بە شوودان: پێشان بەزۆر کچیان بە مێرد دەدا.

**میرزا (ن.)** کاتب، خوێندەوار: میرزا هات.

**مێروو (ن.)** گیانلەبەرێکی وردە: مێروو بۆ ژیان کۆشش دەکات. — لە: مێرووچە: مێروولەی باڵدار لە بەهاران پەیدا دەبن. — ستان: شوێن‌و مەنزلگای مێروو، هێلانەی مێروو، شارە مێروو: تێکدانی مێرووستان باش نییە.

**میری (ن.)** کاروباری دەوڵەتی، دەوڵەت، رژێم، حوکم، فەرمانڕەوا: میری هەوڵی داوە هۆزە کۆچەرییە بێ ناسنامەکان نیشتەجێ بکات. بەسە بەر دەرگای میری سەدەی بیستەمە تاکەی ئەسیری — هیوا.

**میزاج (ن.)** باری دەرونی، ناخی مرۆڤ: میزاجی خوێندنی نەماوە.

**مێشك (ن.)** شتێکی سپی و چەورە لەناو کاسەی سەردایە: مێشك سەرچاوەی بیرکردنەوەیە. _ تێك چوون (چ.) شێت، عەقل لەدەست دان: زەحمەتی ژیان مێشکی تێك دا .

**مێشك (ن.)** مەژی: ئەو بەشە چەورەیە کە لە ناو کاسەی سەری مرۆڤو گیانلەبەراندایە: توانای مێشکی مرۆڤ زۆرە. — خۆر: ئەژدەهاکی زووحاك مێشك خۆر بوو.

**میچ (ن.)** بن بان: وێنەکە لە بن میچەکە هەڵواسە.

**مێگەل (ن.)** کۆمەڵێ ئاژەڵ و مەڕ: مێگەلی بلاَوی کۆ کردەوە.

**مێلاق (ن.)** ئاونگی ترێیە کە بۆ زستانان هەڵبگیرێ‌و پەروەردە بکرێ.

**مێلاقە (ن.)** گوڵێکی سوورو کێوییە لە خاشخاش گەورەترو خۆڕاگرترە: گوڵە مێلاقە لە بەهاراندا سەر دەردەکا.

**میللەت (ن.)** گەل: میللەت هەموو دەنگیان هەیە.

**میللەت (ن.)** گەل، نەتەوە: میللەتی کورد ئازاو نەبەردە. — پەروەر: مرۆڤ دەبێت میللەت پەروەر بێت.

**میللەت (ن.)** نەتەوە، گەل: میللەتی کورد بەشێك لە هیواکانی هاتە دی.

**میللی (ن.)** هەرچی پەیوەندی بە گەل و میللەت هەیە: شیعری میللی خۆشە.

**مینا (ئام.)** وەکو، وەکی، هەروەك، بۆنموونە: سەرێ باپیری مینا بەفرێ یێ سپی بووی.

میهر (ن.) سۆز، دڵنەرم: میهری سیامەند بۆ خەج زۆر بوو.
میهرەبان (ن.ب.) خاوەن سۆز بەزەیی: خوا گەورەو میهرەبانە.

میوان (ن.) میڤان، مەیمان، ئەو کەسەی بەسەردان دەچێتە شوێنێکی دی، ئەوەی لە ماڵی کەسێکی دی دەنویٚ: ئەو ماڵەی تەنیشتمان زۆر بە میوانن.

میوانداری (ن.) بانگکردنی خەڵك بۆ نانخواردن، کاری چوونە ماڵی یەکێکی دی بە مێوان، راگرتنی مێوان.

میوە (ن.) تەڕە، فێقی: میوەی کوردستان خۆشە.

مێوە (ن.) میوە،تـەڕە: خـواردنی مێـوە بـۆ مـرۆڤ بەسـوودە. — جـات: میوەجـات: کوردسـتان میوەجـاتی زۆرە. — فـرۆش: مێـوە فرۆشەکە مێوەی تازەی هێناوە.

میوەدار (ن.د.) بەری دارو بێستان: ئەمە درەختێکی میوەدارە.

مێوەهات (ن.) مێـوەی جـۆراو جـۆر: مێوەهـاتێکی چـاك لـەو گونـدەی بەرامبەرمان هەیە.

# ن

**نا (ئام.)** بۆ نەرێ بەکاردێت دەچێتە سەر کاری ناتەواو بۆ کاتی ئێستا: نانووسم.

**نائومێد (ئان.)** بێ هیوا، بێ ئومێد: لە کارەکە نائومێد بووم.

**نابەدڵ (ئان.)** پێچەوانەی دڵخواز، شتێ کە پەسند نەکرێو بەردڵ نەکەوێ: کچ بە نابەدڵی شوو بکات کۆتاییەکەی خراپە.

**نابووت (ئان.)** لاواز، نارێك: پیاوێکی نابووتم دیت.

**ناپاك (ئان.)** ١- چڵکن، پیس و پاك نەبێ، خایەن: خۆی ناپاك رادەگرێ. ٢- بەد فەڕو خراپ: ناپاکەو جێی متمانە نییە.

**ناخۆش (ئان.)** نارێك: رێگای گوندەکەناخۆشە. — ی: ناکۆکی، کێشە، نەخۆشی، گیرو گرفت، سەر ئێشە، دوو بەرەکی: ناخۆشی نێوان هۆزەکان چارەسەر کرا.

**ناخۆشی (ن.)** ١- تەڕو تووشی کەشو هەوا: ناخۆشی ئاو و هەوا کارەکەی ڕاگرتین. ٢- بێ تامی خواردن: ناخۆشی چێشتەکەیان لەوەدابوو کە باش نەکولابوو. ٣- نا تەبایی: ناخۆشی نێوانیان زیادی کردووە.

**نادانین (چ.)** نەزانین، نەفامی: نەدانین نەخۆشی یە.

**نارەزا (ئان.)** کەسێ کە شتێ قبول نەکا. ئەو نارەزایە بەسە.

**نارەزایی (ن.)** تووڕەیی، قەڵسی، ڕازی نەبوون لە شتێك: مامۆستاکە نارەزایی خۆی دەربڕی بەرامبەر بە قوتابییەکە.

ناز (ن.) عیشوە: کچە جوانەکە ناز دەکات. بە - (ئان.) بە عیشوەو خۆشەویست: منداڵەکەی بەناز گەورە کرد. - دار (ئان.) ١- بەناز و نازدار: منداڵ بە نازو نازداری فێر مەکەن.٢- ناوە بۆ کچ: ناز نوێنەری ئافرەتانە.

نازك (ئان.) ناسك،تەنك، باریك: گوڵە نازکەکە ئاو بدەن.

ناسراو (ن.) بەناوبانگ، کەسێك کە لەلای خەڵك بناسرێ: لە گوندەکە بە سەخاوەت ناسراون.

ناسك (ئان.) تەنك، نەرم: ئەمساڵ رێواسێکی ناسك هەبوو.

ناسین (چ.) ناس کردن: کاوەم لە قوتابخانە ناسی.

ناشتن (چ.) ١- چەقاندنی دار: نەمامەکەی بۆ پەرژین ناشت.٢- مردوو تە مراندن: پیاوە چاکەکەیان ناشت.

ناشتن(چ.) لەگۆڕ نان، ڕواندن، چاندن: دوێنێ شەهیدەکانمان ناشتن. دوێنی درێکمان ناشت.

ناشیان (چ.) ١- نابێت، ناکرێت، ڕێی تێ ناچێت: ناشێت خەبات نەکەین.٢- ناتوانێت، ناگونجان: ئەم کارە بۆ من ناشێت.

ناچار (ئان.) بێچار، نەچار، تەنگاوکردن، زۆرلێکردن، مەجبورکردن: ئەو ناچاری کردم واز لە کارەکە بهێنم.

ناچار (ئان.) مەجبور، کەسێك کە دەسەلاتی کاری بەخۆی نەبێ: ناچار کارەکەم ڕاپەڕاند.

ناڤ (ن.) ناو، نێو، نێڤ: ناڤێ بڤری ژ بڤری ناچیت.( پەندە)

ناڤك (ن.) ناوك، تۆڤ، کاکل. سەحکە ناڤکاوی.

ناڵ (ن.) پارچە ئاسنی پاژنەی وڵاخ. ئەو نالی بوو نەك ناڵی.

ناڵبەند (ن.) ١- کەسێك کە ناڵ دروست دەکاو وڵاخ ناڵ دەکا: ئەوەی ئەسپیشی هەبێ ناڵبەند نییە.٢- نازناوی شاعیرێکی کوردە (ئەحمەدی ناڵبەند).

نالە (ن.) کڕووزانەوە لە دەردو خەم، دەنگی نەخۆش لەکاتی نەخۆشی، نارە: ئاگای لەخۆی نەبوو، هەر نالەی دەهات.

نالەبار (ئان.) ناڕێك، چەوت، ناهەموار، ناساز، نەگونجاو: ئەمڕۆ باری کوردستان نالەبارە.

ناڵکراو (ن.) ١- وڵاخێك کە ناڵ کرابێ: ئەسپی ناڵکراو بەغارە لە ڕێگادا. ٢- فریودراو، هەڵخەلەتێنراو، گوزارشتە لەوەی کەسێك دەستەمۆ کرابێ یان چووبێتە ژێر بار.

ناڵکردن (چ.) ١- ناڵ لە پاژنە دان: ڕێوی بە نیازی ناڵکردنی ئەسپ چوو لووزی شکا. ٢- دەستەمۆ کردن، فریودان.

نالین (چ.) ناڵین، ئەو دەنگەی کە مرۆڤی نەخۆش لەبەر تاو ژانی دەری دەبڕێت: بریندار ژ بەر ئێش‌و ژانا برینا خۆ دنالی.

نامە (ن.) ١- قاقزی نووسراو بۆ ناردن: نامەکەم نارد .٢- دەنگ دیاری نووسراو لە کتێب دا. ڕۆستەم نامە، نمایش نامەم خوێندەوە.

نامەرد (ئان.) ناپیاو، نامرۆڤ،: مرۆڤی نامەرد هەردەم دۆڕاوە.

نان (ن.) ١- ئاردی بە ئاو شێلدراو و بە ئاگر برژاو: کە گەیشتمە جێ نانیان کرد، منیش نانێکی گەرمم خوارد. ٢- شیو، فرایین، فراڤین، خواردن: بۆ قەڵەو نەبوون ئێواران کەم نان دەخوا.

نان (ن.) ١- ئەستووك وە یا لە هەویر و جۆری زۆرە: نانی بێژی خۆشە.٢- خواردن: نانەکە ئامادەیە.

نان پەیداکردن (چ.) دابین کردنی بژێوی، ئیش کەر: نان پەیداکردن ماندووبوونی دەوێ.

ناهەق (ئان.) ناراست، نارەوا: مرۆڤی ناهەق ریسوایە.

ناو (ن.) ١- ناڤ، نام، دروشمی ناسینی هەر شتێك. ٢- دەنك، کرۆك، کاکڵ: ئەم گوێزە ناوی تێدا نەبوو. ٣- ناوچە، مەڵبەند، دەڤەر: خەڵکی ئەم ناوەم. ٤- دنە، هان، پشتگیری، پەسنین، هەڵکێشان: ناو دەخۆدان پەسەند نییە. ٥- بە دووبارە

کردنـــەوەی وەلأم بـــەکار دێ بـــە نـــەرێ، نـــاو نـــاو. (ئـــاك.)٦-
ناوەڕاست، ناوەند، دوڕ، چەقی شت: قەڵەمەکەم لەناو گیرفانـدا بوو کەچی بۆی دەگەڕام.

ناواخن (ن.) ناوەڕۆك، مەتن، کاکڵە: ناواخنی کتێبەکەم خوێندەوە.

ناوبانگ (ن.ل.) دەنگو ناو، شوهرەت: نالی شاعیرێکی بەناوبانگە.

ناوبریشك (ن.) لە دارە بۆ نان برژاندن: ناوبریشك لەناو کوردا هەیە.

ناوەڕۆك (ن.د.) هەرچی لەناو شتێدایە: نـاوەڕۆکی چیڕۆکەکە بەسـەرهاتێکی خۆش بوو.

ناوەراست (ن.ل.) ناوەند: باری ئاسایشی ناوەراستی عێراق تێکچووە.

ناوەند (ن.) بنکە، مەڵبەند، ناوەڕاست، چەق: قوتابخانەکـەمان لـە ناوەنـدی شارە. — ی: قۆناغی دوای سەرەتایی، شازاد قوتابی پـۆلی دووی ناوەندییە.

ناوجەرگە (ئاك.) ناوەند، چەق، ناوەڕاست، مەڵبەند، ناوین: کوردسـتان کەوتۆتـە ناوجەرگەی ڕۆژهەلأت.

ناوچە (ن.) سنوورێکی دیاریکراو، شوێن، مەڵبەند، دەڤەر: ناوچـەکەتان لـە ڕووی ئاوەدانییەوە زۆر گەورە بووە.

نای (ن.) بلوور ، بلوێر: دەنگی نـای بەسـۆزە._ چـی (ن.ب.) کەسـێ نـای دەژەنێ: نازە نای دەژەنێ.

نایاب (ئان.) جـوان، دەگمـەن، ڕێـك، بـە نـرخ، بـاش: مێـوژی نایـاب لای مـام زۆراب دەست دەکەوێ.

نە (ئام.) ١- بۆ نەرێی کاری رابردوو: کڕیم، نەمکڕی.٢- بۆ نەرێی نـاوی بکەر: بخۆر، نەخۆر.

نەبەرد (ئان.) دلێر، ئازاو چاو نەترس: ئێمە گەلی کوردی نەبەردین.

نەبەز (ئان.) ١- کۆڵنەدەر، ئازا، چۆك دانەدەر: نەبەز هەر خۆمان بووین.
٢- شلو سست لە بەزینو ڕاکردن: ئەسپەکەت نەبـەزە نـاتوانی زوو بگەیتە جێ.

| | |
|---|---|
| نەبز (ن.) | لێدانی دڵ، ترپەی دڵ: دکتۆر نەبزی گرتم. |
| نەتەوە (ن.) | ١- قەوم، گەل، ڕەگەز، کۆمەڵە خەڵکێك کە خاوەن زمانو دابو نەریتو خاكو مێژووی هاوبەش بن. ٢- نەوە، بەرەباب: لە نەتەوەی کێی؟ |
| نەپەنی (ن.) | نهێنی، شاراوە، نائاشکرا. نڤیسینەکا نەپەنی. |
| نەحەز (ن.) | دوژمن، نەیار، نەب دل: مرۆڤی نەحەز چجاران بسەر ناکەڤیت. |
| نەخۆش (ئا.ن.) | خراپی باری تەندروستی: نەخۆش پێویستە سەردانی پزیشك بکات. |
| نەخۆشخانە (ن.ل.) | تیمارخانە، خەستەخانە: نەخۆشخانەی کۆماری کۆنترین نەخۆشخانەی شاری هەولێرە. |
| نەخۆشی (ن.) | نەساخی. ئەو بە نەخۆشی مرد. |
| نەخۆشی (ن.و.) | لەش بەباری: نەخۆشی ورەی مرۆڤ کەم دەکات. |
| نەخاسمە (ئام.) | نەمازە، بە تایبەتی. وان هەمی هاتن نەفاسمە ئازاد. |
| نەخایاند (ك.) | بەردەوام نەبوو: کۆبوونەوەکە کاتێکی زۆری نەخایاند. |
| نەختێ (ئاك.) | کەمێ، کەمۆکەیەك: منداڵەکە نەختێ گریا. |
| نەختێ (ئان.) | تۆزێ، کەمێ، هەندێ، برێ :نەختێ پارەم پەیدا کرد. |
| نەختێك (ئان.) | تۆزێك، برێك، کەمێك، هەندێك: نەختێك شەکرم کڕی. |
| نەخش (ن.) | ١- ڕەنگ و شتی دروستکراو بە دەست: لە نەخشەکەی خەلاّتی وەرگرت.٢- بەخت و هات: لە ژیانیدا نەخشی هێناوە. |
| نەخش چنین (چ.) | نەخش دروستکردن: هۆنراوەکانی نەخشە و چنراوە. |
| نەخشین (ن.) | شتی نەخشاوی، جوانو ڕەنگاو ڕەنگ: مافوورەکەمان بە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ نەخشینە. ٢- ناوی ژنانە: نەخشین هونەرمەندێکی تازە پێگەیشتووە. |

نەخوازەڵا (ئاك.) بەتایبەتی، نەخاسمە: من ئێوەم خۆش دەوێت نەخوازەڵا ئێستا.

نەراندن (چ.) هاوارکردن، شیرەشیر، دەنگی شێر، قیراندن: شێرەکە نەراندی.

نەرە ( ن.و.) دەنگێکی نێرو گەورە، دەنگی شێر: هەردەم نەڕەیەکی دێت.

نەڕەنەڕ (ن.ل.) دەنگێکی زۆر بڵندو بەهێز، نەعرەتە، نیڕە، مۆڕی، قیژە، شییرە، هاوار. ئەو نەرە نەرەی ناوێ!

نەرم (ئان.) ١- پێچەوانەی زبر: جلی نەرم بۆ ساوا باشترە.٢- دژی رەق: هەویرەکە نەرم و شلە. ٣- بۆ سیفەتی مرۆڤ: ژنێکی نەرم و نیانە. ٤- نەرم: خۆشی: بەقسەی نەرم لەکونێ دێتە دەر.

نەریت (ئان.) هەڵسوکەوت، داب: نەریتی کوردەواری جوانن.

نەزانین (ك.) دژی زانین، شارەزانەبوون لە شتێکدا: زانین رووناکییە، نەزانین تاریکییە.

نەگۆڕ (ئان.) بنەجە، نەگوهوڕ، خۆجە، خۆڕاگر. ئەو وەك شاخ وایە، نەگۆڕە.

نەگریس (ئان.) لاسار، گوێ نەبیس و بەدفەڕ : پیاوی نەگریسش بەڵایە.

نەعرەتە (ن.) گورە، گورین بە دەنگی بەرز، دەنگی شیر.

نەقارە (ن.) دەهۆڵو کەرنا، کە کۆن لەگەڵ لەشکردا بوون.

نەقارەچی (ن.) دەهۆڵ کوت: نەقارەچییەکان هاتن وە پێش لەشکر کەوتن.

نەقش (ن.) ١- نەخش، ڕەنگو شێوەی دروستکراو: نەقشی ئەو مافوورە جوانە. ٢- بەختو تاڵێ، هات: ئەو پیاوە بوو کە نەقش بێنێ.

نەك (ئام.) ١- نەوەکو، نەبادا: پەیمان نەك هەر خۆی نەهات، بەڵکو نەیهێشت منداڵەکەشی بێت.

نەمان (ئان.) دژی مان، مردن: خۆزگە بۆ نەمان مەخوازە.

نەمر (ئاب.) زیندوو: شەهید نەمرە.

نەهات (ئان.) وشکەساڵی، بێ بەرهەمی، قات و قڕی: پارساڵ نەهات بوو.

نەوە (ن.) کوڕو کوڕەزا، نەڤی، نەوە: قوتابیان، ئێوە نەوەی دوارۆژن.

نەوت (ن.) ماددەیەکی سوود بەخشە لە ژێر خاکی کوردستاندا زۆرەو سووتەمەنی جۆراو جۆری لێ دروست دەکرێ: هێشتا نەوتی کوردستان لە خزمەتی خەڵکی کوردستاندا بەکار نەهێنراوە.

نەوەندە (ن.) دەغلێکی پایزییە کە درەنگ چێنرابێت: سەرماو بەفر نەوەندەکەی خنکاند.

نەورۆز (ن.ل.) رۆژێکی نوێ: نەورۆز جەژنی کوردانە.

نەوسن (ئان.) چلێس، زۆر خۆر: مرۆڤی نەوسن تێر نابێت.

نرخ (ن.) بەها، قیمەت، بایی: نرخی ئەو کاڵایانە بەرز نەبۆتەوە کە ناوخۆیین.

نرکە (ن.و.) ناڵە، دەنگ لەسینگەوە لە ماندووبوون : نەخۆشەکە نرکەی دێت.

نزار (ئان.) ١- جێگەیەك لە بەرزی شاخ وکێودا کە کەمتر تاوی لێدەدا: کەو لە نزارا قاسپەی دێ.٢- لەر و لاواز: ماڵاتەکەی نزارە.٢- ناوە بۆ نێرینە.

نزم (ئان.) ١- پێچەوانەی بڵند: بان خانووەکەمان نزمە. ٢- بێهێز: کابرا لە نزمی داوە.٣- بێ کارو کەم ئابڕوو: کابرایەکی نەفس نزمە.

نزیك (ئاك.) ماوەیەکی کەم. دوور نەبێ: کۆڕی زانیاری نزیك نییە.- ەی مەزەندەیی، تەروییی: نزیکەی بیست چیرۆکی هەیە.

نشین (چ.) دانیشتن و ژیان: پەنابەرەکان لە ئەوروپا جێنشین بوون - هاو - (چ.) بەیەکەوە ژیان و نیشتەجێ بوون: با پەرتووك هاونشینمان بێ.

نشێو (ئان.) لێژ، زەوی سەروخوار: ژیان پرییەتی لە هەورازو نشێو.

نڤستن (چ.) نووستن، خەوتن. نڤستن ژیانە.

نك (ئاك.) کن، جەم، دەڤ، مەر، لا. نك وی بە.

نمایش (ن.) رانان، خۆرانان: نمایشەکە لەسەر شانۆ بوو. - نامە (ن.) ناوی کتێبێکە لە (پرۆمیپۆس) هی شیللی یە : نمایشنامەکە درامایە.

نموونە (ن.) ١- وێنە، شتێك لە زۆر بۆ پیشاندان، شێوە: تا نموونەیەکی لێ نەبینین ناتوانین بکڕین. ٢- ناشرین. ئەو نموونەیە چیە هێناوتە.

نهاڵ ( ن ) نەواڵ، نوهاڵ، دۆڵ، شیڤ، دەرەی ناو شاخو داخان: ڕاوچیەکە ئاسکەکەی لە دۆڵەکەدا گرت.

نهێنی (ن.و.) نادیار ، بزر: نهێنی هاوڕێت مەدرکێنە.

نۆبەرە (ن.) منالی یەکەم: نۆبەرەمان ناوی چرا بوو.

نۆرە (ن.) نۆبە، نۆب، نۆبەت، کەرەت، سرە، دەست: نۆرەی منە، ڕاوەستە.

نۆکەر (ن.) ١- خزمەتکار، خولام: مالی ئاغا دوو نۆکەریان هەن. ٢- جاسووس، بەکرێگیراو، شوفار: هەواڵەکەیان لە ڕێی نۆکەرەکانیانەوە پێ گەیشتووە.

نوالە (ن.) دۆڵ، شوێنی قوول لە دامێنی چیا: شوانەکە مەڕەکانی برد بۆ نوالەکە.

نواندن (چ.) ١- خەواندن: منداڵەکەم نواند. ٢- دەوربینین: ئەکتەرەکە دەورێکی جوانی نواند. نواندن: زوڵم دەرخستن و بەکار هێنانی: زەبر نواندن رواڵەتێکی خراپە.

نوخشە (ن.) نۆبەرە، بەری یەکەمی لە منال و شتی تریش: نوخشەش لە تۆ سەرکەویت.

نوقوڵ (ن.) شیرینەمەنی، شەکرۆکە، شەکەرات: لە شەوی بەراتدا نوقوڵ بەسەر منداڵاندا دابەش دەکرێ.

نووژەن (ن.) سەرلەنوێ، دووبارە، لەنوێوە، کارێکی تازە، تازە دروستکراو: حکومەتی هەرێم شارەکانی کوردستانی نۆژەن دەکاتەوە.

نووزه (ن.و.) دەنگێکی نـزم و باریـك لـه کـاتی نەخۆشـی و گریـان: نـووزه نووزی دێت.

نووسا (ك.) لکا: قسەی باوکی به دڵەوه نووسا. — نـد: قـوڕی بـه دیوارەکـه نووساند.

نووسەر (ن.ب.) ئەوەی شتێك دەنووسێ: نووسەری خاوەن هەڵوێست بەرێزه.

نووسراو (ن.د.) نامه، مەکتوب: نووسراوەکه گەیشت.

نووسین (چ.) دەق، تێکست: نووسین مرۆڤ پێش دەخات. — ەوە: قوتابییەکه نووسینەوەکەی تەواو کرد.

نووشتانەوه (چ.) چەمانەوه، قەد بوون: دارەکەم نووشتانەوه.

نووك (ن.) ١- سەری تیـژوباریکی هـەر شـتێ: نـووکی خامـەی زۆر تیـژه.٢- دەنگ بۆ گریان : نووکه نـووکی دێت.٣- دنـوکی مـەل: نـووکی کەو سووره.٤- چاك لەپێش بەدا دێت: نووك و بەدی بـۆ بـاس دەکات.

نوێ (ئان.) تازه، نو، نەو: عێراقی نوێ هیچی نوێی پێوه دیار نییه.

نوی (ئان.) نوێ، تازه. رەخنا نوی دەڤ مه نینه.

نوێ نوێ (ئان.) دووبارەکردنەوەی نوێ، تازه، تازه: کراسەکه نوێ نوێ بوو.

نوێنەر (ئان.) بریکار: نوێنەری مامۆستایان بەژداری کرد.

نوێنەر (ن.) نمینـده، نـاردراو، جێگـر، نێـراو، بریکـار: گـەلی کـورد نوێنـەری چالاکی هەیه له وڵاتانی جیهاندا.

نی (ئام.) بۆ نەرێ ی کاری ڕابردوو: دەنووسم، نی یه.

نیاندرتاڵ (ن.) ١- یەکەم جۆری ئادەمیزاده: دەڵێن نیانـدرتاڵ کۆنـترین شـێوەی مرۆڤه. ٢- ناوچەیەکه له ئەڵمانیایه.

نێرگس (ن.) نێرگز، گوڵی بەهاره: نێرگز نیشانەی بەهاره.

نێڕین (چ.) نۆڕین، ڕێنان: ته نێڕا وی نه ساخی؟

نیشتەجێ (ن.ب.) دانیشتوو، چەسپ له شوێنێك: خەڵکی لادێ له شوێنی خۆیاندا نیشتەجێ کرانەوه.

| | |
|---|---|
| نیشتمان (ن.) | زێد، مەڵبەند، خاك: كوردستان نیشتمانی كوردانە. |
| نیشتمان پەروەر (ئان.) | وڵات پارێز، خزمەتكاری زێد: نیشتمان پەروەری ئەركە. |
| نیشتمان پەروەر(ن.و) | خاك پەروەر، وڵات پارێز: دڵدار مرۆڤێكی نیشتمان پەروەر بوو. |
| نێچیر (ن.) | ئەو گیانلەبەرەی كە لە راو بگیرێ یان بكوژرێ: راوكەرەكە نێچیرێكی باشی دەست كەوت. |
| نێچیرڤان (ن.د.) | نێچیروان، راو كەر، راوچی: نێچیرڤانی نێچیرەك راو كرد. ٢- ناوە بۆ نێرینە. |
| نیگا (ن.) | تەماشاكردن، سەیركردن، تیلەچاو: بەنیگایەك لێم روانی. |
| نیگار (ن.) | وێنە، شێوەی دروستكراو: بۆ پێشانگاكە چەند نیگارێكم كێشاون. |
| نیڤ (ژ.) | نیو، كەرت. نیڤ دینار نوكە بكار نایەت. |
| نیعمەت (ن.) | ١- خەڵاتی خوا لە ژیان و خۆراك: شوكری نیعمەتی خودا بكەین.٢- خۆشیی ژیان: هەندێ كەس لە نیعمەتدا دەژین. ٣- سووكەڵەی نیعمە الله: نیعمەت ناو كەمە. |
| نیهاد (ن.) | ١- دڵ و دەروون: نیهاد و پاك و بێگەردە.٢- ناوە بۆ پیاوان: نیهاد تا ئێستا ئاوارەیە. بەشی یەكەمی رستە. |
| نێوان (ئاك.) | میان، لە مابەین: برایەتی نێوانتان بپارێزن. |

# هـ

**هۆزان (ن.)** هۆنراوه، هەڵبەست، شیعر.

**هۆزانڤان (ن.بکەر.)** هۆنەر، هەستیار. ئەحمەد نالبەند هۆزانڤانەکی ب ناڤ و دەنـگ بوو.

**هۆش (ن.)** ئاوەز، عەقڵ، بیر، هش، ئاگایی: زۆر نەخۆشـە، بـەلأم هێشـتان هۆشی ماوه.

**هۆشیار (ئان.)** ١- خاوەن هـۆش وهەسـت، هەسـتیار: شـاعیران میللـەت هۆشـیار دەکەن.٢- ناوە بۆ نێر: هۆشیار زێباری زیرەکە.

**هۆگربوون (چ.)** خووکردن، لێ ڕاهاتن لەسەر: رۆژبەرۆژ هۆگری کارەکەی دەبێ.

**هۆڤی (ن.و.)** دڕندایەتی، نەخۆشییێن گران، دڕندە: هۆڤیو ئاشتی نابنە برا.

**هات (ئان.)** ١- بـەر، بـەری زۆر، سـاڵێك کـە بـەروبوومی دانەوێڵـە زۆر بـێ: ئەمساڵ لە قەراج هات بوو. (پاش.): ٢- پاشگری کۆکردنـەوەی ناو: میوەهات.

**هاتن (چ.)** گەیشـتن، لـە شـوێنێك بـەرەو شـوێنێك: بـەهاتنتان خۆشـحاڵ دەبین.

**هاتنە سەر (چ.)** ١- خەیاڵ لە مێشکدان: هاتۆتە سەرم سـەفەرێکی دەرەوە بکـەم. ٢- بەسەردادان، هێرش بـۆ هێنـان، پـەلاماردان: ئـەو نامەردانـە بەشەو هاتنە سەری.

**هاتنە گۆڕێ (چ.)** هاتنــە ئـارا، هاتنــە کایــەوە، پەیـدا بـوون، وروژانــدن، ڕوودان، سەرهەڵدان، باسکردن: حەزناکەم ئەو مەسەلەیە بێنیە گۆڕێ.

هاتنە کایەوە (چ.) بەرپا بوون، هاتنە ئارا، سەرهەڵدان: لە سایەی بەرەو پێشچوونی پیشەسازی چەندان ئامێری جیا جیا هاتوونەتە کایەوە.

هاتوچۆ (ك.) هاتنو چوون: ئێستا هاتوو چۆ ئاسانە.

هاتوچۆ (ن.) هاموشۆ، ڕۆیشتنو هاتنی بەردەوام: پەیڕەو کردنی یاساکانی هاتوچۆ لە کارەسات دەمانپارێزێت.

هاژەهاژ (ن.ل.) ١- دەنگی گەڵاو لق لەبەر بادا: هاژەهاژی لقوپۆپی دارەکان دێ. ٢- دەنگی ئاو و هەڵدێر: هاژە هاژی ئاوی گەلی خۆشە.

هارێ (ن.) نەخۆشییەکە تووشی هەنگ دەبێت.

هاریکاری (ن.و.) هاوکاری، یارمەتی، دەستگرتن. مە پێدڤی هاریکاریا وەینە.

هارین (چ.) وردبوون، بەئاردبوون: گەنمەکەم هاری.

هاڤێتن (چ.) هاوێشتن، فڕەدان، تێهەڵدان، بهاڤێژینە ( کاری رانەبردوویە.): نابیت گلێشی بهاڤیژینە سەر جاددێ.

هاڤینگەهـ (ن.) هاوینەهەوار، هەوارگەهـ. هاڤینگەها سولاڤ یاخۆشە.

هان (ن.) دنە، هاندان: هاندەرانی بەرازیل تووشی سەرسامی بوون.

هاندان (چ.) پالدان، ئافەراندن، دەست خۆشیلێکردن. هاندان لەپڕۆسەی پەروەردەدا زۆر گرنگە.

هاو رەگەز (ن.) هاو بنەچە، هاو ریشە، لە یەك رەگەز: زۆر لە گیانلەبەران دوور لە هاو رەگەزی خۆیان دەژین.

هاوار (ن.) ١ـ بانگ بۆ بەدەنگەوە چوون: کە زانی گورگ لە مەڕی داوە دایە هاوار هاوار. ٢- ناوە بۆ نێرینە. ٣- دوو گۆڤاری کوردین بەو ناوە هەن لە ساڵی ١٩٣٢و ساڵی ١٩٧١.

هاوبەش (ن.) ١- هاو پشك، شەریك، بەشحاڵ، پشکدار: بەش بەحاڵی خۆم هاوبەشی خەمتانم. ٢- ناوە بۆ نێرینە.

هاوەڵ (ن.) هەڤاڵ، برادەر، هاوڕێ: هاوەڵی پیاوی خراپ مەکە.

هاوڕێ (ن.ل.) ١- هاوەڵ، هەڤاڵ، برادەر، دۆست: هاوڕێیەتی نێوان کچ و کوڕ پەرەی سەندووە. ٢- ناوی کوڕانە: هاوڕێ دەرچووی کۆلیژی مافە.

هاوسێ (ن.ل.) دراوسێ، جینار، جیران: ئاسۆ هاوسێمە.

هاوچەرخ (ئان.) مۆدێرن، سەردەم، نوێ: من حەز لە ژیانێکی هاوچەرخ دەکەم.

هاون هاوجێ (ن.) لەیەك جێ ژیان و یا نووستن: پەرتووکەکەم هاو جێمە.

هاوێشتن (چ.) شەقاودان، رۆیشتن بۆ پێشەوە. با هەنگاو هاوێشتنمان راست و ڕەوان بێ.

هاوینەهەوار (ن.ل.) کۆسار، هاوینگە، کوێستان، بانەمەڕ، جێگایەکە لە هاویناندا فێنك و شینایی و دارستانی زۆری لێیە: هاوینەهەواری مامەندە دەکەوێتە ناوچەی پشدەر.

هەبوون (چ.) ١- لە ئارادا بوون، پێچەوانەی نەبوون: هەبوونی دیموکراسی و ڕێزگرتنی یەکدی لە بنەماکانی کۆمەڵگای مەدەنین. (ئان.) ٢- زەنگین، خاوەن ماڵ، پارەدار، دەوڵەمەند: بۆ خۆیان هەبوونن پێویستیان بە یارمەتی خەڵکی نییە.

هەتا (ئام.) تا، ئەکاتەی: دانیشە هەتا دێم._ هەتایە (ئاك.) تا مابێ: ناوی چاك هە تا هەتا دەمێنێ.

هەتاو (ن.) خۆر، رۆژ: تیشکی هەتاو بە سوودە.

هەپڕوون (ئان.) ١- ووردوخاش، لەت وکوت: بوومەلەرزەکە شارەکەی هەپڕوون کرد.٢- شاخی بەرز: بەسەرشاخی هەپرون بە هەپرون کەوت.

هەژار (ئان.) بەلەنگاز، دەستکورت، بێچارە، نەدار، ژار: هەژاری دەردێکی کوشندەیە.

هەژار (ئان.) ١- کەم دەرامەت، نەداری: یارمەتی هەژاران پێویستە.٢- ناوەبۆنێر: هەژارو هێمن شاعیری موکریانن.

هەر (ئان.) ١- تەنها، بەس: هەر خۆت نێی، منداڵەکانیش بێنە. (ئام.) ٢- بۆ تەئکیدو سوور بوون: هەر لەگەڵت دێم.

هەرۆ (ئاك.) هەموو رۆژ. هەرۆ درەنگ دزڤرن.

هەرا (ن.) ١- شەڕ و شۆڕ، دەنگەدەنگ، گێرەوکێشە، کێشمە کێش: لە هەرای کەنداو زۆر کەس لەناوچوون. ٢- بانگ: من بووم هەرام کرد.

هەراش (ئان.) گەورە، پێگەیشتوو، گەشەکردوو: بەرخەکە هەراش بوو.

هەڕەت (ئاك.) ١- کاتی پێگەیشتنی میوە: هاوین هەرەتی میوەیە.٢- کاتی گەنجی: هەڕەتی گەنجییەتی.

هەرەس (ن.) ١- ڕەنوی بەفر، رنی، هاتنە خوارەوەی بەفر لە بەرزاییو شاخەکانەوە: هەرەسەکە زەرەری زۆری بەدواوە بوو، چەند دار گوێزو سێوەکی لەگەڵ هێناون. ٢- شکستی، نوشوستی لە کارێك: هەرەسی شۆڕشەکانی کورد هۆکاری دەرەکی زۆریان لە پشتەوە بوو.

هەڕەشەکردن (چ.) چاو سوور کردنەوە، گەف و گوڕ کردن، گڕ و گیف: هەڕەشەکردن کارێکی خراپە.

هەرەکۆن (ئان.) زۆرکۆن، کۆنترین: قەلای هەولێر قەلایەکی هەرە کۆنە لە جیهاندا.

هەرەوەزی (ن.) گەلە کۆمەکی، زبارە، کاری کۆمەڵ: خەڵك هەرەوەزی بۆ تەواوکردنی خانووەکەی کرد.

هەردە (ن.) بەردەلان، زبران: زەوی هەردە ناچێنرێ.

هەردی (ن.) ١- خەڵکی کێو پارە: هەردی لە شاخ راو دەکەن.٢- ناوە بۆ نێر: هەردی شاعیرێکی ناودارە.

هەرزە (ئان.) ١- گیای بژار: هەرزە لە باخەکە فڕێ بدە.٢- سەرسەخت و لاسار: مرۆڤی هەرزە زۆر تووشە.

هەرزەکار (ن.ل.) گەنج، لاو، خورت: دەبێت ئاگاداری هەرزەکاران بین.

هەرزەکاری (ن. و.) کاتی گەنجی، رۆژانی ئارەزوو: کاتی هەرزەکاری بەفیڕۆ مەدە.

هەرگیز (ئاك.) قەت، بە هیچ کلۆجێ: هەرگیز تۆم لەبیر ناچێتەوە.

هەرمێ (ن.) هەرمی، هەمێ، هرمێ، بەروبوومێكی هاوینەو جۆری زۆرە، لە هەندێك ناوچەدا تەنها بەیەك جۆری دەڵێن هەرمێ، بەجۆرەكانی دیكەش كرۆسك: لە باخەكەیاندا چەند دانە هەرمێیەكم خوارد.

هەروا (ئام.) ١- هەروەها، دیسان: هەروا بێتەوە ئازادیشیان لەگەڵدا بوو. (ئاك.) ٢- هەر ئەوها، لەخۆوە: - بۆچی ڕۆیشت؟ - هەروا.

هەروەسا (ئاك.) هەروەها، دیسان، هەروەتۆڤ. هەروەسا ئازادیش دێ هێت.

هەروەها ( ) هەروا، دیسانەوە، بەمجۆرە: گوڵاڵە گوڵی بەهارە، هەروەها نێرگزیش.

هەڕی (ن.) قوڕ، تەقن: هەكەبوو باران، دێ بیتە هەڕی.( پەندە)

هەرێم (ن.) دەوروبەری ئاوایی: لە هەرێمی گوندەكەمان بیرێكی ئاو لێدراوە. ٢- ناوچە: حكومەتی هەرێمی كوردستان ڕاگەیەنرا. ٣- ناوی كوڕانە: هەرێم دەرچووی پەیمانگایە.

هەزار (ژ.) دە جار سەدی: ئەشكەوتی هەزار مێرد لە كوردستانە.

هەزاران (ژ.) چەند هەزارێك: هەزاران لاو مانیان گرت.

هەسار (ن.) ستێر، ئەستێرە. لەكام هەسارەی؟

هەست (ن.) ئاگا، هۆش و عەقڵ:شیعری لیریك هەست بزوێنە.ـ یار (ن.ب.) خاوەن هەست وسۆز: شاعیر مرۆڤێكی هەستیارە.

هەست (ن.) ئاگا، هەست: هەستی لەخۆی بری بوو.

هەستیار (م.د.) ١- هەستۆك، هەستكار: كاوە منداڵێكی زیرەكو هەستیارە. ٢- شاعیر، وێژەوان: پیرەمێرد هەستیارێكی مەزن بوو. ٣- ناوی كوڕانە: هەستیار هونەرمەندێكی بەناوبانگە.

هەش (ن.) خم، قوربەسەر: هەش بەسەرەكە هاتەوە.

هەشتا (ژ.) لێكدراوە لە ژمارەی هەشت و دە: لە تەمەنی هەشتا ساڵی مرد.

هەگبە (ن.) بەرنامە، خورجێن، دووتایی بچكۆڵە كە لە پشت سوارەوە لە زین قایم دەكرێت، كۆڵ، توورەگە.

**هەق (ن.)** ١- ڕەوا: قسەكانی هەقە.٢- كرێ:هەقی كرێكار بدە.٣- ناوی خودایە: خودا بەخۆی هەقە.

**هەكە (ئام.)** ئەگەر، كەواتە، كەوابوو: هەكە گورگ د خەما بارانێ با ، دا بۆخۆ كەپەنەكی چێكەت.( پەندە)

**هەڵ (پگ.)** پێشگرێكی واتا داڕێژەو دەچێتە سەر چەند چاوگێك، هەڵكردن، هەڵگرتن، هەڵبڕین. -بژاردن (چ.) نەقاندن، دەستنیشانكردن، لەیەك جیاكردنەوە: هەڵبژاردن ڕێگای پیادەكردنی دیموكراسییەتە.

**هەل (ن)** دەرفەت هەلێكی مێژووییە باسودی لێوەرگرین.

**هەڵۆ (ن.)** باڵدارێكی ڕەشی گەورەیە: هەڵۆچاوەكانی تیژە.

**هەڵاتن (چ.)** ١- خێرا ڕۆیشتن، ڕاكردن: كەئاشكرابوون دەستیان كرد بە هەڵاتن.٢- لەئاسۆ دەركەوت: ئەستێرەی گەرلاوێژ هەڵات.٣- هەویر ترش بوون: هەویرەكە هەڵات.٤- تەواوبوون و بەسەرچوون: سەرمای زستان هەڵات.

**هەڵاڵە (ن.)** ١- گوڵێكی بۆن خۆشی كوێستانییە: كوێستانان پڕن لە گوڵی هەڵاڵە. ٢- شتێكە هەنگ لە گوڵی دەردەهێنێتو شانەی لێ دروست دەكات: هەنگ شانە لە هەڵاڵە دروست دەكات. ٣- تۆزی نێرو مێی رووەك بۆ موتوربە بوون.

**هەڵبەزینەوە (چ.)** كەوتن و هەستانی خێراو یەكسەر: منداڵەكە لەبەر ئاگری نەورۆز هەڵدەبەزینەوە.

**هەڵبژاردن (چ.)** نەقاندن ، بەدڵ بوونی شتێك یان كەسێك لەنێوان زۆر: هەڵبژاردنی ئەم جارە چارەنوسسازە.

**هەڵبزركان (چ.)** ١- خراپ بوونی شیر: شیر زوو هەڵدەبزركێ.٢- ڕەنگ تێكچوون: لەتاوا ڕەنگ شین (چ.) بەیەكەوە و ژیان: هاونشینی باش هەڵدەبژێرم.

**هەلبوون (چ.)** پێبوون، داگیرسان، گەشبوون، هەلکر ( کارێ رابردوویە): هەما نەزانی ئاگر هەلکر دێ تەروهشکان پێکڤە سۆژیت.

**هەڵە (ئان.)** سەهوو، چەوت: هەوڵبدە هەڵە نەکەیت.

بەهەڵەچوون (چ.)١- خراپ تێگەیشتن: لە قسەکانم بەهەڵەچووە.٢- سەهووکردن: زۆرجار بەهەڵەدا دەچێت.

**هەڵەت (ن.)** زورگ، نواڵە، زەوی سەخت: کوردستان هەردەو هەڵەتی زۆرە.

**هەڵتەکاندن (چ.)** ١- ڕاوەشاندن و تەکاندنی بەڕ: مافوورەکەم هەڵتەکاند.٢- تێك و پێك دادان: بۆمبەکە شارەکەی هەڵتەکاند.٣- برۆ یا شان هێنان و بردن: برۆی هەڵتەکاند، شانی لە شانی هەڵتەکاند.

**هەلپەرست (ئان.)** مرۆڤی ناشایستە، هەلخواز، ناشیاو، هەواپەرست، خۆپەسندکار: خۆت لە مرۆڤی هەلپەرست دوور بخەرەوە.

**هەڵپەرکێ (ن.)** داوەت، شایی، هەڵپەڕین: هەڵپەرکێی کوردەواری بەناوبانگە.

**هەڵپەرکێ (ن.)** شایی: کورد هەڵپەرکێی زۆرە.

**هەڵخستن (چ.)** ١- بەر هەتاودان بۆ ووشك بوون: جلەکانی هەڵخست.٢- گوێ ڕاگرتن بۆ بیستن: گوێی هەڵخستبوو بۆ قسەکان.

**هەڵخلیسکان (چ.)** خزانی پێ لە شوێنی خز: لەسەر بەفرەکە هەڵخلیسکا.

**هەڵسان (چ.)** ١- ڕاستەوەبوون: قوتابییەکان هەموو هەڵسان. ٢- لە لانەوە دەرچوونی نێچیر: لەگەڵ دەنگی تەقەکان کەروێشکەکان هەڵسان. ٣- بەرزبوونەوەی ڕادەی ئاو: بەهۆی ئاوی باران لافاو لە هەولێر هەڵسا. ٤- لەخەو بێداربوونەوە: بەری بەیان لە خەو هەڵسام.

**هەڵسوڕان (چ.)** جێبەجێ کردن، هەڵسان بە کارێك: سەرکەوتن هەڵسووڕانی دەوێ.

**هەڵسوون (چ.)** چەورکردن، پیاساوین، لێ خشاندن: شەپۆلەکان خۆیان بەکەنارەکە هەڵدەسووی.

**هەڵچوون (چ.)** ١- تووڕەبوون: هەڵچوون سیفەتێکی بێ سوودە.٢- ڕژانی گوڵاو لەسەر ئاگر: شیرەکە هەڵچوو.

**هەڵگەڕان (چ.)** ١- بەسەرکەوتن: بەسەر شاخەکە هەڵگەڕاین.٢- ڕەنگ وجۆر گۆڕین: ڕەنگی سوور هەڵگەڕا.٣- ڕۆیشتنی جانەوەر بەلەشدا: میرولەکەم پێ هەڵگەڕا.٤- خراپ بوونی شیر لە کوڵاندا: شیرەکە مەخۆن هەڵگەڕاوە.

**هەڵگڵۆفتن (چ.)** هەڵگوشین، شێلان: بەئەسپایی چاوەکانت هەڵگڵۆفە.

**هەڵگیرسان (چ.)** ١- گرش لێ پەیدابوون: ئاگری نەورۆزیان هەڵگیرساند.٢- سەرەو دەسپێکردنی شەڕ: شەڕ لە نێوانیان هەڵگیرسا.

**هەڵگیرسان (ك.)** هەڵکردن، هەڵایسان، داگیرکردن: ئەوان ئاگری جەنگیان هەڵگیرسان.

**هەڵقرچان (چ.)** سووتان، وشك بوون، لەبەر ڕۆژ لەگەرمان هەڵقرچان.

**هەڵقوڕان (چ.)** فڕکردن و خواردنەوەی یەکسەر: دوای وەرزش ئاو هەڵقوڕان خراپە.

**هەڵکۆڵین (چ.)** ١- دانەوەی زەمین: هەڵکۆڵینی زەمین بۆ دۆزینەوەی نەوت بەردەوامە. ٢- ناو دەرهێنانی هەر شتێك: هەڵکۆڵینی دیوار بۆکاری هونەری لێزانینی دەوێ.

**هەڵکۆڵین (چ.)** هەڵ:ەندن: هەڵکۆڵین هونەرێکی کۆنە.

**هەڵکەندن (چ.)** هەڵقەندن: بیر هەڵکەندن بە ئامێر ئاسانە.

**هەڵکەوتن (چ.)** ١- دەرفەت: هەلێکی باشی بۆ هەڵکەوت.٢- تەرەقی کردن: لەناویاندا هەر ئەو هەڵکەوت.٣- ڕێکەوت: نەمانزانی بەو شێوەیە هەڵکەوت.

**هەڵم (ن.)** لە ئەنجامی کوڵانی ئاو: هەڵم شێ پەیدا دەکات.

**هەلم (ن.)** هەڵم، هلم، هێلم. ئاو گەرم بێ، دەبتە هەڵم.

**هەڵمەت (ن.)** ١- پەلامار، شاڵاو، هێرش: لە پێناو جووجکەکانی هەڵمەتی بۆ هێنان. ٢- ناوە بۆ نێرینە. ٣- کاری بە کۆمەڵ: خەڵك

پێشوازییەکی باشی لە هەڵمەتی کۆکردنەوەی ئیمزا کرد. — بردن (چ.) شاڵاو بردن، پەلامار دان، هێرش بردن، بەسەردادان، چوونە سەر: هیچ هەڵمەت بردنێکی پێشمەرگە نەبووە دەستکەوتێکی پێوە نەبێ.

هەڵمژین (چ.) نۆشین، بۆن کردن: هەڵمژینی بۆنی گوڵان خۆشە.

هەڵمژین (چ.) هەڵمژان: هەڵمژینی هەوای ساف خۆشە.

هەڵوەرین (چ.) لێ بەربوونەوە، لێ کەوتن: گەڵای دارەکان هەڵوەرین.

هەڵوەرین (چ.) لێکەوتن، کەوتنە خوار: گەڵای دارەکان هەڵوەرین.

هەمان (ئان.) هەرئەو، ئەوبخۆ، بەخۆی، هەرخۆی، دیسان: ئەمساڵیش هەمان قوتابی بووە یەکەم.

هەمەدان (ن.) شارێکە لە ئێران: بابا تاهیر شاعیری هەمەدان بووە.

هەمەچەشن (ن.د.) هەمەجۆر، هەمەبابەت، هەمەشێوە: مامۆستاکەمان هەمەجۆری بابەت باس دەکات.

هەمەوەند (ن.) ناوی عەشیرەتێکی کوردە.

هەموو (ئان.) گشت، تێکرا، تەمام: منداڵان هەموو خەریکی خوێندنن.

هەموو (ن.) ١- هەمبانە، هەنبانە. (ج.ن.): ٢- گشت، تێکڕا، تەواو: هەموویان لە تاقیکردنەوەکە ئامادە بوون.

هەمی (ئان.) هەموو، خڕ، گشت، تەڤڕا، تەڤ: ئەگەر هەمی چیچك یێن هژیران بان چ بۆ خودانان نەدمان (پەندە).

هەمیشە (ئاك.) هەردەم، دایم، بێبڕانەوە، هەموو کات، هەموو دەم، بەردەوام، بێ پسانەوە: پێویستە مرۆڤ هەمیشە بیر لە داهاتووی نەتەوەکەی بکاتەوە.

هەنار (ن.) نار، میوەیەکی دەنکدارە، ترش‌و شیرین‌و مێخۆشی هەیە: هەناری شیرین خۆشە.

| | |
|---|---|
| هەناسە (ن.) | هـەواوەرگرتن و دانـەوە: غەمـەکانی هەناسـەی لێـبڕی.ـ دان (چ.) هەوا هەڵکێشان، نەفەس وەرگرتن: هەناسەیەکی قووڵی دا. |
| هەناسە هەڵکێشان (چ.) | هەوا وەرگرتن بۆ بەردەوامی: بە قووڵی هەناسەی هەڵکێشا. |
| هەناسەبڕکە (ن.ل.) | هانکە هانـك، خۆرەچـەرە، هەناسـەی دژوار دوای مانـدووبوون هەڵدەکێشرێ: کاوە بە هانکە هانك هاتە قوتابخانە. |
| هەناسەسارد (ئان.) | خەفەتبار، غەمبار، پەرێشان، نائومێد، بـێ ئەمـەل، بـێ هیـوا: بەهەناسە ساردی خەوت. |
| هەندێ (چ.) | بەعزێ، نەختێ: هەندێ قەلەم راستی دەنووسن. |
| هەنسك (ن.) | هەناسە بەدەم گریانەوە. منداڵەکە بە هەنسکەوە نووست. |
| هەنگ (ن.) | مێشـەنگین جـۆرە مێشـێکی بـێ زیانـەو بەرهـەمی هـەنگوین دەبەخشـێت: خۆزگـە دوژمـن وەك هـەنگ بووایـە، کـە پێـی وە دەدای خـۆی بمردایـە. — او: پێنگـاڤ، شـەقاو: هـەنگاوی درێـژ مەهاوێ. |
| هەنگاو (ن.) | ١- شەقاو، شـانقاو، لـۆق، پێنگـاڤ: هـەنگاوی باشـی هاوێشت. ٢- ناوە بۆ نێرینە. |
| هەنگاونان (چ.) | شــەقاو هــەڵگرتن، شــەقاو هاویشــتن، بــەرەو پێشچــوون: هەنگاونانی کورد بەرەو سەربەخۆیی دەستی پێکردووە. |
| هەنگوین (ن.) | هەنگین، بەرهـەمی هـەنگ: هـەنگوین بەرهـەمێکی سروشـتیو بەسوودە. |
| هەوا (ن.) | ١- بـا: هـەوا گـەڵاکانی هەڵوەرانـد.٢- هـەوەس و ئـارەزوو: دوای هەوای نەفسی کەوتووە. |
| هەوجاڕ (ن.) | ئاموور، ئەسپاپی جووت: پێشان هەوجاڕ بەکاردەهات. |
| هەور (ن.) | ١- تەمێکە لە ئاسمان هەندێکیان بارانیان پێوەیە: هەوری سـپی هی تەرزەیە.٢- شتێکی نەرم و کـون کونـە بـۆ شووسـتن: دەم و چاوی بەهەور شووشت.٣- گۆم کە قووڵە: ئاگای ئەو هەورەیە. |

هەورامی (ن.) بەشە زمانی کوردییە: شیعری مەولەوی بە هەورامییە.

هەوڵدان (چ.) ١- بەرەو هەوا فڕێدان: کۆلارەکەی هەڵدا. ٢- بڵند کردن، بەرز بوونەوە: ڕەشماڵەکەیان هەڵداوە. ٣- قسە کردنو خۆ تێ هەڵقورتاندن: لەناکاو هەڵیدایەوەو دەستی پێکرد. ٤- ناو هێنان: ناوەکانیان هەڵدە بزانین کێن. — کەندن (چ.) هەلکۆڵین، هەڵقەندن: بە ماوەیەکی کەم لە هەڵکەندنی چاڵەکە بوونەوە. —کەوتن (چ.) رەخسان، گونجان، پەیدا بوون، هاتنە ئارا: دروستبوون: لە نێو خوێندکارانیش نووسەری باش هەڵکەوتوون. —گێرساندن (چ.) ١- گڕ تێبەردان، داگیرساندن، پێکردن، هەڵکردن: لەمپاکە هەڵگیرسێنە. ٢- بەرپا کردن، هێنانە ئارا: هەر شۆڕشێکمان شکستی هێنابێ، یەکێکی دیکەمان هەڵگیرساندووە.

هەوڵدان (چ.) تەقەلادان، خەباتکردن: سەرکەوتن بە هەوڵدانە.

هەوڵدان (چ.) تێکۆشان و ماندووبوون، تەقەللادان: دەستکەوتن بێ هەوڵدان نابێ.

هەولێر (ن.) پایتەختی هەرێمی کوردستان: هەولێر شارێکی خۆشە.

هەوێن (ن.) هێوێن، ئامیان، توندکەری ماستو پەنیر، جۆرە بەکتریایەکی سوود بەخشە، بەکتریای ترشانی پێدەڵێن: کابانەکە شیرەکەی هەوێن کرد.

هەیڤ (ن.) مانگ، مانگی ئاسمان، سی رۆژی مانگ، مەهـ: یێ خۆل سالێ گرت دێ خۆ ل مەهێ ژی گریت. (پەندە)

هژمار (ن.) ژمارە، زنجیرە، رەنووس: هژمارێن ٥، ١،٣ تاکنو هژمارێن ٢،٤،٦ جووتن.

هزر (ن.) بیر، هۆش، هش، ئەندێشە.

هشك (ئان.) وشك، ووشك، كزر، بێ ئاڤ، حشك: ددیالێکتا کرمانجیا باکووردا (دار) ئەگەر هشك بوو (نێر)و ئەگەر ( تەڕ) بوو ( مێیە) وەکی: دارێ گویزێ، دارا گویزێ.

هندەك (ئاك.) ئەوەندە، چەندەك، هەندە: هندەك پێ دمرن، هندەك بۆ دمرن.( پەندە)

هۆڕ (ن.) ئاغەڵ، جەواڵ، دەنگی زلی گاو چێڵ، زەوی زۆر نەرم کە سوار لێی دەر ناچێ، زۆنگاو: هۆڕەکانی باشووری عێراق لە سەردەمی بەعسییەکان وێران کران.

هۆڕە (ن.) گۆرانییەکی تایبەتە بۆستایشی (ئاهورامزدا) هۆرە جۆرە گۆرانیەکە.

هۆز (ن.) عەشیرەت، خێڵ، تیرە، تایفە: هۆزی هەرکی لە هەموو پارچەکانی کوردستان بلاّوە.

هونەر (ن.) هونەری کوردی لە پێشکەوتندایە. — مەند: هونەروەر: کورد هونەرمەندی بە توانای زۆرە.

هونەرمەند (ئان.) هونەرمەن، دەستڕەنگین: زیرەك هونەرمەرندێکی مەزنە.

هوین (ج.ن.) ئێوە، ئەنگو، هنگە، هەنگو، هوون، جێناوی کەسی دووەمی کۆیە.

هیجران (ن.) جۆرە گۆرانی و حەیرانی کوردیە: عەزیزی ئامینە هیجرانی دەگووت. بەجێهێشتن، جیابوونەوە: بەرگەی هیچرانت ناگرم.

هیجری (ن.) کۆچی: ساڵنامەی ئیسلامییە. بەو ناوەش ناوراوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) لە مەککە کۆچی کردووە بۆ مەدینە.

هێدی (ئاك.) هێواش، لەسەرخۆ، هێمن، بە شێنەیی. هێدی هێدی سارد دەبێتەوە. نازناوی شاعیرێکە هێدی دوا کوچکەی سێکوچکەی موکریانە.

هێژ (ن.) توانایی: هەموو هێزی خستەگەڕ.

**هێرۆ (ن.)** ١- ناوی گوڵە: هێرۆ گوڵێکی درشتی جوانە. ٢- ناوی کچانە: هێرۆ خوێندکاری زمانی کوردییە.

**هێرش (ن.)** ئێریش، سەرداگرتن، راهێلان، سەردوینان. هێرش دوتیمیژا شەهید بوو.

**هێرش (ن.و.)** شالاو، گەمارۆ، پەهین، هاتنەسەر، هووروژم، پێدادان، پێداکێشان، پەلامار: بەعسییەکان بە نارەوا هێرشیان بۆ کوردستان دێنا.

**هێرش بردن (چ)** پەلاماردان، هەرەشەلێکردن: پۆلیسەکە هێرشی کردە سەر دزەکە.

**هێز (ن.)** ١- وزە، توانا، تاقەت، قوەت، ڤەژەن، گوڕ، زەبر، تەوژم، تین: تا هێزم هەبوو لە ڕاکردندا رامکرد. بەڵکو یەکەم بم. ٢- زاراوەیەکی سەربازیی و پێشمەرگایەتییە، کە چەند هەزار کەسێك دەگرێتەوە. ئەو لە هێزی سەفین بوو.

**هێشتن (چ.)** ١- ڕێگەدان، مۆڵەتدان: هێشتی بچم بۆ ئاهەنگەکە. ٢- درێژکردنەوە شان بە شانی پێشگری ( ڕا ) : مەلا بانگی ڕاهێشت. ٣- بەرەو خوارکردنەوە شان بەشانی ( دا ): گوریسی بۆ داهێشت پێی سەرکەوێ. ٤- داگرتن و دەست لێنەدان: ئاوها هێشتن باش نییە.

**هێشتنەوە (چ.)** ١- راگرتن، گلدانەوە، گیر کردن: نیازمان نەبوو دوا بکەوین، بەلام ئەو ئێمەی هێشتەوە. ٢- بەردانەوەی ڕدێن: تەنکە ریشێکی هێشتۆتەوە.

**هیچ (ئان.)** ١- چش، نەچشت، نەتشت، بێ ژمارە، سفر: هیچی تۆم لا نییە تا بتدەمەوە. ٢- قەت: هیچ هاتوویتە لای ئێمە من ئاگام لێت نەبووبێ؟ ٣- بێ سوود، بێ کەڵك: ئەم قسە هیچانە چییە تۆ دەیانکەی؟

**هیچ و پووچ (ئان.)** بێ مانا، کەم و کورت، بێ سوود، بێ کەڵك.

هیڤی (ن.) هیوا، ئاوات، ئومێد، خوزی، داخوازی. هیڤیدارم تو ساخ بی.

هێڤێن (ن.) هەوێن، هەڤیرترش. هێشتا هیڤیتن نەبوویە.

هێلان (چ.) بەجێ هێشتن، بەردان، دەست لێ بەردان: دیتنا خۆشتڤیان چەندا خۆشە هێلانا وان نەخۆشترە.

هیمەت (ئاک.) هاوکاری، یارمەتی، پشتیوانی، بەتەنگەوە هاتن، فریاکەوتن: بە هیمەتی دۆستانمان سەردەکەوین.

هێمن (ئان.) ١- هێدی لەسەرخۆ، هێواش، هێو: مرۆڤی هێمن رێزدارە. — یەتی: کار کردن بە هێمنایەتی ئەنجامی باشترە. — بوونەوە: هێمن بوونەوە ئاسوودەیی دەبەخشێت. — کردنەوە: هێمن کردنەوەی بارودۆخی ولات ئەرکی سەر شانمانە. — ی: هێمنی پاراستن پێویستە. (ن.) ٢- ناوە بۆ نێرینە: هێمن موکریانی هۆنەرێکی هەست ناسکی نیشتمانپەروەرو سروشت پەرستو جوان پەرستی کوردە.

هێمن (ئان.) ١- لەسەرخۆو نەرم: مامۆستاکەمان هێمنە.٢- ناوە بۆنێر: هێمن نازناوی شاعیرە.

هێنان (چ.) هاوردن، گواستنەوە لە شوێنێك بۆ شوێنێك، پێچەوانەی بردن: چەند کۆمپانیایەکیان هێناوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە بە جوانترین شێوە.

هێنانەدی (چ.) جێ بە جێ کردن: هەموو قسەکانی هێنایەدی.

هیوا (ن.) ١- ئاوات و ئارەزوو: هەرکەس هیوای دوا ڕۆژی هەیە.٢- ناوە بۆ نێر: هیوا ئەندازیارە.

هیوادارین (ن.و.) هیوا. (ن.و.+ دار (پاگ.) + ین. ( ج.ل.) ١- هیواخوازین، خوازیارین، ئومێدەوارین، ئاواتەخوازین، ئارەزوو دەکەین، ئامانجمان وایە: هیوادارین پلەی یەکەم بە دەست بێنین. ٢- هیوا: ناوی کوڕانە: هیوا لە پۆلی شەشە.

هێواش (ئاک.) لەسەرخۆ، هێدی، بە شێنەیی، یاغر یاغر: ئازاد بەهێواشی دەدوێت.

# و

**وا (ئاك.)** ١- بـەجۆرێك، بەشـێوەیەك، ئـەوها، وەهـا: وا ڕای ئـەكرد كـەس نەیـدەدیت. ٢- ئێـستا، هـەر ئێـستا: لەسـەرم ڕاوەسـتا وا دێـم. (پاش.): ٣- كەر، كاركەر (نانەوا).

**وا لێهاتن (چ.)** بـەمجۆرە لێهـاتن، بـەمجۆرە بـوون، بـەم شـێوەیە لێكـردن: مـن قەرزاری تۆم چونكە لەسەر من وات لێ هاتووە.

**واتا (ن.)** مانا، چەمك، لێكدانەوە: واتای وشەكە ڕوونە.

**وارگە (ن.)** هـەوار،جێ هـەواری كۆچـەران، بارەگـای سـەفەر: وارگـەمان كوێستانە.

**واز هێنان (چ.)** دەست لێبـەردان، لـە كۆڵ بوونـەوە، بـەردەوام نـەبوون، خـۆ تـێ نەگەیاندن: وازم لە یاریكردن هێناوە تا تاقیكردنەوەكانم تـەواو دەبن.

**وازهێنان (چ.)** بەجێ هێشتن، وازهاوردن: وازی لەخراپە هێناوە.

**واشە (ن.)** مەلێكی گەورەیە لە باز دەچێت: واشە باڵندەیەكی گۆشت خۆرە.

**والی (ن.)** حاكمی وڵات، سەرپەرشت. ئەو والیەكی دادوەر بوو.

**وان (چ.ن.)** ئەوان، جێناوی كەسی سێیەمی كۆیە.

**وان (ن.)** دەریاچە.

**وتار (ن.)** ١- نووسراوی درێژ لەسەر مەبەستێ: وتـارێكی بـەنرخی لەسـەر شۆڕشـی كـورد نووسـی. ٢- قسـە بـۆ خـەڵك كـردن دەربـارەی مەبەستێ: وتاری ئاینی ئەم هەفتەیە بەپێز بوو.

**وەخت (ن.)** كات، دەم، سات: وەختی خوێندنەوەم دیاری كردووە.

وەخـــت بردنـــە سەر (ئاك.) کات بردنەسەر، کات بەسـەربردن: وەخـت بردنـە سـەر بـێ کـار ناخۆشە.

وەخت کوشتن (چ.) کات بردنە سەر، سات بەڕێکردن: وەخت کوشـتنی بـەبێ کـاری، زیان بە ژیانت دەگەیەنێ .

وەدی هێنان (چ.) دروستکردن و خوڵقاندن: هەوڵەکانمان بۆ وەدیهێنانی ئاشتییە.

وەرار (ن.) گەشە، گەیشتن، پێگەیشتن، نەشونما.

وەرەم (ن.) پەنەم، ئاوسان، ئەستووربوون: وەرەم نەخۆشییەکی ترسناکە .

وەرزش (ن.) جووڵانەوە بۆ لەش ساغیو ئەنجامـدانی پاڵـەوانێتی: وەرزش لـە کوردستان پێشکەوتووە. — کار: وەرزشوان: وەرزشکارە کۆنـەکان خەڵات کران.

وەرزێر (ن.) جووتیار، کشتیار، کرمانج: وەرزێری مایەی شانازییە.

وەڕس (ئان.) بێزاربوون، هەراسان: بەدەست خەمەکانی ڕۆژگاردا وەڕسم.

وەڕس بوون (چ.) ماندوو و بێزاربوون: لەزۆر گوتن وەڕس دەبین.

وەرگەڕان (ك.) وەرچـەرخان، لادان لـە بیروباوەڕێـك. قەلبوونـەوە. وەرگـەڕانی ئۆتۆمبیلەکەیان کارەساتی بەدواوە بەە.

وەرگرتن (چ.) ١- سەندن: ئەمڕۆ کـاتی وەرگرتنـی خەڵاتەکانـە. ٢-گـوێڕاگرتن: وەرگرتنی وانەکان بەباشی، سەرکەوتنی لەدوایە.

وەرگرتنەوە (چ.) شتێك کـە پێشـتر بردرابـێ وەربگیرێتـەوە: ئـەو پارەیـەی کـە بـە قەرز پێم دابوو لێم وەرگرتەوە.

وەرگێڕان (چ.) ١- گـۆڕین لـە زمانێکـەوە بـۆ زمانێـك: چـیرۆکەکەی وەرگێڕایـە کوردی.٢- ئەودیوکردن: جلەکانی وەرگێڕا.

وەزیر (ن.) شالیار، پیاو مـاقوڵی بەردەسـتی سـەرۆکی وڵات: دوێنـێ وەزیـری کارەبا قسەی کرد.

وەزیر (ن.) کار هەڵسووڕێنەری دەوڵەت دوای پاشا و سەرەك کۆمار.

وەسا (ئام.) وەها، ئەوها، ئەوتۆ، واسی، بەمجۆرە.

**وەستا (ن.)** ١- ئـازا، کـارزان: بـا وەسـتای فێرکـردن بـین.٢- لـە ڕاوەسـتان: ماندوبوو وەستا.٣- دەرەقەتی هات: ئازایانە پێی وەستا.

**وەشاندن (چ.)** ١- بلاّو کردنەوە: جووتیارەکە تۆیەکەی وەشاند. ٢- هاوێشتن، ڕاوەشاندن: زللەیەکی وەشاند بەلاّم بەرم نەکەوت.

**وەشاندن (ك.)** چاندنی دانەوێڵەو تۆ بـە زەوییـەوە، لێدان: فسار کـەس دەست دەوەشێنێت.

**وەچە (ن.)** نەوە: حاجی قادری کۆیی وەچەی لێ بەجێ نەماوە .

**وەفا (ئان.)** ١- ئەمەك: سەگ گیانداریێکی بەوەفایە. ٢- ناوی کوڕان و کچانە : وەفا ئەندازیاریێکی چالاّکە.

**وەك (ئام.)** ١- وەکـو، لـەجۆر، ئاسـایی: قسـەکانی وەك ڕەفتارەکانیـەتی.٢- بەجۆرێ کە: وەك دەڵێی وەهایە.

**وەکو (ئام.)** چون، وەك، ئامرازی لێکچوواندنە: کوردستان وەکو بەهەشتە لـە جوانیدا.

**وەکو (ئام.)** وەکی، چوونەیەك: سامان وەکو زانست نییە.

**وەکو(ئام.)** چەشنی، بەوێنەی، وەك: کچەکەم وەکو گوڵ جوانە.

**وەلاّم (ن.)** وەرام: وەلاّمی پرسیارەکەم دایەوە.

**وەلاّمدانەوە (چ.)** جواب، بەرسڤ: وەلاّمی پرسیارەکەم دایەوە.

**وتن (چ.)** قسە، گۆتن، بێژان: وتنی زۆر پەسەند نییە.

**وەها (ج.ن.)** ئەوها، بەوشێوەیە: وەفاداری وەها کەمە.

**وەهار (ن.)** بەهار: وەهار فەسلی گوڵ و گوڵزارە.

**وەیشوومە (ئان.)** ناخۆشی، تەنگانە، دەردوبەلاّ: گەلی کورد تووشی زۆر وەیشوومە هاتووە.

**وحی (ن.)** سروش، ئیلهام: خودا وحی بۆ پێغەمبەر نارد.

**ورتە (ن.و.)** دەنگێکە لەژێرلێوانەوە، پرتە: لەداخا ورتەی دێ.

**ورتە ورت (ئان.)** پرتـەپرت، منجە مـنج، فسکە فسك: پیاوەکە زۆر ورتـەی لێوە دێت.

**ورد (ئان.)** ١- هورد، بچووك، پێچەوانەی درشت: میکرۆب زۆر وردە بەچاو نابینرێ. ٢- تەواو بە دیقەت، جوان: ورد تەماشای پرسیارەکەم بکە. ٣- وێرد، دوعاو نزای ژێر لێوان.

**وردە (ن.)** ١- خرتو پرتی شتو مەك: وردە ساوار پێی دەگوترێ پیر خەنی. ٢- هوردە، پارەی بچووك: ئەو هەزارییەم بۆ بکە بە وردە.

**وردە وردە (ئاك.)** سەبر سەبر، کەم کەم، بەرە بەرە، هێدی هێدی: یانەکەمان وردە وردە لە بەدەستهێنانی نازناوی خولەکە نزیك دەبێتەوە.

**ورشە (ن.)** بریقە، بریسکە: شەونم لەبەرهەتاو وورشەی دێت.

**ورگ (ن.)** توورەکەیە لەناو سك پیسیی تێ ئەچێ: وەرزش ورگ ناهێڵێ.

**ورگ زل (ئان.)** ورگن، زۆر خۆر: ورگ زلی جوان نىیە.

**ورووژاندن (چ.)** ١- ئاراندن، هێنانەگۆر، هێنانە بەرباس: لە کۆڕەکەدا باسێك هاتە ورووژاندن. ٢- تووڕەکردن، شڵەژاندن، ئاڵۆزکردن.

**وریا (ئان.)** ئاگادار، بە ئاگا، زرنگ، زیت، لێهاتوو، زیرەك، ئازا: مرۆڤی وریا سەرکەوتووە. — بوونەوە: وریا بوونەوە بۆ مرۆڤ پێویستە. — کردنەوە: وریا کردنەوەی خەڵك کارێکی باشە.

**وریا (ن.)** زیرەك، وشیار، زیندوو، زبت: وریا هات.

**ورێنەکردن (چ.)** وەخۆدا گۆتن، لەگەڵ خۆ قسە کردن: بەرێگاوە ورێنەی دەکرد.

**وزە (ن.)** توانا، هێز، گەرمی: گەرمی وزە بەلەش دەدات.

**وشە (ن.)** ١- وتە، پەیڤ، بێژە، قسە، کەلیمە. ٢- دەنگی ئاوی بە خوڕو ماری تووڕە: رووبارەکە ئەوەندە بۆش بوو وشەی دەهات.

**وشك (ئان.)** ١- پێچەوانەی تەڕ: زستانێکی وشکە. ٢- ڕەق: ئەم زەوییە وشکە. ٣-ڕوو ناخۆش: پیاوێکی وشکە. ٤- ناتێگەیشتوو: پیاوێکی مێشك وشکە. ٥- پێچەوانەی قەڵب : ئەم لیرەیە قەلب نییە وشکە .

**وەنەوشە (ن.)** ١- بنەوشە، جۆرە گوڵێکە: وەنەوشە بۆنی خۆشە. ٢- ناوی کچانە: وەنەوشە کچێکی دەنگ خۆشە .

وشك كردن (چ.) ١- بێ ئاوبوونی کانی و سەرچاوە: کانیەکە وشکی کرد. ٢- تەڕکردن بە وشك : وشککردنەوەی جلەکان بەجل شۆرەکە بوو.

وشکانی (ئان.) پێچەوانەی تەڕ، زەوی: ڕێژەی وشکانی لە گۆی زەوی کەمترە لە ئاوی.

وشکە ساڵ (ن.ل.) ساڵی نالەبار، ساڵی نەهات، سیاساڵ: وشکە ساڵی ژیانو گوزەرانی خەڵك سەخت دەکا.

وچان (ن.) پشوو، حەسانەوە: کار کردنی بێ وچان دڵسۆزییە. — دان: پاش ماندوو بوون وچان دان پێویستە.

وڵات (ن.) سەر زەمینی جێ ژیانی خەڵك، مەملەکەت، زێد: وڵات پارێزی ئەرکی سەرشانی هەموومانە.

وڵات (ن.) نیشتمان، زێدی بابو باپیران، خاك: وڵاتێ مە کوردستانە.

ون (ئان.) گوم بوو، نادیار، لەناوچوو، بزر، بێ سەروشوێن، داپۆشراو: مەرگ مرۆڤ ون دەکات.

ونجر ونجر (ئاك.) پارچە پارچە : کراسەکەی ونجر ونجر کرد.

وێ (ج.ن.) ئەو، جێناوی کەسی سێیەمی تاکی مێیە.} بەبکەر لەگەڵ کاری تێپەڕ لەکاتی رابردوودا بەکاردێت. ئەژ گوتە وێ خۆ خەسار نەکە.

وی (ج.ن.) ئەو، جێناوی کەسی سێیەمی تاکی نێرە.

وێژە (ن.) ١-گوتە، وتە، بێژە: پیاوەکە ڕێژەی ڕێك و جوان بەکاردێنێ . ٢- شیعرو پەخشان: مێژووی وێژەی کوردی بەجوانی نەنووسراوە.٣- ناوی کوڕانە : وێژە منداڵێکی چاوگەش و جوانە.

ویژدان (ن.) هەست کردنی دڵ و دەروون: کەسانی بێ ویژدان زۆرن.

وێران (ئان.) کاول، کاڤل، هەرفتی.

وێرانە (ئان.) کاولگە، خەرابات، خاپووربوو، رووخاو: دوژمن کوردستانی کردە وێرانە. ئەوان لە وێرانەیەك دەژین.

وێردی سەر زمان (ن.ل.) قسەو باسێك كە هەردەم لەسـەر زمـان بێـت: باسـی بەسـەرهاتی تۆ بوویتە وێردی سەر زمان.

ویزەویز (ن.) گزەگز، دەنگی مێشوولە، دەنگی گوللـە: ویزەویـزی گوللـە كـەڕی كردووین.

ویزەی گوللە (ن.ل.) دەنگێكی باریكە، گیزە: ویزەی گوللە ئەم ناوەی پڕ كردووە.

ویستن (چ.) خواستن، دەمەوێ: ویستم كارەكە ئەنجام بدەم.

وێنە (ن.) نیگـار، شـێوە، نموونـە، دیمـەن، تـەرز، هـاو شـێوە، چەشـن: وێنەیەكی جوانت كێشابوو.

وێنەگر (ن.) وێنـەكێش، رسـم كـێش، شـكل كـێش: وێنـەگری ئـارەزووێكی هونەرییە لای هەندێ كەس.

وێنەكێش (ن.) وێنـەگر، ئـەو كەسـەی بـە دروسـتكردنی وێنـەو شـكلو شـێوەوە خەریكە: جگە لـە كـاری سـەرەكی خـۆی بـە وێنەكێشـیش خـۆی خەریك دەكا.

# ی

**ی (ئا.م.خ)** ١- ئامرازی خستنه سەر: قەلای هەولێر بەناوبانگە. ٢- جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاك: نەسرین نامەی نووسی .

**یاخە (ن.)** یەقەی مل: یاخەی ملی بەرنەدا. ئەستۆ: ئەمە لە یەخەی تۆیە. واز نەهێنا: نەخۆشیەکە یەقەی بەرنەدا هەتا کوشتی.

**یاداشت (ن.)** ١- بیر خستنەوەی شتو رووداو بەسەرهاتی کۆن: نووسینەوەی یاداشت رووداوی مێژووی تێدایە. ٢- موزەکەرە: خەڵك یاداشتیان پێشکەش بە حکومەت کردووە. — نامە: نووسەرەکە یاداشتنامەیەکی نووسی.

**یادگار (ن.)** ١- دیاری بۆلەبیر نەچوونەوە: وێنەکەم لات بێ بۆ یادگاری.٢- یاداشت، ئاسەوارێ کە لەبیر نەچێتەوە: ئەم قەلایە یادگاری پێشینانە.

**یادگاری (ن.)** هەبوونی شتێك لەلای کەسێك کە یادی یان بیری کەسێك یان رۆژێکی رابردووی پێ بکاتەوە: یادگاری گرانە قەدری بزانە.

**یار (ن.)** ١- یاوەر، هاوەڵ، هاورێ: ٢- خۆشەویست، دەستگیران: یارەکەی زۆر جوانو نازدارە. ٣- هاریکار، پشتیوان، پەنا: بەخێربچن، خوا یارتان بێ.

**یاران (ن.)** هاورێیان، هەڤالان، دۆستان، برادەران، سەحابە: یارانی کورد لە زیاد بووندان.

**یارمەتی (ن.)** هاوکاری، کۆمەك، هەرەوەز، هاریکاری: یارمەتی کۆکردنەوە بۆ هەژاران پێویستە.

**یارمەتی دان (چ.)** هاریکاری، کۆمەك کردن: با یارمەتی دان بکەینە دروشم.

**یاری (ن.)** وازی، گەمە، گاڵتە: یارییەکەی تۆم زۆر بە دڵ بوو.

**یاریدەدەر (ن.ل.)** یارمەتیدەر، هاوکار: یاریدەدەرەکە رۆیشت.

**یاریکردن (چ.)** ١- وازیکردن، گاڵتەکردن، گەمە کردن: جوان یاری نەکردنمان بووە هۆی دۆڕاندن. ٢- ئاریکاریکردن، هاوکاریکردن: چەند کاتژمێرێك یاری مام حەسەن مانکرد.

**یاسا (ن.)** ڕێو شوێنو ڕەفتاری بابو باپیران، خوو، دابو نەریت، بنەما، ڕێکخستن، بنەڕەت، قانوون: ژیان بە یاساوە خۆشە.

**یاسا (ن.)** قانوون، شەریعەت، رەوشت، باو: هەبوونی یاسا ژیان خۆش دەکات. — خ: قەدەغە: کڕینو فرۆشتنی هەندێك شت یاساخە. — وولْ: پاسەوان: سیروان یاساوڵە. — یی: کارەکە تەواو یاسایی یە.

**یاساوڵ (ن.د.)** پاسەوان، نۆبەدار، حەسحەس: یاساوڵەکان دەسووڕێنەوە.

**یاقووت (ن.)** بەردێکی بەنرخی جوانە: یاقووت و مەرجان بەنرخن.

**یان (ئام.)** ئان، بۆ هەڵبژاردن بەکاردێت: کوردستان یان نەمان.( دروشمی کوردە)

**یاوەر (ن.)** یاریدەر، بریکار، هاوکار: ئازاد یاوەرمە.

**یەخسیری (ئان.)** ژێردەستیو داماوی، ئەسیری، گرتوو، بەند، کەسێك لە شەڕی دوژمنکاریدا گیرابێ: بەیەك بوونی ڕیزەکانی گەل لە یەخسیریو دیلی ڕزگارمان دەبێت.

**یەزدان (ن.)** خودا، خولاْ: مرۆڤ هەردەم دەبێت سوپاسی یەزدانی مەزن بکات.

**یەك (ژ.)** ژمارەی بنجی: یەك سێو بخۆی باشە.

**یەك دەنگ (ن.ل.)** یەك ڕا، یەك بیر، یەك ئاهەنگ: یەك ڕابە لە دەربڕیندا.

**یەك شێوە (ن.ل.)** یەك وێنە، یەك جۆر، هاوشێوە: ئەم دوو منداڵە لە ڕوخساردا یەك شێوەن.

**یەکبوون (چ.)** بوونەیێك، تێکەڵبوون: یەکبوون مرۆڤی ب هێزتر دکەت.

**یەکسەر (ئاك.)** ڕاستەوخۆ: یەکسەر وەڵام مەدەرەوە.